## مەوسووعەی

## بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا

### کتێبی سێیەم

# تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی موسوڵمانان

عەلی باپیر

مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا

نووسینی: عـەلی بــاپیر

مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر

چاپی یەکەم ١٤٤٠ز - ٢٠١٨ك



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا

عەلی بــاپیر (نووسەر)

٣٤٢ لاپــەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابـەت : ئـایینی

تیراژ : ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٣١١ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

ISBN: 978-9933-593-83-4

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ** : نـــەوزاد کۆیــی

**دیزاینی ناوەوە و بەرگ** : زەردەشت کاوانی

مەوسووعەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان
وەحیی و واقیع دا

- کتێبی سێیەم -

- تەوەری سێیەم -

# تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی

# مێژووی موسڵمانان

نووسینی
عەلی باپیر

## پێشکەش بێ

به هەرکەسێك، کە بە شێوەیەکی شایستە عەقڵی خۆی لە بواری بیرکردنەوەدا بەکاردێنێ و، بە زەینێکی هۆشیارو دڵێکی بێدارەوە:

لە هەردووك کتێبی خوێندراوو بینراو (مَقروء و منظور)ی خوای پەروەردگارەوە ڕادەمێنێ و، سەرەنجام زانیاریی و شارەزاییەکی بەئامانج گەیەنەریان لێ وەدەست دێنێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ
وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ ..... ٤٦﴾ سبأ.

# پێشەکیی

## پێناسەو بەسەرهاتی پەیدابوونی ئەم مەوسووعەیە

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ (١٠٢)﴾ آل عمران

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا (١)﴾ النساء

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا (٧٠) يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا (٧١)﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنّ أَصْدقَ الحديث كَلامُ الله، وَخيرَ الهَدْيِ هَديُ مُحمَّد صَلَّى اللَّه عَليهِ وَسلَم، وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلَّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ فِي النّار.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم مەوسووعەیەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) کۆی ئەو چل و نۆ (٤٩) دەرسەیە کەبەندە لەنێوان ڕۆژانی: (٢٠١٦/١٠/٢١) تاکو (٢٠١٧/٥/٥)دا، پێشکەشی کۆمەڵێکی بژاردە لە براو خوشکانم کردوون، لەخولێکدا کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) کردبوویەوەو، سەرجەم دەرسەکانیش لە کەناڵی تایبەتی بەندە لە یوتیوب:

www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwuuTQtJAAu-) WqXQoCnKQqX2X) دانراون[1].

شایانی باسیشە کە کۆی ئەو چل و نۆ دەرسە، لەلایەن برای دڵسۆزم کاك (قاسم سەلام)ەوە هێنراونە سەرکاغەزو تایپ کراون و، پاش چاو پێداگێڕانەوەی وردی خۆم، دووبارە هەڵەچن کراونەتەوە، تاکو بەم ئاکامە گەیشتوون کە دەیبینی، بۆیە بەپێویستی دەزانم لەناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینمی عەرز بکەم و، لەخوای بەخشەریش داواکارم بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

هەڵبەتە لەمێژیشە گەیشتوومەتە ئەوقەناعەت و بڕوایە، کە کێشەی گەورەی مسوڵمانان و هۆکاری بنەڕەتیی دواکەوتوویی و پەرێشانییان لەم ڕۆژگارەدا، بریتیە لە کەمتەرخەمیی و کرچ و کاڵیی و پاشان بەجێماوییان لەبواری هزرو بیرکردنەوەداو، سەرەنجام بەهەڵە تێگەیشتن، بگرە زۆر جار سەرەوبن تێگەیشتنیان، لەزۆر بابەت و مەسەلەی دین و ژین!

بۆیەش بەپێویستم زانی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەوبارەوە بکەم، کە سەرەنجام ئەو بابەتەی لێ هاتەدی، کە هیوام وایە کەلێنێکی باش لەوبوارەدا بگرێ و، هۆکاری بەرچاو ڕوونبوونەوەیەکی باشی مسوڵمانان بێ لەوبارەوە.

---

(١) ناوونیشانی ئەوبابەتەی داوام لێکرابوو ئامادەی بکەم، بریتی بوو لە: (هزری ئیسلامیی) بەڵام بەو شێوەیەم گۆڕی، کە کراوەتە ناوونیشانی ئەم مەوسووعەیە، دواتریش حیکمەت و هۆکارەکەی دەخەینە ڕوو...

ئنجا بەمەبەستی ئاسانتر بەهرە لێوەرگیرانی ئەم مەوسووعەیە، هەرچەندە هەرپێنج تەوەرەکەی پێکەوە پەیوەستن، بەڵام بەباشم زانی هەمووی بەپێنج کتێب چاپ و بڵاوبکەینەوە، هەرتەوەرەی لەکتێبێکی سەربەخۆدا.

لەخوای بە بەزەیی و بەخشندەش داواکارم پیت و پیزێکی شایستە بخاتە ئەم مەوسووعەیەوە، بەهەر پێنج کتێب و تەوەرەکەیەوەو، ئەوئامانجەی بۆی لەبەرچاو گیراوە، بەباشترین بیهێنێتەدی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

١٠/ی ڕەجەب/١٤٣٩ك
٢٠١٨/٣/٢٧ز
هەولێر

## ڕێخۆشکردن و نەخشەی گشتیی

پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگارو واقیعێکدا، کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و بەزیندوویێتیی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان، لە تێوەڕامانی وەحیی و چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەبینین.

ئەم بارودۆخەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، بەرهەمی ئەوەیە کە مسوڵمانان - بە شێوەیەکی گشتی- باش نەیانتوانیوە عەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنە کار، لە تێوەڕامانی وەحیی و لە سەرنجدانی واقیعدا، بۆیە من وەك هەوڵ و هەنگاوێك لەم بوارەدا، بە پێویستم زانی ئەم بابەتە لە (٤٩) ئاڵقەدا پێشکەش بکەم، لەژێر ناوونیشانی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا}و، سەرجەم ئەم بابەتەش دەکەین بە پێنج تەوەرە:

**تەوەری یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە چوار بەشی سەرەکیی پێك دێ:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی و چەند وشەیەکی دیکەی نیزیکی.

**بەشی دووەم:** سەرنج دانێکی مێژوویی لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا.

**بەشی سێیەم:** سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.

**بەشی چوارەم:** گرنگیی و پێویستیی بیرکردنەوە (تفكّر) لە ئیسلامدا.

**تەوەری دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری موسوڵمانان.**

ئەم تەوەرەش لە سێ بەشی سەرەکیی و (٥١) کورتە باس پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** تایبەتمەندییە گشتییەکان، (٢٠) تایبەتمەندیی.

**بەشی دووەم:** تایبەتمەندییە عەقیدەیی و فیکرییەکان، (١٧) تایبەتمەندیی.

**بەشی سێیەم:** تایبەتمەندییە ڕەوشتییەکان، (١٤) تایبەتمەندیی.

**تەوەری سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی موسوڵمانان.**

کە سەرجەم بیست (٢٠) تەوژمی جۆراو جۆرمان لێ هەڵبژاردوون و، لەبیست بەشدا خستوومانن ڕوو:

١- خەواریج.

٢- مورجیئە.

٣- جەبرییە.

٤- قەدەرییە.

٥- جەهمییە.

٦- موعتەزیلە.

٧- شیعە.

٨- ڕافیزە.

٩- ناصیبە.

١٠- ئەهلی حەدیس.

١١- ئەشعەرییەکان.

١٢- ماتوریدییەکان.

١٣- باطینییەکان.

چواردە (١٤) گرووپیشمان لە باطینییەکان باسکردوون.

١٤- فەلسەفەو فەیلەسووفەکان.

١٥- تەصەووف و صۆفییەکان.

١٦- مەزهەبە فیقهییەکان.

١٧- وەهابییە.

١٨- سەنووسییە.

١٩- مەهدییە.

٢٠- جامیعەی ئیسلامییە.

**تەوەری چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە پێنج بەشی بنەڕەتیی پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** بوونناسیی (علم الوجود- ontologu).

**بەشی دووەم:** ئیمان و عەقیدە.

**بەشی سێیەم:** تێڕوانینەکان (التصورات).

**بەشی چوارەم:** بەهایەکان (القیم).

**بەشی پێنجەم:** پێوەرەکان (الموازین).

**تەوەری پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراو جۆر.**

ئەم تەوەرەش لە دە (١٠) بابەت پێکهاتوە، کە هەرکامیان لەبەشێکی سەربەخۆدا دەخەینەڕوو:

**بەشی یەکەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، تەواوکارییە.

**بەشی دووەم:** شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!

**بەشی سێیەم:** ڕەوایی: فرەیی فیکریی و سیاسیی و ئایینی (مشروعية التعددية الفكرية والسياسية والدينية).

**بەشی چوارەم:** هاووڵاتێتیی نامسوڵمانان لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا: ماف و ئازادییەکانیان.

**بەشی پێنجەم:** مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستەوەبوونی نەتەوەکان.

**بەشی شەشەم:** ڕاوێژ (شورى)ی ئیسلام و دیموکڕاسی، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان.

**بەشی حەوتەم:** ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا.

**بەشی هەشتەم:** تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان.

**بەشی نۆیەم:** بنەما گرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان.

**بەشی دەیەم:** بنچینە سەرەکییەکانی دیندارییەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست.

## پێشەکی ئەم تەوەرە

**خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم!**

ئەم تەوەری سێیەمە: {تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان} تەرخانکراوە بۆ توێژینەوەو قسەکردن لەسەر کۆی ئەو تەوژم و قوتابخانە فیکرییە سەرەکییانەی، بە درێژایی مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان تاکو ئەم ڕۆژگارە، سەریان هەڵداوە.

ئنجا هەرچەندە ئێمە کۆی ئەو تەوژمە فیکرییە سەرەکییانەمان بە بیست و یەك دانە ئەژمار کردوون، بەڵام لەم تەوەرەدا تەنیا بیست (٢٠)یان لێ دەتوێژینەوە، چونکە تەوەری دووەمی ئەم مەوسووعەیەمان تەرخان کردبوو بۆ قسە کردن لەبارەی تەوژمە فیکرییە هەرە مەزن و بنەڕەتییەکەی مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان، کە: {ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان}ە، شایانی باسیشە کە هەرچەندە تەوژمی: {جەماوەری مسوڵمانان} باشترین بەرجەستەکەری ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و، هاوەڵانی بەڕێزی و خزم و نیزیکانی دڵسۆزی بە گشتیی و، بەتایبەت خەلیفە ڕاشیدەکانی بوون، بەڵام ئەو تەوژم و قوتابخانە فیکرییانەی دیکەش بە گشتی و لە هەندێك ڕووەوە، کەم و زۆر هەق و ڕاستییان لەلایە، بەڵام گرفتیان ئەوەیە کە کرچ و کاڵیی، یان هەڵەو لادانیان - لە سۆنگەی تێپەڕاندن و بەزایەدان (إفراط و تفریط)یانەوە - تێکەڵ بەو هەقە کردوە کە لەسەری بوون.

هەروەها مەرجیش نیە هەرکەسێك و لایەنێك خۆی پاڵدابێتە لای زۆربەو جەماوەری مسوڵمانان و ڕێبازە هاوسەنگ (مُتَّزِن)ەکەیان، بێ عەیب و هەڵەو

کەم و کوڕیی بێ، بەڵام جەماوەری مسوڵمانان {جمهرة المسلمين} بە گشتیی هەق و ڕاستیی و چاکەیان لەسەرجەم ئەوانی دیکە زیاتر بووە.

ئنجا لەلایەکی دیکەشەوە:

پێویستە بزانرێ کە وەنەبێ {جەماوەری مسوڵمانان} تەنیا لەڕەوت و خەڵکێکی دیارییکراودا بەرجەستە بووبن و، بەتەواویی لە تەوژم و ڕەوتەکانی دیکەو کۆمەڵ و تاقمەکانیان، سەربەخۆو جیاواز بووبن!

چونکە جاری وابووە لە هەندێك کات و شوێندا، زۆربەی مسوڵمانان لە ڕووی فیکریی و عەقیدەییەوە، لە هەردووك قوتابخانەو تەوژمی (الأشعرية) و (الماتُريدية)دا کۆبوونەوە.

هەروەها جاری وا بووە لە هەندێك کات و شوێندا، زۆربەی مسوڵمانان لە ڕێبازێکی تەزکیەو تەصەووفی وەك (القادرية) و (النقشبندية)دا کۆبوونەوە.

هەروەك جاری واش بووە ناوونیشانی (أهل الحديث) بۆتە بازنەی فراوان و کۆکەرەوەی زۆربەی پەیڕەوانی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و جەماوەری مسوڵمانانی شوێنکەوتووی.

بەڵام بێگومان هەرگیز جەماوەری مسوڵمانانی شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکانی بە تایبەت و، هاوەڵان و خزمانی بەڕێزو دڵسۆزی بە گشتی، لەژێر هیچ ناوونیشانێکدا جگە لە {مسوڵمانان - المسلمين} کۆنەبوونەتەوە.

بە نسبەت وشەی (السّلفية)شەوە لە مێژووی ئیسلامدا، هیچ کاتێك بۆ تەعبیر کردن لە بەشێك لە مسوڵمانان بەکار نەهاتوە -وەك لە تەوەری دووەم لەبەشی سێیەمیدا باسمان کرد- بەڵکو وشەی ناوبراو تەنیا بۆ تەعبیر کردن لە ڕێبازی پێشینی چاك (السّلف الصالح) بەکار هاتوە گوتراوە: (على منهج السّلف) بەڵام پاش سەرهەڵدانی کۆمەڵ و جووڵانەوەکەی (محمد بن

عبدالوهاب) - ئەویش بە ماوەیەکی زۆر نەك لە ڕۆژگاری خۆیدا، کە هەر خۆیان بە (الموحِّدون) ناساندوە - هەندێك گرووپ و دەستەی پرژو بڵاوو خاوەن مەشرەب و سەلیقەی جیا جیا، وشەی ناوبراویان بۆ خۆناساندنیان و، سەرەنجام خۆ دابڕینیان لە {جەماوەری مسوڵمانان} بەکارهێناوەو دەهێنن.

## ڕێخۆشکردنێکی کورت

**خوێنەری بەڕێز!**

خوا پشتیوان بێ ئێمە لەم تەوەری سێیەمەی بابەتی فراوانی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع}دا، بیست (٢٠) دانە لە تەوژمە فیکرییەکانی مێژووی مسوڵمانان دەتوێژینەوە، هەر کامێکیان لە بەشێکی سەربەخۆدا، بۆیە ئەم تەوەرە بۆ بیست بەش (فصل) دابەش دەبێ.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە لە (ڕێخۆشکردن و نەخشەی گشتیی) ئەم مەوسووعەیەدا، سەرجەم بیست (٢٠) تەوژمە سەرەکییە فیکرییەکەی مێژووی مسوڵمانانمان هێناون، لێرە پێویست بە دووبارە هێنانیان ناکات.

خوا بە لوتف و بەزەیی بێ سنووری یارمەتییمان بدات، کە لە وردو درشتی ژیان و گوزەرانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییماندا، بەپێی ئەو ڕێبازەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بژین و بەڕێوە بچین، کە زۆربەی جەماوەری مسوڵمانان لەسەری بوون.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك

١٨ رجب ١٤٣٩ك

٢٠١٨/٤/٤ز

## بەرایی

## سێ ئاگاداری گرنگ

ئەو تەوژمە فیکرییە سەرەکییانەی لە مێژوووی مسوڵمانانندا بوون، زۆرن، بەڵام بەبۆچوونی من لە ژێر بیست و یەك (٢١) ناوو نیشاندا کۆ دەبنەوە، بۆیەش ئێمە لێرەدا تەنیا بیست (٢٠) ناوو نیشانمان هێناوە، چونکە پێشتر تەوەری دووەممان تەرخان کرد بۆ تەوژمی مەزن و فراوانی: (جەماوەری مسوڵمانان) بەڵام بەر لەوەی بێینە سەر پێناسە کردنی هەر کام لەو تەوژمە فیکرییە سەرەکییانەی مسوڵمانان، کە زۆریان لە کۆمەڵ و گرووپیشدا بەرجەستە بوون و، هەندێکیشیان تەنیا وەك تەوژمێکی فیکریی هەبوون، دەمەوێ سێ ئاگاداریی گرنگتان بخەمە بەرچاو:

١)- مسوڵمانان بە هەموویان ئۆممەت پێك دێنن، واتە: کە دەگوترێ ئۆممەتی ئیسلام، ئۆممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، مسوڵمانان، دیارە بە هەموو ئەو کۆمەڵ و تەوژمە فیکرییانەشەوە، کەلە مێژووی مسوڵمانان دروست بوون، بە هەموویان ئۆممەت پێك دێنن، هەر بۆیە ئێمە بۆ جیا کردنەوەی ئەو خەڵکەی کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون و، لەسەر ڕێبازی جێنشینە هیدایەت دراوەکانی و هاوەڵان و خزمانی ڕۆیشتوون، وشەی {جەماوەری مسوڵمانان}مان بەکار هێناوە، ئەگەرنا کە بگوترێ: {مسوڵمانان}، سەرجەم ئەو کۆمەڵ و تەوژمانەش دەگرێتەوە، کە لە بازنەی ئیسلام و مسوڵمانەتیی دان، بە هەموو جۆرەکانیانەوە.

٢)- حەق بە ڕەهایی لەسەر کەس تاپۆ نەکراوە، بەیەکجارەکی هیچ کەسی لێ بێبەش نەکراوە، هیوادارم ئەم بنەمایە باش بچەسپێنن لەلای خۆتان، واتە: هەر کام لەو تەوژمە فیکرییانەی کە وەك گوتم: هەندێکیان لەشێوەی گرووپ و کۆمەڵی کۆمەڵایەتیی، یاخود سیاسییشدا بەرجەستە بوون، شتێك لەهەقیان هەر لەلایە، وانیە کە هەق هەمووی لەلایەك بێ و، ئەوانی دیکەش لە هەموو شتێکدا ناهەق بن، بەڵێ لە هەندێ شتدا نەیانپێکاوە بەهەڵەدا چوون، بەڵام کەم و زۆر، هەر کامێك لەو تەوژم و کۆمەڵ و تاقمانەش، هەقیان لەلا بووە، وەك دواییش باسی دەکەین[1].

بەڵام وەك پێشتریش گوتوومانە: {جەماوەری مسوڵمانان} پشکی شێریان لەو هەق و ڕاستییانە بەرکەوتوە.

٣)- زۆرجار زاراوەی (أهل السنة) یاخود (أهل السنة والجماعة) بەناهەق بەکار هێنراوە، وەك چەکێك بەکار هێنراوە، لەدژی ئەوانەی نەیاریی فیکرییان هەبووە، لەگەڵ کۆمەڵێك لە مسوڵماناندا، بۆ وێنە: (أهل الحديث) گوتوویانە: ئێمە ئەهلی سوننەتین، بەڵام (موعتەزیلە)ش هەر لە بازنەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دان، چونکە ئەگەر {ئەهلی سوننەت و جەماعەت} بەو واتایە بێ: لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرو (صلى الله عليه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەکانی، موعتەزیلەش کێشەیان نەبووە لەگەڵ خەلیفە ڕاشیدەکان و لەگەڵ هاوەڵاندا! هەروەك چۆن زۆر جار وشەی (مسوڵمان)یش بەکارهێنراوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە کێشەیەکی فیکرییان هەبووە، ئێستاش هەر بەکار دەهێنرێ، دەگوترێ:

---

(١) ئەوەی لێرەدا دەیڵێم، زۆر کەس لەوانەی کە خۆیان بە زۆربەی مسوڵمانان، یان: {ئەهلی سوننەت و جەماعەت} دەناسێنن، نایڵێن و پێیان وایە کە گوتت: {ئەهلی سوننەت و جەماعەت}، هەق هەمووی لەلای ئەوانەو، کە گوتت: مورجیئە، خەواریج، موعتەزیلە، شیعە، ئەوە ناهەق هەمووی لەلای وانە! بەڵام وا نیە، وەك دواییش باسی دەکەین، ئنجا ئینسان دەبێ بە ئینصاف بێ، (الإنصاف خير الأوصاف)، تەنانەت مرۆڤی مسوڵمان دەبێ لەگەڵ ئەهلی غەیری قیبلەشدا، بە دادگەرانە مامەڵە بکات، چ جای لەگەڵ ئەهلی قیبلەدا، ئەوانەی کەم و زۆر لادان و هەڵخلیسکان و هەڵەو پەڵەیان بوون.

ئەوانە مسوڵمانن و، ئەوەی لەدەرەوە ئەو بازنەیە، نا مسوڵمانە!! وەك دوایی باسی دەکەین: لەسەردەمی ئومەویی و عەبباسییەکاندا، ئەوە هەر زۆر بەکار هێنراوە، هەندێ لەوانەی کە کێشەی سیاسیی و فیکرییان هەبووە لەگەڵ دەوڵەتی ئومەویی، یان لەگەڵ دەوڵەتی عەبباسییدا، هەڵساون بیانووی لە ئیسلام دەرچوونیان پێ گرتوون و، ئیعدامیان کردوون و کوشتوویانن!

بەڵێ جاری وا هەیە وشەی: {ئەهلی سوننەت} بەکار هێنراوە وەك چەکێك لە دژی نەیارە فیکرییەکان، کە مەرجیش نیە هەق هەمیشە لەلای ئەوانە بووبێ، کە ئەو ناوەیان بەکار هێناوە.

هەندێ جاریش ئەو وشەیە وەك شتێکی میراتیی لێ هاتوە، ئێستا تەماشا بکەن! ئێمە بە عەرەبی سوننە دەڵێین: (العرب السنة)، کە بێگومان عەلمانییان تێدایە، مولحیدیان تێدایە!! یان ئێمە وەك کوردو تورك ئەو میللەتانە بە {ئەهلی سوننەت} لەقەڵەم دەدرێین، کوا ئایا هەموومان بەدوای ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکەوین؟ یان کە دەگوترێ: شیعە، کوا هەموویان (مشایعة)ی عەلی دەکەن؟ هەتا بە پێناسەکەی خۆشیان؟ ئەوانیش چەندان جۆر خەڵکیان تێدایە، کەواتە: ئەو ناوانە زۆر هەڵخەڵەتێنەرن، بۆیە تاکو بکرێ ئینسان ناوی مسوڵمانەتیی بەکار بهێنێ، ئنجا ئەوەی بکەوێتە نێو ئەو بازنەی مسوڵمانەتیی، ئەوە دەیکەوێتێ، ئەوەی لەو بازنەیەش چووە دەرێ، ئەوە بە دەرچوو دادەنرێ، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە لە: {چەسپانی مەرجەکان و، لاچوونی پەرچەکان} {ثبوت الشروط وانتفاء الموانع}، کە ئەوەش دەبێ خەڵکی پسپۆڕو شایستەی خۆی ساغی بکاتەوە، نەك هەر کەسێك، ڕاست بۆوە!




# خـــەواریج ( الخـــوارج )

١- پێناسەو سەرهەڵدانی خەواریج.

٢- ناوەکانی خەواریج.

٣- بنەما فیکرییەکانی خەواریج.




## پێناسە و سەرهەڵدانی خەواریج

لە زمانی کوردییشدا هەر وشەی (خەواریج) بەکار دێنین، خەواریج یانی: دەرچووەکان، لە (خروج)ەوە هاتوە، (الخوارج) کۆی (الخارجة)یە، (الجماعة الخارجة) کەواتە: خەواریج واتە: کۆمەڵە دەرچووەکان، مەبەستیان ئەوەیە کە لە ڕیزی {جەماوەری مسوڵمانان} جیا بوونەوەو دەرچوون لە فەرمانبەریی کردن و گوێڕایەڵیی کردن بۆ پێشەوای مسوڵمانان.

یەکەمین کۆمەڵی سیاسیی (هەڵبەتە پێشتر کۆمەڵێکی فیکریی بوون، دوایی لە گرووپێکی سیاسییدا بەرجەستە بوون)، کە مۆرکی ئایینییان لە هەڵوێستە سیاسییەکەیان دا، گرووپی خەواریج بوون، خەواریج تەنیا خۆیانیان بە بڕوادار دادەناو، نەیارەکانیان هەموو بە دەرچوو لە ئیسلام لەقەڵەم دەدا، خەواریج لە ساڵی (٣٧)ی کۆچیی لە گەرمەی شەڕی (صفّین)دا، کە لە نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب خوا لێی ڕازی بێ، خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا، ڕوویدا، کە بەناهەق لێی یاخیی بووبوو، سەریان هەڵدا، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، کە وشەی (الباغية) بۆ کۆمەڵەکەی موعاویە، بەکار

هێنراوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك بە عەمماری كوڕی یاسری فەرموو: {تَقْتُلُكَ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ} أخرجه مسلم برقم (٢٩١٦)، واتە: كۆمەڵی یاخییان تۆ دەكوژن.

دوایی عەممار خوا لێی ڕازی بێت لەلایەنی سوپای موعاویەوە كوژرا.

ئنجا خەواریج لە گەرمەی جەنگەكەدا پەیدا بوون و، ئەوانە دروشمی: (لا حكم إلاّ لله)یان بەرز كردەوە، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەدا كە: كاتێك جەنگی (صفین) خەست بۆوە، موعاویەو ئەوانەی لەگەڵی بوون، هەستیان كرد تێك دەشكێن، موعاویە بە عەمری كوڕی عاصی گوت: تەگبیر چییە؟ گوتی: با ئەو موصحەفانەی كە لە لامانن، بەسەری ڕمەكانمانیانەوە بكەین و داوا بكەین جەنگ بوەستێنرێ، لەو حاڵەتەشدا ئەگەر عەلی جەنگەكە ڕابگرێ، هەر زەرەریەتی، ئەگەر ڕاشینەگرێ، هەر زەرەریەتی، مەشهوورە كە عەمری كوڕی عاص زۆر زۆرزان و سیاسیی بووە، موعاویەش هەروا بووە، یانی سیاسەت و لێزانییان زاڵ بووە بەسەر دین و تەقوایاندا، هەمووشیان وەك هاوەڵ، جێی ڕێزو حورمەتن، ئنجا كاتێك موصحەفەكانیان بەرز كردنەوە، عەلی خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئەوە فێڵەو جەنگ ڕامەگرن، بەڵام ئەو كۆمەڵەی كە ناویان لێنرا خەواریج، بە عەلییان گوت: شەڕەكە ڕادەگری باشە، ئەگەر نا ئێمە لەتۆ دەدەین، ئەویش فەرمانی كرد كە شەڕەكە ڕابگرن، ئنجا لەوێدا بوو ئەو قسەیەی كرد: (إنها كَلمة حَق يراد بِها الباطل) ئەوە قسەیەكی هەقە، بەڵام ئەوان مەبەستیان ناهەقە، واتە: لەوەدا كە ئەوان دەڵێن: حەكەم هەر خوا بێ، مەبەستەكەیان ناهەقێكی لەپشتەوەیە، بەڵام خەواریج بەو دروشمەی موعاویەو عەمری كوڕی عاص، هەڵخەڵەتان و سەرەنجام جەنگەكە ڕاگیرا، ئنجا كە جەنگەكە ڕاگیرا، بڕیاردرا حەكەمێك لەلای موعاویەو حەكەمێك لەلای عەلییەوە، دیاریی بكرێ، حەكەمەكەی لای موعاویە عەمری كوڕی عاص بوو، زۆر لێزان و شارەزا بوو، عەلی زۆر داوای كرد عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس بنێرێ، وەك حەكەم، خەواریج گوتیان: نەخێر، ئەوە ئامۆزای خۆتە بۆیە ئەو دەنێری! دەبێ (أبو موسى الأشعري) بنێری، عەلی گوتی: ئەبو مووسای ئەشعەریی پیاوێكی

صاڵحە، بەڵام لەگەڵ (عەمری کوڕ عاص)دا بار نایەتەوە، گوتیان: نەخێر، دەبێ هەر ئەوبێ، ئیدی ئەوەبوو کە لە (دومة الجندل) ئەو دوو حەکەمە قسەیان کردو، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە عەلی و موعاویە، هەردووکیان لێ بخەن و، مسوڵمانان بۆخۆیان یەکێکی دیکە هەڵبژێرن، ئەوەش فێڵێك بوو لە ئەبو مووسا کرابوو، نەدەبوو بەوە ڕازی بێ، چونکە عەلی مسوڵمانان هەڵیانبژاردبوو، بەڵام موعاویە کەس هەڵینەبژاردبوو، بگرە جارێ بۆخۆشی نەیگوتبوو من خەلیفەم! ئنجا ئەوەبوو کە عەمری کوڕی عاص ئەبو مووسای پێشخست، گوتی: تۆ پێشێ قسە بکە، ئەبو مووساش گوتی: تۆ قسە بکە، عەمری کوڕی عاص گوتی: تۆ لەمن بەتەمەنتری و لەپێش مندا مسوڵمان بووی، ئیدی ئەبو مووسا قسەی بۆ خەڵکەکە کردو گوتی: ئەوە من هەر کام لە موعاویەو عەلییم لابردن و با دوایی مسوڵمانان کەسێکی دیکە بۆخۆیان دابنێن.

ئنجا عەمری کوڕی عاصیش کە دوای ئەبو مووسای ئەشعەریی قسەی کرد، گوتی: منیش وەك چۆن ئەبو مووسای ئەشعەریی عەلی لابرد، ئەنگوستیلەیەکی لەدەست دابوو لە پەنجەی دەرهێناو گوتی: منیش ئەوە عەلییم عەزل کرد، وەك چۆن ئەو ئەنگوستیلەیەم لە پەنجەم دەرهێناو، چۆنیش دەیخەمەوە پەنجەم، ئەوە بەهەمان شێوە موعاویەشم چەسپاند بە خەلیفەی مسوڵمانان.

دیارە ئەبو مووسا قسەی پێ گوت، گوتی: تۆ درۆت کردو ناهەقت کرد[1].

ئیدی وەك چۆن لە جەنگەکەدا فێڵ کرا، هەڵبەتە فێڵ لە عەلی نەکرا، چونکە ئەو دەیزانی، بەڵام بەدەست خەڵکێکی نەزان و سادەوە گرفتار بوو بوو، بەهەمان شێوە لە مەسەلەی دادوەر دانان (تحکیم)ەکەشدا، فێڵ کرا، پاشان هەرکەسە چۆوە بۆ شوێنی خۆی، موعاویە خوا لێی ببوورێ لە شام و، عەلییش خوا لێی ڕازی بێ لە کووفە.

ئنجا دوایی ئەوانەی بەزۆر جەنگیان بە عەلی ڕاگرتبوو (خەواریج) - کە ئەو کات هێشتا ئەو ناوەیان لێ نەنرابوو - دوو داواکارییان لە عەلی هەبوون:

---

(١) ئەوە ڕیوایەتێکەو ڕیوایەتی دیکەش لەو بارەوە هەن.

**یەك:** دەبێ ڕەفزی ئەو دەرەنجامە بکەی کە لە ئەنجامی کۆبوونەوەی دوو حەکەمەکانەوە پەیدا بووە.

**دوو:** دەبێ جەنگ بکەی لەدژی موعاویە، چونکە فێڵبازەو یاخییە.

عەلی خوا لێی ڕازی بێ گوتی: کاتی خۆی من زۆرم پێ گوتن با جەنگەکە ڕانەگرین، بەڵام ناچارتان کردم، هەروەها زۆرم گوت: با ئەبو مووسا نەنێرین، فێڵی لێ دەکرێ، هەر ناچارتان کردم! ئێستاش دەتانەوێ شتێکی ناشەرعییم پێ بکەن، دوای ئەوەی کە بەو شێوەیە بڕیار دراوە؟! نەخێر تاکو ئەوان دەستدرێژیی نەکەن، ئێمە دەستپێشخەر نابین، ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا، ئەوان خۆیان ڕاگەیاند وەك گرووپێکی سیاسیی و، ناویشیان لەخۆیان نا (المُحَكِّمة)، واتە: ئەوانەی کە قورئان دەکەنە حاکم، ئنجا یەکێکیشیان کردە ئەمیری خۆیان (بەڵکو بە خەلیفەیان دانا)، بەناوی (عبدالله بن وهب الراسبي)، کە دوایی لە ساڵی (٣٨)ی کۆچیی لە جەنگی نەهرەواندا کوژرا، دوایی جەنگی نەهرەوان ڕوویداو زۆربەیان کوژران، ئەویش دوای ئەوەی کە عەلی، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی خوا لێیان ڕازی بێ، نارد بۆ لایان، دوای ئەوەی خەواریجەکان ڕەخنەیان لە عەلی دەگرت: چۆن ڕازی بووە: دوو پیاو ببنە حەکەم، بۆ پێکهاتن لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا؟!

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش بەم جۆرە بەڵگەی بۆ هێنانەوە، لەسەر ڕەوایی ئەسڵی دادوەردانان:

١)- خوا دەربارەی ژن و مێرد دەفەرموێ:

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴿٣٥﴾ ﴾

النساء

واتە: ئەگەر لە ناکۆکیی نێوانیان ترسان، دادوەرێك لە خزمانی مێردەکەو دادوەرێك لە خزمانی ژنەکە بنێرن (بۆ چارەسەری کێشەکەیان)...

گوتی: ئایا کێشەی ژن و مێرد گەورەترە، یان کێشەی دوو کۆمەڵ لە مسوڵمانان؟

**٢)**- هەروەها ئەو ئایەتەی بەبەڵگەی بۆ هێنانەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کاتێك لە ئیحرامدان نێچیر مەکوژن و هەر کامێك لە ئێوە بە ئانقەست بیکوژێ، قەرەبووەکەی ئاژەڵێکی هاووێنەیەتی، کە دوو کەسی دادگەرتان بڕیاری دەدەن و بە دیاریی دەبرێتە لای کەعبە...

ئنجا گوتی: ئەگەر کەسێك کە لە ئیحرامدایەو نێچیرێك ئاژەڵێك دەکوژێ و، پێویستە قەرەبووەکەی بدا، دروست بێ دوو کەس ببنە حەکەم و بڕیار بدەن، ئایا بۆ دوو کۆمەڵی مسوڵمانیش هەمان شت دروست نیە، بۆ پێکهێنانەوەیان؟!

ئیدی کە ئەو بەڵگانەی بۆ هێنانەوە، زۆریان وازیان هێنا، ئەوانەشی کە مانەوە، لەشەڕی {نەهرەوان}دا هەموویان کوژران.

ئنجا بۆ زانیارییتان! ئەوان بۆخۆیان ناویان لە خۆیان نەناوە (خەواریج)، بەڵکو نەیارەکانیان ناویان ناون خەواریج، دەنا هیچکەس بەخۆی نالێ: من یاخیی بووم و دەرچووم!![1]

---

(١) شایانی باسە سەرچاوە مێژووییەکان گێڕاوەی جۆراوجۆریان لەبارەی ئەو ڕووداوانەوە هێناون، دەگونجێ لەوبارەوە سەرنجی ئەم سێ سەرچاوەیە بدرێ:
١- البداية والنهاية لابن كثير، ج٧ ص ٢٤٥ - ٣٠١.
٢- الخلفاء الراشدون بين الإستخلاف والإستشهاد، ص ٢٥٦ - ٢٨١ د.صلاح عبدالفتاح الخالدي. ط٥ / ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م.
٣- مروج الذهب، للمسعودي، ج١ ص ٦١٩ - ٦٢٥.




## ناوەکانی خەواریج

ئەم کۆمەڵە چەند ناوونیشانێکیان هەبوون:

١- خەواریج ناوی: (الشُّراة)یان بۆ خۆیان بەکار هێناوە، کە کۆی (شاري)یە، واتە: (بائع)، ئەمەشیان لەو ئایەتە وەر گرتوە کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ البقرة

واتە: لە نێو خەڵکدا هەیە کەسانێك، کە خۆیان دەفرۆشن لەپێناو ڕەزامەندیی خوادا.

(الشُّراة) یانی: خۆ فرۆشان بە خوای پەروەردگار.

٢- هەروەها وشەی (المؤمنون)یشیان بۆخۆیان بەکار هێناوە، واتە: بڕواداران.

٣- هەروەها ناوی: (جماعة المؤمنين) و (الجماعة المؤمنة)یان بۆخۆیان بەکار هێناوە، واتە: کۆمەڵی بڕواداران.

٤- دیسان ناوی (المحكِّمة)شیان بەکار هێناوە، واتە: ئەوانەی کە قورئان دەکەنە دادوەر.

٥- بەڵام خەڵك ناوی: خەواریجیان بۆ بەكار هێناون، لەگەڵ ناوی (الحرورية)، وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، ئافرەتێك پرسیار لە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەكات، كە بۆچی ئافرەت كاتێ دەكەوێتە حاڵەتی بێنوێژیی، ڕۆژوو دەگێڕێتەوە، بەڵام نوێژان ناگێڕێتەوە؟ دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ بەو ئافرەتەی گوت: {أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟} أخرجه البخاري برقم: (٣١٥).

واتە: ئایا تۆ حەڕووریی؟ ئەو كاتە بە خەواریجیان گوتوە: حەڕووریی، چونكە ئەو شوێنەی كە ئەوانی لێبوون، پێی گوتراوە: (حروراء)، ئنجا (حروري) واتە: ئەو كەسەی كە خەڵكی ئەو شوێنەیە.




# بنەما فیکرییەکانی خەواریج

لەبارەی بنەما فیکرییەکانی خەواریجەوە، زۆر گوتراوەو نووسراوە، بەڵام بەگشتیی دەتوانرێ بیرو ڕایەکانیان لە دە (١٠) بنەمادا کورت بکرێنەوە:

## ١- لە بواری حوکمڕانییدا:

هەموو مسوڵمانێکی شایستە بەلای خەواریجەوە، بۆی هەیە ببێتە حوکمڕانی مسوڵمانان، بەبێ ڕەچاو کردنی ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك، تەنانەت ئافرەتیش، بەلای خەواریجەوە ئافرەتیش بۆی هەبووە، ببێتە حوکمڕانی یەکەمی مسوڵمانان، هەڵبەتە لەوەشدا ڕاجیایی (إختلاف) بووە، بەڵام بەهەر حاڵ ئەوە ڕایەکی زاڵ بووە لەنێویاندا، گرنگ ئەوەیە ئەوان نەیانگوتوە: دەبێ حوکمڕان لە قوڕەیش بێ، لە عەرەب بێ، لە بەنی هاشم بێ، لە بەنی ئومەییە بێ ...هتد، ئەو شتانەیان نەگوتوون، ئنجا لە ڕاستییدا ئەو هەڵوێستەی ئەوان لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجاوە، نەك ئەوەی دوایی کە:

١- (شیعة) دەیانگوت: بەس دەبێ لە بەنی هاشم بێ.
٢- عەبباسییەکان دەیانگوت: دەبێ بەس لە نەوەی عەبباس بێ.
٣- ئومەییەکان دەیانگوت: دەبێ لە ئێمەبێ (ئومەویی بێ).
٤- عەرەب بە گشتی دەیانگوت: دەبێ لە عەرەب بێ.
٥- قورەیش دەیانگوت: دەبێ بەس لە قورەیش بێ!! کە بەڕاستیی ئەو بیرۆکانە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ دەمارگیریی نەفامیی و هیچ پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نیە[1].

## ٢- لەبواری شۆڕش کردندا:

خەواریج یەك دەنگ بوون لەسەر ڕاپەڕین لەدژی حوکمڕانانی ستەمکارو لادەر، گوتوویانە: مادام ژمارەی ئەو کەسانە بگاتە چل (٤٠) کەس، دەبێ ڕاپەڕن! ئنجا بۆ زانیارییتان! خەواریج زۆر شۆڕشگێڕ بوون، هەمیشە لە شۆڕشی نەپساوە دابوون و، بەردەوام هەر حوکمڕانێکیان بە ستەمکار زانیبێ، لێی ڕاپەڕیون، تەنیا لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا نەبێ، ژمارەیەکیان لەسەردەمی ئەودا گەڕانەوەو بە عومەریان گوت: تۆ حوکمڕانێکی باش و دادگەرو زاهیدی!

## ٣- لە ڕووی سەرنجدانیانەوە بۆ مێژوو:

لە حوکمی ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، ڕازیبوون، هەروەها لە شەش ساڵی سەرەتای حوکمڕانیی عوسمانیش خوا لێی ڕازی بێ، ڕازی بوون، بەڵام بۆ شەش ساڵی دووەمی گوتوویانە: عوسمان لایداوە، لەدوای

---

(١) بۆیەش لە سەرەتای ئەم تەوەرەیەوە گوتمان: لەنێو سەرجەم تەوژمە فیکرییەکانی مێژووی مسوڵماناندا، کەم و زۆر هەق و ڕاستیی هەیە!

ئەویش عەلی و، دوو حەکەمەکە: ئەبو مووساو، عەمری کوڕی عاص و، تەڵحەو زوبەیر، خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانەیان هەموو بەکافر داناون و، هەر کەسێکیش ئەوانەی پێ کافر نەبووبێ، ئەویشیان بە کافر داناوەو، لەو بارەوە زۆر تێپەڕێنەری سەرسەخت و کەللە وشك بوون.

## ٤- ڕێبازی دانانی حوکمڕان:

ئەوان گوتوویانە: ئەوە هیچ ڕاست نیە کە دەق هەبێ لەسەر ئەوەی کێ لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جێنشین بێ، وەك (شیعة) دەڵێن، یان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتی کردبێ و، گوتوویانە: {الإمامةُ مِن الفُروعِ ولَيستْ مِن الأُصولِ، وطَريقها: الإختيار وَالبَيعة} واتە: حوکمڕانێتیی مسوڵمانان لە لقەکانی دینە، نەك لە بنچینەکانی و، شێوازەکەشی تەنها بریتیە لەوەی مسوڵمانان ئازادانە کەسێك هەڵبژێرن و خۆیان بەیعەتی پێ بدەن، بەبێ ڕەچاو کردنی ڕەنگ و ڕەچەڵەك و زمان و تیرەو وەجاغ! کە ئەوەش شتێکی زۆر ڕاست بووە، بۆیە من لەسەرەتاوە گوتم: مەرج نیە هەر کە گوترا: (خەواریج) بڵێی: هەرچی گوتیان، هەڵەیە، بیرو ڕای زۆر باشیشیان هەبوون.

## ٥- خاوەن گوناهە گەورەکان:

ئەوان خاوەنانی گوناهە گەورەکانیان بە کافر داناوە، هەر کەسێ یەك گوناهی گەورەی کردبێ، بە کافریان داناوەو، گوتووشیانە: جێگای دۆزەخە بە هەمیشەیی، گوناهی گەورەش بۆ زانیارییتان! زۆربەی خەڵکی وادەزانن گوناهی گەورە واتە: کوشتن، زینا، دزیی، ڕێگریی و، ئەوانە...، بەڵام نا، گوناهی گەورە پێش ئەوەی شکاندنی قەدەغەکان بێ، چوواندنی واجبەکانە، وەك: نوێژ چواندن، ڕۆژوو چواندن، زەکات نەدان، حەج نەکردن، بۆ کەسێك کە لە

توانایدا هەبێ، پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، ئێشاندنی دڵی دایك و باب، ئەوانە هەموویان گوناهی گەورەن، نەك هەر بەلای خەاریجەوە، بەڵكو بەلای هەموو زانایانەوە، چونكە گوناهی گەورە بریتیە لە چواندنی شتێك كە خوای پەروەردگار فەرزی كردوە، یان كردنی شتێك كە خوا قەدەغەی كردوە، ئنجا خەواریج گوتوویانە: هەر كەسێك گوناهێكی گەورە بكات، چ واجبێك بچوێنێ، چ قەدەغەیەك بشكێنێ، ئەوە كافرەو، جێگاشی دۆزەخە بە هەمیشەیی! كە بەتەئكید ئەوەش تێپەڕاندنێكی زۆری تێدایەو لەوەدا نەیانپێكاوە.

## ٦- لە ڕووی دادگەریی خوا (عدل الله)وە:

لەوەشدا بەحیسابی خۆیان بۆ ئەوەی بەرگریی لە دادگەریی خوا بكەن، گوتوویانە: مرۆڤ بەدیهێنەری كردەوەكانی خۆیەتی، بۆ خۆی كردەوەكانی خۆی دەخوڵقێنێ، ڕەخنەی زۆریشیان لە جەبرییەكان هەبووە، ئەوانەی كە گوتوویانە: خوا كردەوەكانی مرۆڤ دەخوڵقێنێ و، مرۆڤ هیچ كارەیەو، هیچی لە دەست نایەت، ئنجا وەك دواییش باسی دەكەین: ئەگەر (جەبرییەكان) كورتیان هێناوە، (خەواریجیش) تێیانپەڕاندوەو، هەقیش لەنێوان ئەو دووانە دایە.

## ٧- لەبواری خوا بەیەكگرتن (توحید)دا:

گوتوویانە: خوا بەپاك دەگرین لەوەی كە لە دروستكراوەكانی بچێ، ئنجا لەوەدا گوتوویانە: ناگونجێ بڵێین: سیفەتەكانی خوا لە زاتی جیان، یان زیادن، ئەوەش مەسەلەیەكی فەلسەفیی و كەلامیی زۆر قووڵە، هەتا لە كتێبەكانی زانستی كەلامدا دەڵێ: {لا هي هو، و لا هي غيره}، ئەمە وەك مەتەڵ وایە، واتە: سیفەتەكانی خوا، زاتی خوا نین و، جیاش نین لە زاتی خوا.

٨- لەبواری بەڵێن دان و هەڕەشە كردن (وعدو وعيد)دا:

گوتوویانە: خوای باڵادەست بەڵێنی خۆی دەباتە سەرو، بەهەشتییان بۆ هەمیشەیی لەبەهەشتدا نیشتەجێ دەكات و، دۆزەخییانیش بۆ هەمیشە لە دۆزەخدا نیشتەجێ دەكات، واتە: بەهەشت و ئەهلی بەهەشت و، دۆزەخ و ئەهلی دۆزەخ، لەبەین ناچن، وەك هەندێك كەس لە پێڕو تاقمەكان گوتوویانە، كە بێگومان لەوەشدا خەواریج پێكاویانە.

٩- لەبواری فەرمان كردن بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەدا:

خەواریج زیاتر ئەو مەسەلەیان پەیوەست كردوە بە فیكری سیاسییەوەو گوتوویانە: هەر كاتێ چل كەس هەبوون، دەبێ شۆڕش بكەن، لەدژی ئەو حوكمڕانەی كە لایداوەو خراپەو ستەم دەكات، كە بێگومان ئەوەش تێپەڕاندن (إفراط)ی تێدایە.

١٠- لەبواری جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەو
سەروەت و سامان و عیبادەتدا:

خەواریج زۆر ئازا بوون، جارێك لەگەڵ سوپایەكی ئومەوییەكاندا بەرەنگار بوونەوە، كەژمارەیان (٤٠-٥٠) كەس بووە، بەرانبەر چەند هەزارێك لە ئومەوییەكان و، شكاندوویانن!

هەروەها لەمەسەلەی ماڵ و ساماندا زۆر زاهید بوون و، لەبواری عیبادەتدا، زۆر خوا پەرست بوون.

کێشەی (خەواریج) بە پلەی یەکەم ئەوەبووە کە زۆر سەرکێڵ بوون، وەك ئەو خەڵکە پەڕگیرو لادەرانەی ئەم ڕۆژگارەی ئێمە، ئنجا بەزۆریی چاك تێنەگەیشتن لە دین و سەرکێڵ بوون، هۆکارە بۆ لادان، هۆکارە بۆ پەڕگیریی و دەمارگیریی، لە ئێستاو کاتی خۆشیدا هەروا بووە، گرفتی ئەوانەش ئەوە بووە، هەر بۆیەش ئەهلی ئیسلام، ئەوانەیان هەر بە مسوڵمان لەقەڵەم داوە، ئنجا تەماشای ئینصافی عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێ، بکەن وەك لەم دەقەدا دەدرەوشێتەوە:

{عن الحسن قال: لما قَتَلَ عليٌّ الحرورية، قالوا: مَن هؤلاء يا أمير المؤمنين، أكفار هم؟ قال: من الكفر فرُّوا، قيل: فمنافقون؟ قال: إن المنافقين لا يذكرون الله إلا قليلاً، وهؤلاء يذكرون الله كثيراً، قيل: فما هم؟ قال: قوم أصابتهم فتنة فَعَمُوا فيها وَصَمُّوا}، أخرجه عبد الرزاق برقم (١٨٦٥٦)، كنز العمال برقم ٣١٥٦٨، ج١١، ص ٣٠٠.

لە حەسەنی بەصرایی گێڕراوەتەوە دەڵێ: دوای ئەوەی عەلی خوا لێی ڕاوی بێ حەرووریییەی کوشتن، {واتە: خەواریج} خەڵك گوتیان: ئەی فەرماندەی بڕواداران! ئەوانە کافرن؟ گوتی: نەخێر، ئەوانە لەچنگ کوفر ڕایان کردوە، گوتیان: ئەدی مونافیقن؟ گوتی: مونافیقەکان خوا دەربارەیان دەفەرموێ: بەکەمیی نەبێ یادی خوا ناکەن، بەڵام ئەوانە زۆر یادی خوا دەکەن، گوتیان: ئەدی ئەوانە چین؟ گوتی: ئەوانە کۆمەڵێکن فیتنەیەکیان تووش بووە، تێیدا کوێر بوون و کەڕ بوون {واتە: بەڵایەك ڕووی تێ کردوون، بەڵای سەرکێڵیی و چاك تێنەگەیشتن و قووڵ تێنەگەیشتنی ئیسلام}.

دوایی خەواریجەکان بوون بەچەند گرووپێك، بەڵام سەرەکییەکانیان، ئەم چوارەی خوارەوە بوون:

١- الأزارقة.

٢- النجدات

٣- الإباضية.

٤- الصفرية.

ئێستاش تەنیا (الإباضية) ماون کە لە وڵاتانی: عوممان و تونس و جەزائیر هەن، کەم کەم لەو چەند وڵاتە هەن، بەڵام ئەوانە هەموویان نکووڵیی دەکەن لەو تێپەڕاندنەی خەواریج و، خەڵکی دیکەی غەیری خۆیان بەکافر دانانێن و لە ڕووی فیقهیشەوە مەزهەبی (إباضية) بەیەکێ لە مەزهەبە فیقهییەکان دادەنرێ و جیاوازییەکی ئەوتۆیان نیە لەگەڵ مەزهەبەکانی {ئەهلی سوننەت و جەماعەت}[1].



---

(١) زۆربەی ئەو زانیارییانەم لە کتێبی: {تيارات الفكر الإسلامی} د. محمد عماره ص١٣-٣٣، وەر گرتوە، لەگەڵ زۆر سەرچاوەی دیکە، کە بە پێویستی نازانم ناویان بێنم و، ئەو زانیارییانە شتی باوو زانراون.




# مورجیئە ( المرجـئـة )

١- چەمك و واتای وشەی (مُرجئة).

٢- پێناسەی مورجیئە وەك تەوژمێكی فیكریی.

٣- جۆرەكانی مورجیئە.

٤- زیان و مەترسیی بیرۆكەی مورجیئە.




## چەمك و واتای وشەی (مُرجئة)

وشەی (مرجئة) (إسم فاعل)ە لە (إرجاء)ەوە هاتوە، (الإرجاء) واتە: (التأخير) دواخستن، خوای کارزان لەبارەی فیرعەونەوە فەرموویەتی {کاتێك ڕاوێژ دەکات بە دارو دەستەکەی خۆی، دەربارەی مووساو هارِوون سەلامی خوایان لێبێ، کە دارو دەستەکەی دەڵێن}:

﴿ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ١١١ ﴾ الأعراف

واتە: گوتیان: خۆی و برایەکەی دوابخە {واتە: جارێ بڕیاریان لەبارەوە مەدە}، کۆکەرەوان بەشاران دابنێرە .. کەواتە: (المرجئة) واتە: دواخەران[1].

---

(١) بڕوانە: المصباح المنير، للفيومي، ص ١٢.




## پێناسەی مورجیئە،
## وەك تەوژمێکی فیکریی

(إبن الأثير) دەڵێ: {وهم فِرْقَة من فِرَق الإسلام، يَعْتقدون أنه لا يَضُرُّ مع الإيمان معصيةٌ، كما أنه لا يَنفع مع الكُفر طاعةٌ}[1]، واتە: ئەوانە کۆمەڵێکن لە کۆمەڵەکانی ئیسلام، پێیان وایە لەگەڵ ئیماندا، هیچ گوناهێك زیانی نیە، هەروەك لەگەڵ کوفریشدا، هیچ تاعەت و چاکەیەك سوودی نیە.

هەڵبەتە ڕاستە لەگەڵ کوفردا، هیچ چاکەیەك سوودی نیە، بەڵام بەتەئکید لەگەڵ ئیماندا، گوناح زیانی هەیە.

---

(١) النهاية في غريب الحديث والأثر (٢/ ٢٠٦)




## جۆرەکانی مورجیئە

مورجیئە بە گشتی سێ جۆرن:

١- مورجیئەکانی سەرەتا (المرجئة الأولى): {وهم الذين أرجأوا أمر علي وعثمان، فلا يتولّونهما ولا يتبرؤون منهما} واتە: ئەوانەن کە دەربارەی عەلی و عوسمان خوا لێیان ڕازی بێ، گوتوویانە: ئێمە لەبارەی ئەوانەوە قسە ناکەین و بڕیار دوا دەخەین، نە پشتگیریی هیچ کامێکیان دەکەین و، نە بەڕائەتیشیان لێ دەکەین.

یەکەمجار ئا ئەوانە پێیان گوتراوە: مورجیئە، ئەوانەی کە بێدەنگییان هەڵبژاردوە لەبەرامبەر عەلی و عوسماندا خوا لێیان ڕازی بێ.

٢- شەرعزانانی مورجیئە (المرجئة الفقهاء)[1]: ئەوانەش دەڵێن: {الإيمان تصديق بالقلب، وإقرار باللسان، لا يزيد ولا ينقص، ولا يُستَثنى مِنه}[2]، واتە: ئیمان بریتیە لە بەڕاست زانینی دڵ و، دان پێهێنانی زمان، نەکەم دەکات و نە زیاد دەکات

---

(١) کە هەندێ لە مێژوونووسان و لێکۆڵەرەوان دەڵێن: ئەبو حەنیفەش ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەکەوێتە نێو ئەو بازنەوە، بەڵام بۆخۆم قەناعەتم وا نیە.

(٢) أبو جعفر الطحاوي، خاوەنی (متن العقيدة الطحاوية) یەکێکە لەوان.

و، هەڵاواردنیشی تێدا نیە، واتە: دروست نیە، ئەگەر لێیان پرسی: ئیمانداری؟ بڵێی: بەڵێ (إن شاءالله) ئەگەر خوا بیەوێ.

یانی: کردەوەی ئەندامەکانیان لە پێناسەی ئیماندا لابردووە، گوتووشیانە: نە کەم دەکاو نە زیاد دەکات، بەڵام ئاشکرایە کە ڕای زۆرینەی زانایانی ئیسلام پێچەوانەی ئەوەیە.

٣- مورجئیە تێپەڕێنەرەکانی ئەهلی کەلام (المرجئة المتكلِّمون الغلاة) کە پێشیان گوتراوە: مورجیئە جەهمییەکان (المرجئة الجهمية): ئەوانەش دەڵێن: {الإيمان يكون بالقلب فقط، والجهم قال: هو المعرفة}[1].

واتە: ئیمان تەنها بە دڵە، جەهمیش گوتوویەتی: ئیمان تەنها ناسینە.

کەواتە: لە لای وان: ئیمان نەك هەر کردەوەی ئەندامەکانی ناوێ، بەڵکو دان پێداهێنانی زمانیشی ناوێ، بەڵکو جەهم گوتوویەتی: ئیمان بەس بریتیە لە زانین!

ئنجا نازانم دەبێ چۆن ئەو قسەیەی کردبێ؟! چونکە ئیبلیسیش زانیویەتی خوا هەقە، بەڵام ئایا بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێ؟ خوای دادگەر دەربارەی فیرعەون و دارو دەستەکەی دەفەرموێ:

﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴿١٤﴾ ﴾ النمل

واتە: نکوڵییان لێ کردو لەدڵی خۆشیاندا، لە موعجیزەکانی مووسا دڵنیا بوون، {بەڵام نکووڵییان لێکرد} بەهۆی ستەم و خۆ بەزل گرییەوە.

---

(١) کتاب الشريعة للآجري، ج٢ ص ٦٧٧ (الحاشية).




## زیان و مەترسیی بیرۆکەی موڕجیئە

{عن الأوزاعي، عن الزهري قال: ما ابتدعت في الإسلام بدعة أضر على الملة من هذه يعني: أهل الإرجاء}[1].

{ئاجورڕیی} لە کتێبەکەی خۆیدا بەسەنەدی خۆی لە ئەوزاعییەوە دێنێ، ئەویش لە زوهرییەوە، دەڵێ: لە ئیسلامدا هیچ بیرۆکەیەك دانەهێنراوە، زیان گەیەنەرتر بێ بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، لە بیرۆکەی ئەهلی ئیرجاء.

ڕەنگە قسەکەی هێندێك زێدەڕۆییشی تێدا هەبێ، بەڵام تا ڕاددەیەك وایە، چونکە زۆربەی ئەوانەی ئێستا لەگەڵ حوکمڕاناندا دەڕۆن، پینەی ناشەرعییەکانیان بۆ دەکەن و، لەبەرامبەر ناشەرعییەکانیاندا بێ دەنگن، ئنجا بەناوی زانای ئایینی، یان سەلەفیی، یان ئەهلی تەصەووف، یاخود بەهەر ناوێکەوە بێ، ئەوانە هەموویان فیکرەی ئیرجائیان تەبەننیی کردوە، کردەوە لە ئیمان دوا دەخەن، واتە: ئەگەر حوکمڕانێك زینا بکات، قەتڵ بکا، ستەم بکات، هەرچییەك بکات، مادام گوتی: مسوڵمانم، دەڵێن: تازە هەر مسوڵمانەو هیچ کەس بۆی نیە لە گوڵ کاڵتری پێ

---

(١) هەمان سەرچاوە ج٢ ص ٦٧٧.

بڵێ! کە بێگومان ئەو بیرۆکەیە زیانی زۆری هەیەو، وا نیە هەر کەسێ گوتی: مسوڵمانم، هەر مسوڵمان بێ، بەڵکو هەر کات هەڵوەشێنەرەوەکان (نواقض)ی لێ وەدەر کەوتن، ئەو کاتە حاڵەتەکەی دەگۆڕێ، با ئیددیعای ئیسلامیش بکات، چونکە ئەو مونافیقانەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بوون، خوای دادگەر جاری وا بوو، بەهۆی یەك دوو هەڵوێستەوە، ناوی ئیسلامی لێ لادەبردن، ناوی ئیمانی لێ لادەبردن، بۆ وێنە:

١- خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ ﴿٦٦﴾ ﴾ التوبة.

واتە: ئەگەر لێیان بپرسی: (هەندێکیان هەندێ قسەیان دەکرد، وەك گاڵتە کردن بە خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و، قورئان و ئیسلام) دەڵێن: ئەوە هەر قسەی ڕێمان دەکردو بە گاڵتە قسەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بە خواو بە ئایەتەکانی خواو بە پێغەمبەرەکەی دەکرد؟ بیانوو مەهێننەوە، لەدوای ئەوەی کە ئیمانتان بووە (واتە: خۆتان بە ئیماندار داناوە) ئێستا کافر بوونەوە {بەو هەڵوێستەتان}.

٢- هەروەها خوای بەرزی مەزن دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ ﴿٧٤﴾ ﴾ التوبة

واتە: (دەغەڵەکان) سوێند بە خوا دەخۆن کە ئەوەیان نەگوتوە (کە پێی تۆمەتبار کراون) بەڵام بە دڵنیایی وشەی کوفریان گوتوەو پاش ئیسلامەتییان کافر بوونە.

واتە: دوای ئەوەی کە ئیسلامەتییان پێشان داوە، ئێستا بەکافر لەقەڵەم دەدرێن، ئەو مونافیقانەی کە هەڵوێستی وایان لێ پشکوتۆتەوە، کە پێچەوانەی ئیمان و ئیسلام بووە.

کەواتە: ئەوە درۆیەکی گەورەیە کە هەرکەس گوتی: مسوڵمانم، هەرچییەك بکات و هەرچییەك بڵێ هەر مسوڵمان بێ و گۆڕانی بەسەردا نەیەت!




# جەبرییە ( الجبرية )[1]

١- پێناسە.

٢- پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی جەبر.

٣- زیانی گەورەی بیرۆکەی جەبر لە ژیانی مسوڵماناندا.

---

(١) نەمزانیوە جەبرییەکان لە کۆمەڵێکدا بەرجەستە بووبن، بەهەمان شێوە مورجیئەش، بەڵکو تەنیا وەك تەوژمی فیکریی هەبوون.




## پێناسە

أ- (الجرجاني) دەڵێ: {الجبرية: هو من الجبر، وهو إسناد فعل العبد إلى الله تعالى، والجبرية اثنان:

١- متوسطة تُثْبِتُ للعبد كسباً في الفعل كالأشعرية، ٢- وخالصة لا تُثْبِتُ كالجهمية}[1]، واتە: جەبرییە لە (جَبْر)ەوە هاتوە، (جبر) واتە: زۆر لێکردن، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کردەوەی بەندە پاڵ بدرێتە لای خوا، جەبرییەش دوو جۆرن و دوو حاڵەتیان هەن:

**یەکەم:** حاڵەتێکی میانجیی هەیە، کە بۆ بەندە وە دەستهێنان (کسب) دەچەسپێنێ، کە مرۆڤ دەتوانێ کردەوەکانی خۆی بەدەست بێنێ، کە ئەشعەرییەکان وا دەڵێن.

**دووەم:** ئەوانەن کە بەتەواویی خۆیان بۆ ئەو فیکرەیە ساغ کردۆتەوەو، هیچ کردەوەیەك بۆ مرۆڤ ناهێڵنەوە، کە جەهمییەکان، لەوانەن.

---

(١) التعريفات، ص ٨٠.

ب- (د. کمیل الحاج) دەڵێ: {مذهب يرى أن إرادة الإنسان عاجزة عن توجيه مجرى الأحداث، وأن كل ما يحدث للإنسان قد قدِّر عليه منذ الأزل، فالإنسان مُسَيَّر لا مخيَّر}[1].

واتە: جەبرییە ڕێبازی کەسانێکە کە پێیان وایە، مرۆڤ دەستەپاچەیە لەوەدا کە کاریگەریی هەبێ بۆ سەر ڕەوتی ڕووداوەکان و، هەرچی بۆ مرۆڤ دێتە پێش، هەمووی لە ئەزەلدا بۆی بڕیار دراوەو، مرۆڤ شت لەدەست هاتوو نیەو ئەوە نیە دەستکراوەبێ، بەڵکو دەستە پاچەیەو هیچ لەدەست نەهاتوویە.



---

(١) الموسوعة الميسرة، في الفكر الفلسفي والإجتماعي ... عربي - إنكليزي، ص ١٨٠.




# پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی جەبرییەکان

لێرەدا پێویستە ئەوەندە بڵێین: کە خوای زاناو توانا ئەوەی لەبارەی مرۆڤەوە زانیویەتی - کە بەتەئکید هەموو شتێك دەزانێ - ئەوە نابێتە هۆی دەستە پاچە بوونی مرۆڤ، چونکە جەبرییەکان گوتوویانە: مادام خوا هەموو شتێك دەزانێ لە ئەزەلدا لەبارەی مرۆڤەوە، کەواتە مرۆڤ هیچی بۆ نامێنێتەوە!

ئنجا بەڵگە زۆرن بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو قسەیەو ئێمە لە تەوەری دووەمدا: {هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان} قسەمان لەو بارەوە کردووە، ئەو بیرۆکەیەمان پووچەڵ کردۆتەوەو، لێرەش بەم وێنەیە وازی لێ دێنین:

ئایا زانیاریی و شارەزایی مامۆستایەك لە بارەی قوتابیەکانیەوە، کە فڵانکەس دەردەچێ و فڵان کەس دەکەوێ و.. هتد، -کە ئەو ئەنجامگیرییەشی لە واقیعی خودی قوتابیەکان کردوە - دەکرێ بکرێتە بەڵگەو بیانوو بەدەست قوتابیەکانیەوە، کە هۆکاری دەرچوون و کەوتنی قوتابییەکان زانیاریی و شارەزایی مامۆستاکەیان بووە لەبارەیانەوە؟!

بێگومان نەخێر، تەنانەت ئەگەر مامۆستایەکە لە دەفتەری تێبینییەکانیشیدا ئەو شتانەی نووسیبێ، هیچ کەس بۆی نیەو لۆژیك و عەقڵ ڕێ نادات، زانیاریی و نووووسینەکەی مامۆستایەك بکرێتە هۆکاری دەرچوون و دەرنەچوونی قوتابییەکان، چونکە هۆکاری دەرچوون یان دەرنەچوونیان تەنیا: هەوڵ و کۆششی خۆیان یان کەمتەرخەمییانە!

ئنجا زانیاریی و شارەزایی خوای بێ وێنەو تاك و پاکیش لەبارەی کردەوەی مرۆڤەکانەوە بەهەمان شێوە (ولله المثل الأعلى).




## زیانی گەورەی بیرۆکەی جەبر،
## لە ژیانی مسوڵماناندا

(جەبر) وەك تەوژمێكی فیكریی، لە ڕابردوووداو ئێستاش، زیانێكی گەورەی لە مسوڵمانان داوەو هۆكارێكی بێ ڕەزای پەكخستن و لە پەل و پۆ خستنیان بووە، مامۆستای گەورەی كۆیی (مەلا محمد) دەڵێ:

{چونكە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی كرد
ئوممەتی وا زەبەلاح هەمووی بە زیندوویی مرد}

مەبەستی پێ جەبرییەكانە، ڕاستە: تۆ پێت وا بێ هیچت بەدەست نیەو، هیچت لەدەست نایەت و، خوا هەموو شتێكت پێ دەكات! مانای وایە دەست بەخۆتدا بەردەدەیەوە، داخۆ قەدەری خوا بۆ كوێت دەبات و، وەك كۆلكە دارێك خۆت دەدەیە دەست ڕووباری قەدەری خوا! كە ئەوەش پێچەوانەی شەریعەتە، چونكە: بەڵێ خوا هەموو شتێك دەزانێ و هەموو شتێك دەتوانێ، بەڵام هەر ئەو خوایەی هەموو شتێك دەزانێ و دەتوانێ، هەمیشە دەفەرموێ:

﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧ ﴾ السجدة.

واتە: ئەوە پاداشتی ئەوەیە كە دەیانكرد.

وەك دەبینین: خوای كارزان كردەوەی مرۆڤەكان پاڵدەداتە لای خۆیان و، بینا لەسەر ئەوەی خۆشیان ئەو كردەوانەیان ئەنجام داون، سزا یان پاداشتیان بۆ دادەنێ، وەك فەرموویەتی:

﴿مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾﴾ فصلت.

واتە: هەر كەس چاكەی كرد، خۆی لێی بەهرەمەندەو، هەركەسیش خراپەی كرد، خۆی لێی زەرەرمەندەو، پەروەردگارت ستەم لە بەندەكانی ناكات.




# قەدەرییە (القدرية)

١- پێناسە.

٢- جۆرەکانی قەدەرییە.

٣- سێ جۆرە هەڵوێست لە بەرانبەر ئیمان بەقەدەردا.

٤- بۆچوونی بەندە لەبارەی کردەوەکانی مرۆڤ و قەدەری خواوە.




## پێناسە

أ- (الجرجاني) دەڵێ: {القدرية: هم الذين يزعمون أن كلَّ عبد، خالق لفعله، ولا يرون الكفر والمعاصي بتقدير الله تعالى}[1]، واتە: قەدەرییە ئەوانەن کە پێیان وایە: هەموو بەندەیەك بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی و، پێیان وایە کە کوفرو گوناح و تاوان بە ئەندازە گیریی خوا نین {بەڵکو مرۆڤ بۆخۆی کردەوەکانی خۆی پەیدا دەکات}.

ب- لە (المعجم الوسيط)یشدا لەو بارەوە هاتوە:

{ القدرية: قوم يُنكِرون القَدَر ويقولون: إِن كل إِنسانٍ خالق لِفعْلِهِ }[2].

واتە: قەدەرییەکان کۆمەڵێکن نکوولّی لە ئەندازەگیریی (خوا) دەکەن و دەڵێن: هەموو مرۆڤێك بەدیهێنەری کردەوەکەیەتی.

---

(١) التعريفات: ١٧١.

(٢) ص ٧١٨




## جۆرەکانی قەدەرییە

قەدەرییە بە گشتی دوو جۆرو دوو بەشن:

أ- بەشێکیان دەڵێن: ئەصڵەن خوای پەروەردگار کردەوەکانی ئێمەی هەر نەزانیوە، تاکو بۆخۆمان نەیانکەین، نایانزانێ! دیارە ئەو بیرۆکەیە لە فەلسەفەی یۆنانییەوە هاتوە، ئەوان گوتوویانە: خوا وردەکارییەکان (جزئيات) نازانێ، وردەکارییەکانی کردەوەکانی مرۆڤەکان نازانێ، گوتوویانە: خوا زۆر لەوە گەورەترە، خۆی بەو وردە شتانەوە سەرقاڵ بکات! بە حیسابی خۆیان زۆر ڕێزیان لە خوا گرتوە! بەڵام قەدەرییەکانی ئەهلی ئیسلام، بۆیە نکووڵییان کردوە لەوەی: خوا هەموو شتێك بزانێ، تاکو بەرگریی بکەن لە دادگەریی خوا!!

ب- کۆمەڵێکی دیکەیان دەڵێن: خوای زاناو توانا هەموو شتێك دەزانێ و، هەموو شتێکیشی ئەندازەگیریی کردوە، بەڵام مرۆڤ بۆخۆی کردەوەکانی خۆی دروست دەکات، ئەمانەش زۆربەیان ناسراون بە: موعتەزیلە، کە گوتوویانە: مرۆڤ بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی.




# سێ جۆرە هەڵوێست لە بەرانبەر ئیمان بەقەدەردا

لەبەرامبەر قەدەردا، بە گشتی سێ بۆچوون هەن:

**بۆچوونی یەكەم:**

ئەوانەن كە دەڵێن: پێویستە: زانیاریی و ئەندازەگیریی خوا بە نسبەت كردەوەی مرۆڤانەوە، لاببرێن، تاكو دادگەریی خوا عز وجل زیانی پێ نەگات، ئەمانە زیاتر بەناوی (معتزلة) ناسراون.

**بۆچوونی دووەم:**

كە هی جەبرییەكانە، ئەوەیە كە: هیچ شتێك لەژێر دەسەڵاتی خوا ناچێتە دەرێ، بەو واتایەی: هەرچی دەكرێ، خوا دەیخوڵقێنێ و خوا دەیكات و، مرۆڤ هیچ كارە نیە!

**بۆچوونی سێیەم:**

هێڵی نێوەڕاستە، کە دەڵێ: هەموو شتێك بە زانیاریی و دەستەڵات و ویستی خوایە، بەڵام مرۆڤیش بەشە ویست و توانایەکی پێدراوە، کە بەو بەشە ویست و توانایەی (الإدارة الجزئية)ی، کردەوەکانی خۆی بەدەست دێنێ.




## بۆچوونی بەندە لەو بارەوە

پوختەی بۆچوونی بەندە، لەوبارەوە - وەك پێشتر باسم كرد - ئەوەیە: كە: نە خوا كردەوەكانی ئینسان دروست دەكات و نەمرۆڤیش دروستیان دەكات، چونكە كردەوەكانی مرۆڤ دروستكراو (مخلوق) نین، تاكو پێویستییان بە بەدیهێنەر (خالق)ێك بێ، بەڵكو وەدەستهێنراو (مكسوب)ن پێویستییان بە وەدەستهێنەر (كاسب)ەو، (مفعول)ن و پێویستییان بە بكەر (فاعل)ێك هەیەو، گێڕراو (مجعول)ن پێویستییان بە گێڕەر (جاعل)ێك، هەیەو، ئەنجامدراو (معمول)ن و پێویستییان بە ئەنجامدەر (عامل)ێك هەیە، خواش ئەو وشانەی بۆ كردەوەكانی مرۆڤ بەكار هێناون، كە مرۆڤەكان كردەوەكانی خۆیان: ئەنجام دەدەن، بەدەستیان دێنن، دەكەن.. ئنجا مرۆڤیش ئەو (كاسب) و (جاعل)و (عامل)ەیە بۆ نموونە:

١- ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴾ البقرة: ٢٨٦.

٢- ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ۝٥٧ ﴾ النحل: ٥٧.

٣- ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ﴾ الجاثية: ١٥.

٤- ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ الجاثية: ٢١.

ئەوەش بۆچوونێکی خۆمەو لە کتێبەکانی (علم الکلام)دا نەمبینیوەو، کەپێم وایە ئەوە زیاتر لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا دێتەوە، بەمەش دادگەریی و، تواناو، ویستی خوا، هیچیان ناچنە ژێر پرسیارەوەو، لەبەرامبەردا، مرۆڤیش لە کەوڵی خۆی نابرێتە دەر، بگوترێ: مرۆڤیش دەتوانێ: خەلق بکات!!

شایانی باسیشە هەرکام لەم دوو سەرچاوەیەدا:

١- (موسوعة: الإسلام کما یتجلی في کتاب الله) {الکتاب الثاني: تعریف الإیمان..}.

٢- ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی.

ڕوونتر باسی ئەو مەسەلەیەم کردوە.




# جەهمییە ( الجهمية )

١- پێناسە.

٢- کارتێکراویی ئەشعەرییەکان بە بیرۆکەی جەهمییەکان.

٣- پاساوو بیانووی سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکەیە لەلایەن هەڵگرانییەوە.




## پێناسە

(الجهمية) بەسێ شێوە پێناسە کراوەو هەرسێکیان دێنم، بۆ ئەوەی بەرچاوتان ڕوون بێ: ئایا جەهمییەکان کێ بوون، جەهم کێ بووە؟ فیکرەکەی چۆنە؟!

أ- (الجرجاني) دەڵێ: {الجهمية هم أصحاب جهم بن صفوان، قالوا: لا قدرة للعبد أصلاً، لا مؤثرة ولا كاسبة، بل هو بمنزلة الجمادات، والجنة والنار تفنيان بعد دخول أهلهما، حتى لا يبقى موجود سوى الله تعالى}[١].

واتە: جەهمییەکان بریتین لە هاوەڵانی جەهمی کوڕی صەفوان (یەکێك بووە لە زانایان)، گوتوویانە: بەندە هیچ توانایەکی نیە، نە توانایەکی کاریگەر، نە توانای بەدەستهێنەر، بەڵکو مرۆڤ وەك ماددەی بێ ژیان وایەو، مەحکوومی ئیرادەی خوای بێ وێنەیە، هەروەها گوتوویانە: بەهەشت و دۆزەخیش دوای ئەوەی خەڵکەکەیان دەچنە نێوی، دەفەوتێن، تاکو تەنیا خوای بەرز دەمێنێتەوە.

ب- لێکۆڵەرەوەو ساغکەرەوە (محقِّق)ی (الشريعة)ی (الآجرّي) دەڵێ: {الجهمية: هم أتباع جهم بن صفوان، وهو من الجبرية الخالصة، ظهرت بدعته بترمذ، وقتله مسلم

---

(١) التعريفات، ص ٨٥.

بن أحوز المازني، بمروَ، في آخر مُلك بني أمية، وافقته المعتزلة في نفي الصفات الأزلية، وزاد عليهم، والجهم تلميذ الجعد بن درهم، الذي قتله خالد بن عبدالله القسري، سنة ١٢٥هـ، على الزندقة والإلحاد، والجعد أول من ابتدع القول بخلق القرآن، وتعطيل الله عن صفاته}[١].

واتە: جەهمییەکان: بریتین لە شوێنکەوتووانی جەهمی کوڕی صەفوان، کە ئەویش خاوەنی بیرۆکەی جەبری بێ خڵتە بووە، (واتە: زۆر تۆخ بووە لەوەدا، کە مرۆڤ بە هیچ لەدەست نەهاتوو تەماشا بکات) بیدعەتەکەی لە (ترمذ) (کە شارێکە لە ئێران) پەیدا بووە، موسلیمی کوڕی ئەحوەزی مازنیی جەهمی کوڕی صوفوانی لە شاری (مەڕوە) کوشتوە[٢]، لە کۆتایی حوکمڕانی بەنی ئومەییەدا، جەهمییەکان لەوەدا کە سیفەتە ئەزەلییەکان لەخوا لادەدەن، لەگەڵ موعتەزیلەدا یەکیان گرتۆتەوە، بەڵام جەهمی کوڕی صەفوان بیرۆکەی زیاتریشی خستۆتە پاڵ بیرۆکەکە، جەهم قوتابی جەعدی کوڕی دیرهەم بووە، {ئەویش یەکێك بووە لە زانایان} کە خالیدی کوڕی عەبدوڵڵا القسری[٣]، لە ساڵی (١٢٤ك)دا، لەسەر زەندەقەو ئیلحاد، کوشتوویەتی، جەعد یەکەم کەس بووە کە ئەو قسەیەی داهێناوە، کە دەڵێ: قورئان دروستکراو (مخلوق)ەو، یەکەم

---

(١) حاشية (كتاب الشريعة للآجرّي)، ج١ ص ٥٠٣.

(٢) ئایا هەر لەسەر ئەوە کوشتوویەتی، یاخود هۆکارێکی سیاسی هەبووە، چونکە من لە هەندێ لەوانەم کۆڵیەوە، هەبووە لەسەر ئەوە کوژراوە، کە ڕەخنەی لەو حوکمڕانە گرتوە، بەڵام ڕەنگە ئەو بیرۆکەیەشی هەبووبێ، دەشگونجێ هەندێکیان، دوایی تۆمەتێکی فیکریی وای خرابێتە پاڵ، بۆ پاساودانی کوشتنەکەی، وریابن لەو شتانە، هەرچی لە مێژوودا بینیتان، زوو تەسلیمی مەبن، تەماشای واقیعی ئێستا بکەن، زۆر شتتان بۆ بەدیار دەکەوێ.

(٣) بۆ زانیارییتان ئەو کابرایە: جەعدی کوڕی دیرهەم پیاوێکی زۆر شۆڕشگێڕ بووە، هەرچەندە ڕەنگە پیاوێکی شۆڕشگێڕو ئازاش بووبێ و، لادانی فیکریشی بووبێ، بەس پێم وایە هۆکاری کوشتنەکەی شۆڕشگێڕیی و خەباتگێڕییەکەی بووبێ، نەك لادانە فیکرییەکە، وا پێدەچێ، بەڵام هەمیشە دەستەڵات شتەکان بەجۆرێك پاساو دەداتەوە، کە خۆی لەلای خەڵکی خۆشەویست بکات، ئەگەرنا ئەو حوکمڕانانە ئەگەر ڕاست بکەن هێندە بۆ ئیسلام دڵسۆز بن کە خەڵکی لەسەر بکوژن، دەبێ پێشتر خۆیان پێیەوە پابەند بن!

کەسێك بووە کە سیفەتەکانی لە خوای پەروەردگار دارنیون.

ج- (یوسف بن عبدالله الجدیع) دەڵێ: {الجهمیة: یقولون: إنَّ اللَّهَ لا یقوم بِهِ شيءٌ مِنَ الصِّفَاتِ، لَا حَيَاةٌ وَلَا عِلْمٌ وَلَا قُدْرَةٌ وَلَا كَلَامٌ وَلَا غير ذلك، لذا فإن كلامه مخلوقٌ، خَلَقَهُ في بعض الأجسام، وابتداؤه من ذلك الجسم لا من الله، فلا يقوم بنفسه كلام: لا معنىً ولا حروف، وفسّروا المتكلم، بأنه مَنْ فِعْلُهُ الكلامُ، ولو في محلٍّ منفصل عنه}[1].

واتە: جەهمییەکان ئەوانەن کە گوتوویانە: خوا هیچ سیفەتێکی نیە، نە سیفەتی ژیان، نە زانیاریی، نە دەسەڵات، نە قسەکردن، نە غەیری ئەوانەش، {گوتوویانە: خوا ئەو سیفەتانەی نین، لەبەر ئەوەش گوتوویانە: خوا ئەو سیفەتانەی نین، چونکە پێیان وابووە: ئەگەر ئەو سیفەتانەی هەبن و، لەگەڵ خواشدا ئەزەلیی بن، کەواتە: فرە لە مێژینەیی (تعدُّد القدماء) ڕوودەدا! بە حیساب بەرگرییان کردوە لە یەکتایی خوا سبحانە و تعالی، بەڵام بەرگرییەکەیان هەڵە بووە، چونکە دەگونجێ بڵێی: خوا ئەو سیفەتانەشی هەبوون، بەڵام سیفەتەکان هەر هی زاتن و، سیفەت بەبێ زات نابێ، بەهەر حاڵ ئەوە بابەتێکی فیکریی قووڵە، ناچینە نێو وردەکارییەکەی، گرنگ ئەوەیە جەهمییەکان}[2] گوتوویانە: فەرموودەی خوا، خوا دروستی کردوە لە هەندێك لە جیسمەکانداو، سەرەتای ئەو فەرمایشتەی خوا لەو جیسمەوە هاتوە نەك لە خواوە، چونکە ناگونجێ خوا سیفەتی فەرمایشت کردنی هەبێ، نە مانایەکەی و نە پیتەکانیشی، {ئەدی کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ ﴾ النساء.

چۆنیان تەفسیر کردوە؟} گوتوویانە: (متکلِّم) یانی: کەسێك کە قسە ئەنجام دەدا، نەك قسە دەکات، واتە: قسە دروست دەکات، با لەشوێنێکی جیا لەخۆشیدا بێ {ئەو کردەوەیە دەخوڵقێنێ کە بریتیە لە قسە کردن}.

---

(١) العقيدة السلفية في كلام رب البرية، وكشف أباطيل المبتدعة الردية، ص ٣١١، ومجموع الفتاوى، ج١٢، ص ٢٩-٣٠.

(٢) نێوان کەوانەکان {} زیادەی خۆمە.




## کارتێکراویی ئەشعەرییەکان
## بە بیرۆکەی جەهمییەکان

بەشێك لە ئەشعەرییەکان هەندێك لە تارمایی فیکریی جەهمییەکانیان بەسەرەوە بووە، مامۆستایانی کوردستانی خۆمان، زۆریان ئەشعەریین، ئەوانەی لای خۆراسان و ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش، ماتوریدیین، دوایی باسی دەکەین: ڕاست نیە هەرچی کە دەگوترێ: ئەشعەریی وای گوتوە، هی ئەبو حەسەنی ئەشعەریی بێ، نا، بەڵکو هی زانایانی دواییە، ئنجا قوتابخانەی ئەشعەرییەکانیش ئەوە نیە وەك هەندێ لە سەلەفییەکان پێیان وایە، هیچی بەکەڵك نایەت، وا نیە، ئەصڵەن ئەبو حەسەنی ئەشعەریی ئیمامی مسوڵمانان بووە لە ڕۆژگاری خۆیداو، پارێزەری عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بووە، بەڵام زانایانی ئەو قوتابخانەیە، دوای ئەو، هەندێکیان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی بیرۆکەی جەهمییەکان.

جارێك لەگەڵ مامۆستایەکدا لەو بارەوە قسەم کرد دەیگوت: تۆ پێت وایە ئەم قورئانە ڕاست خوا فەرموویەتی بە جوبریل و جوبریلیش ڕاستەوخۆ بۆ

پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) هێناوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: نا، خوا مانایەکەی فێری جوبریل کردوەو، جوبریلیش بۆ خۆی دایڕشتوەو بە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) گوتوە، منیش گوتم: ئەوەت لە کوێ هێناوە، مامۆستا؟ دەیگوت: ئاخر ناگونجێ خوا فەرمایشت بکات! گوتم: با خوا فەرمایشتی هەیە، وەك چۆن دەبینێ، دەبیستێ، بەڵام سیفەتی خوا، وەك زاتی خوان، کەلامەکەشی بەهەمان شێوە.




## پاساوو بیانووی سەرهەڵدانی
## ئەو بیرۆکەیە، لەلای هەڵگرانی

ئەو قسانە بەزۆریی لەوەوە هاتوون کە بەرگریی بکەن لە پاکیی خوا، کە وەك دروستکراوەکانی ناچێ، هەمووی بەرگریی کردن بووە لە یەکتایی خواو، بەحیساب بۆ چاکەیان بووە، بەڵام وەك گوتم: تێیان پەڕاندوە: جارێك بەملاداو جارێکی دی بەلای دیکەدا، ئنجا ئەگەر قسەی واتان گوێ لێبوون، پێتان وانەبێ ئەوە هی دژی ئیسلام و عەقیدەی مسوڵمانانن و، هەر بەئانقەست و بەغەرەز لە هەواو ئارەزووەوە گوتراون! بەتەئکید ئەوە وانیە، بەڵام بێگومان هەڵە هەر هەڵەیە، با نیەتی باشیشی لە پشتەوە بێ و، پاساوەکەی هەر چییەك بێ، چونکە نیەت و مەبەستی باش ناتوانێ تکا (شفاعة) بۆ کردەوەی خراپ بکات.




# موعتەزیلە ( المعتزلة )

١- پێناسە.

٢- سەرگوزشتەی موعتەزیلەو بیروڕاو هەڵوێستەکانیان.

٣- پوختەی هەڵسەنگاندنی موعتەزیلە.




## پێناسـه

### أ- لە ڕووی زمانەوانییەوە:

وشەی (المعتزلة) وەك وشەی (المرجئة) (إسم فاعل)ە، (إعتزل) واتە: کەناری گرت، (مُعْتَزِلْ) واتە: کەنار گرتوو، (المعتزلة) واتە: کۆمەڵێك کە کەناریان گرتوە، مانا زمانەوانییەکەی ئاوایە.[١]

### أ- لە ڕووی زاراوەیی یەوە:

{د. کمیل الحاج} دەڵێ: {المعتزلة: فرقة من الفرق الإسلامية المهمة، ومدرسة من مدارس الفكر والنظر والتأويل عند المسلمين، ظهرت في مطلع القرن الثاني للهجرة، في مدينة البصرة، وأمّا تعاليم المعتزلة، فقد حُصِرَتْ كلها في خمسة، ولا يعتبر معتزلياً إلا من قال بها جميعاً، وهي:

١- التوحيد.

٢- العدل.

---

(١) المعجم الوسيط، ص ٥٩٠.

٣- الوعد والوعيد.

٤- المنزلة بين المنزلتين.

٥- الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر}[1].

واتە: موعتەزیلە کۆمەڵێکن لە کۆمەڵە ئیسلامییە گرنگەکان، قوتابخانەیەکن لە قوتابخانەکانی هزرو تێڕوانین و تەئویل کردن لە نێو مسوڵمانانداا، لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیی لە شاری بەصرەدا سەریان هەڵدا، بنەمایەکانی بیری ئیعتیزال لە پێنج شتاندا کورت هەڵهێنراون، کە هەر کەسێك ئەو پێنجەی هەموو بەیەکەوە نەبن، بە موعتەزیلیی دانانرێ:

١- خوا بەیەکگرتن.

٢- دادگەریی خوا.

٣- بەڵێن و هەڕەشەی خوا.

٤- شوێنێك لەنێو دوو شوێنەکاندا.

٥- فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپە.

ئنجا موعتەزیلە زیاتر بەو سێ بیرۆکەیە ناسراون:

أ- گوتوویانە: مرۆڤ کردەوەکانی خۆی وەدەست دێنێ و، دەیانخوڵقێنێ و مرۆڤ بەتەواوی دەست کراوەو سەر پشکە، هەر بۆیەش لێ دەپرسرێتەوەو پاداشت دەدرێتەوەو، سزا دەدرێت.

ب- گوتوویانە: سیفەتەکانی خوا، شتێکی زیاد نین لە زاتی خوا، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە، بوونی چەند شتێکی بێ سەرەتا (تعدّد القدماء) ڕوو دەدات، ئەوەش ناگونجێ لەگەڵ بێ سەرەتایی و ئەزەلیی بوونی خوادا.

ج- گوتوویانە: کەسێك گوناهێکی گەورە بکات، نە بڕوادارە، نە کافریشە، بەڵکو شوێنێکی هەیە لەنێوان کوفرو ئیماندا.

---

(١) الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي، ص ٥٦٧.




# سەرگوزەشتەی موعتەزیلە

لە حەوت خاڵدا سەرگوزەشتەو بیروڕاو هەڵوێستەکانی ئەو کۆمەڵەی هەڵگری بیرۆکەی (إعتزال)ن، باس دەکەین، کە دوایی نەك هەر وەك بیرۆکەیەك، بەڵکو لە واقیعێکی سیاسیشدا بەرجەستە بووەو، سێ لە حوکمڕانانی عەبباسیی ئەو بیرۆکەیان تەبەنی کردوەو بەزۆر فەرزیشیان کردوە:

**خاڵی یەکەم:**

**بۆچی ڕەوتی موعتەزیلە پەیدابوو؟**

دوای ئەوەی دەوڵەتی ئومەویی، کە ماوەی حوکمڕانییەکەی: (٤١- ١٣٢ك/ ٦٦١-٧٥٠ز) بوو، لەو کاتەوەی موعاویە بوو بە حوکمڕانی مسوڵمانان، دەوڵەتی ئومەویی نەوەدو دوو (٩٢) ساڵ دەوامی کرد، جا دوای ئەوەی دەوڵەتی ئومەویی دامەزرا، دوو بیرۆکەیان تەبەنیی کردن، لەسەردەمی موعاویەداو لە دوای موعاویەشەوە، دوو بیرۆکەکەش بریتی بوون لە: ١- جەبر، ٢- ئیرجاء، ئەو دوو بیرۆکەیان بڵاو دەکردنەوە.

١)- بیرۆکەی یەکەم (جبر): بەهۆی (جبر)ەوە ستەم و لادانەکانی پادشایەکانیان پاساو دەدایەوە، دەیانگوت: خوا کردەوەکانیان پێ دەکات، بۆ وێنە یەزید شەڕابی دەخواردەوە، دەیانگوت: خوا وای لێ کردوە، فڵان کەس فڵان کەسی کوشتوە، دەیانگوت: خوا وای کردوە، بۆ زانیارییتان! فیکری جەبر زۆر لە قازانجی ستەمکاران و کاربەدەستانی خراپە.

٢)- بیرۆکەی دووەم (إرجاء): وەك پێشتر گوتمان: (إرجاء) دوا خستنی کردەوەیە لە ئیمان، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو، کە بەرگریی بکەن لە ئیمانی خۆیان، بۆ وێنە: دەڵێن: مەڕوانی کوڕی حەکەم پێش نوێژیی دەکرد، نوێژی بەیانی، کە دوو ڕکاتە، کردوویەتی بە چوار، دوایی سەلامی داوەتەوەو گوتوویەتی: (هَل أزيدكم؟) بۆتان زیاد بکەم؟ هەر بەسەرخۆشیی نوێژەکەی کردوە، ئنجا یەکێك گوتوویەتی: خوا بت بڕێ ئەمڕۆ هەر بۆت زیاد کردین، چوار ڕکاتت بۆ کردووین، زیاتری چی بکەین!

بەڵێ ئەو بیرۆکەیان تەبەنیی کردوە، تاکو بڵێن: بەڵێ فڵانکەس شەڕابی خواردوەو قەتڵی کردوە، بەڵام کردەوە بەشێك نیە لە ئیمان و، ئەگەر ئیمانت هەبوو، تازە گوناح زەرەر لەو ئیمانە نادات، وەك چۆن تاعەت قازانج ناگەیەنێ لەگەڵ کوفردا، گوناهیش زەرەر نادات لەگەڵ ئیماندا!

لەسەردەمی بەنو ئومەییەدا ئەم دوو فیکرەیە زۆر بڵاو کراونەوە، هەم فیکرەی جەبر، هەم فیکرەی ئیرجاء، ئەمەش بۆ دژایەتیی کردنی ئۆپۆزسیۆن، ئۆپۆزیسیۆن کێ بوون؟ هەر خەواریج نەبوون، حەسەنی بەصرایی، ئیبن و سیرین، بنەماڵەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەر لە حەسەنەوە تاکو حوسەین، دوایی موحەممەدو ئیبراهیمی برای، کوڕانی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی، ئنجا عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەشعەث، ئەو پیاوە گەورە گەورانە موعارەزە بوون، هەروەها ئەبو حەنیفەو شافیعی و مالیك و ئەحمەد، ئنجا لە ئەنجامی بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی ئومەوییەکان و تەبەنیی کردنیاندا، بۆ ئەو جۆرە بیرۆکانە، سێ تەوژم لە دژیان دروست بوون:

١- تەوژمی خەواریج.

٢- تەوژمی شیعە، لەسەردەمی خۆیدا بە سەرکردایەتی جەعفەری صادق، کە لە ساڵانی (٨٠-١٤٨ك)دا، ژیاوە.

٣- تەوژمی (العدل والتوحید) ئەویش حەسەنی بەصڕایی کە لە (٢١-١١٠ك) دا ژیاوە، بەزۆریی بەسەرپەرشتیی ئەو بووە، کە جارێ موعتەزیلە، سەریان هەڵنەدابوو، بەڵکو ئەوە لەبەرامبەر تەبەننیی کرانی بیرۆکەی (جبر)دا کە ئینسان هیچ نیەو هیچی بەدەست خۆی نیە، هەروەها لە بەرانبەر بیرۆکەی (إرجاء)دا، کە هەر کەسێ گوتی: ئیماندارم، کردەوەی هەبێ و نەبێ، تازە ئیماندارەو بە گوناهان زەرەری پێ ناگا، لەبەرامبەر ئەوەدا تەوژمی سێیەم پەیدا بوو، بەناوی: (دادگەریی و خوا بەیەکگرتن)، بەڵێ لەسەرەتاوە قوتابخانەکەی (الحسن البصری) ئەو سێ بنەمایەی هەبوون:

١- دادگەریی (العدل).

٢- خوا بەیەکگرتن (التوحید).

٣- بەمونافیق دانانی خاوەنانی گوناهی گەورە (القول بنفاق مرتکبي الکبیرة).

هەتا دەربارەی خاڵی سێیەم: جارێك یەکێك لە حەسەنی بەصڕایی پرسیار کرد: ئەی ئیمام! لە بەصڕادا هیچ مونافیقت پێ شك دێن؟ ئەویش پێ کەنی و گوتی: ڕەحمەتی خوات لێبێ وامزانی زۆر عاقڵی، ئەگەر بەصڕا مونافیقەکانی لێ بچنە دەرێ، وا چۆڵ دەبێ سامێی لێ دەکەی، یانی: زۆر زۆری تێدان، هەڵبەتە مەرج نیە، کە گوتوویەتی: ئەو کەسەی گوناهی گەورە دەکات، مونافیقە، مەبەستی ئەوە بووبێ کە لە ئیسلام چۆتە دەرێ، چونکە نیفاقیش دوو جۆرە: ١- عەقیدەیی، ٢- کردەیی، کە ئەوەش فەرمایشتی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەسەرە، دەفەرموێ: {آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثَةٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ} أخرجه أحمد برقم (٨٦٧٠)، والبخاري برقم (٣٣)، ومسلم برقم (٥٩)، والترمذي برقم (٢٦٣١)، وقال: حسن غریب، والنسائي برقم (٥٠٢١)، وأخرجه أیضًا: أبو یعلی برقم (٦٥٣٣).

واتە: نیشانەی مونافیق سێن: ئەگەر قسەی کرد، درۆ بکات و، ئەگەر بەڵێنی دا بیشکێنێ و، ئەگەر سپاردەی پێدرا، ناپاکیی لێ بکات.

کەواتە: پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) خاوەنی ئەو گوناهانەی بە مونافیق لەقەڵەم داوە، بەڵام زانایان دەڵێن: مەبەستی نیفاقی کردەییە، نەك نیفاقی ئیعتیقادیی، ئنجا دیارە خەواریج کە گوتوویانە: هەرکەسێ گوناهێکی گەورە بکات، پێی کافر دەبێ، مورجیئەش گوتوویانە: بەردەوام گوناهان بکە! هیچ زەرەر بە ئیمانت ناگات، حەسەنی بەصرایی و ئەوانەی لەگەڵی دابوون گوتوویانە: نەخێر ئەوەی گوناهی گەورە بکات مونافیقە، دیارە پشتیان بەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەستوە، بەڵام بەتەئکید مەبەستیان نیفاقی گەورە نەبووە، کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەباتە دەر.

**خاڵی دووەم:**

**کەی ناوی موعتەزیلە پەیدا بوو؟**

جارێ ئەوانەی کە ئەو قوتابخانەیەیان پێك هێنا، بریتی بوون لە:

أ- (غیلان بن مسلم الدمشقي)، کە لە ساڵی (١٠٦ك)دا، وەفاتی کردوەو قوتابی حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنەفییەیە، کە ئەو حەسەنەش لە ساڵی (١٠٠ك)دا وەفاتی کردوە.

ب- (أبو حذیفة واصل بن عطاء بن الغزال) (٨٠-١٣١)ك، ئەمەشیان قوتابی ئەبی هاشم موحەممەدی کوڕی حەنەفییەیە، ئەو موحەممەدەش ناوی تەواوی (محمد بن علي بن أبي طالب)ە، (٢١-٨١)ك.

لێرەوە ناوی موعتەزیلە هاتە ئاراوە، کە لە بەصرە (واصل بن عطاء)، چووە نێو ئەو بازنەیەی کە حەسەنی بەصرایی دەرسی تێدا دەگوتەوە، لەوێ بە زانایان گەیشت، یەکێ لەوانەی (عمرو بن عبید) (٨٠- ١٤٤ك).

ئنجا لەسەر ئەوە کە پرسیار لە حەسەنی بەصرِایی کرا: ئایا کەسێك کە گوناهی گەورە دەکات، مسوڵمانە، یان کافرە؟ بەر لەوەی حەسەنی بەصرِایی وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە، واصڵ گوتی: من پێم وایە نە مسوڵمانە، نەکافرە، بەڵکو پێگەی نێوان دوو پێگەکانی هەیە (لە منزلة بين المنزلتين)، لەسەر ئەمە واصڵ مەجلیسەکەی خۆی جیا کردۆتەوە، دیارە ئەویش زانایەك بووە، ئنجا حەسەنی بەصرِایی گوتوویەتی: (إعتزلنا واصل)، واتە: واصڵ دوورکەوتەوەو کەناری گرت لە مەجلیسەکەی ئێمە، ئیدی لەوەوە ناوی (معتزلة) سەری هەڵدا.

**خاڵی سێیەم:**

**بنەمایەکانی تەوژمی موعتەزیلە:**

لە پێشدا بنەماکانی ئەو قوتابخانەیە سێ بوون:

١- دادگەریی (عدل).

٢- خوا بەیەکگرتن (توحید).

٣- خاوەنانی گوناهە زلەکان (مرتکبي الکبیرة).

بەڵام دوایی لەسەردەمی واصڵدا پایەی چوارەم: پێگەی نێوان دوو پێگەکان (المنزلة بين المنزلتين)یان بۆ زیاد کرا، دوایی لەسەردەمی (أبي هذيل العلاّف) دا کە لە ساڵی (٢٣٥ك)دا وەفاتی کردوە، بنەمایەکان بوون بە پێنج، بنەمای پێنجەم: فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهی عن المنکر)یشیان خرایە پاڵ.

ئەو پێنجەی پێشتر باسم کردن: (١- التوحيد. ٢- العدل. ٣- الوعد والوعيد. ٤- المنزلة بين المنزلتين. ٥- الأمر بالمعروف والنهی عن المنکر). ئەمە زیاتر لە سەردەمی (قاضي القضاة عبدالجبار بن أحمد الهمذاني)دا: (٤١٥هـ/ ١٠٢٤م) کە پیاوێکی زۆر شارەزاو زاناو زەبر دەست بووە، بۆ بەرگریی کردن لە

ئیسلام و مسوڵمانان، موعتەزیلە بە گشتی زۆر بە توانا بوون بۆ دیفاع کردن لە ئیسلام، چونکە چەکدار بوون بە ڕۆشنبیریی و زانستی سەردەمی خۆیان، هەڵبەتە زانایانی دیکەش هەبوون کە شەرعزان بوون، هەروەها تەفسیرزان و فەرمووده‌ناس بوون، بەڵام زۆر شارەزای ڕۆشنبیریی و زانستی سەردەمی خۆیان نەبوون، بۆیە نەیانتوانیوە باش بەرگریی بکەن، بەڵام موعتەزیلە، زۆر شارەزا بوون لە تەوژمە فیکرییەکانی ڕۆژگاری خۆیان، وەك فەلسەفەكانی: یۆنان، چین، هیند، ئێران، میصر، توانیویانە هەر بەچەکی خۆیان بەرپەرچی نەیارەکانی ئیسلام بدەنەوە.

## بۆچی موعتەزیلە ئەو پێنج بنەمایەیان داناون؟!

١- باسی خوا بەیەکگرتنیان کردوە (توحید) بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو کەسانە بدەنەوە، کە خاوەنی بیرۆکەی ئیلحاد بوون و دانیان بە بوونی خوادا نەهێناوە، هەروەها بەرپەرچی ئەوانە بدەنەوە کە بڕوایان بە سیفەتەکانی خوا نەبووە، دیسان ئەوانەی کە خوای پەروەردگاریان وەك دروستکراوەکان تەماشا کردوە.

٢- باسی دادگەرییان کردوە، (عدل) بۆ ئەوەی بەرپەرچی جەبرییەکان بدەنەوەو گوتوویانە: ئەگەر خوا کردەوەی مرۆڤ بخوڵقێنێ، ئەدی چۆن سزای دەدا؟ نەخێر وا نیە.

٣- کە باسی پەیمان و هەڕەشەی خوا (الوعد والوعید)یان، کردوە، بۆ ئەوە بۆ ئەوە بووە بەرپەرچی مورجیئە بدەنەوە، چونکە مورجیئەکان گوتوویانە: دەگونجێ دوایی خوای کاربەجێ بەهەشت و دۆزەخ نەهێڵێ، ئەوانیش گوتوویانە: نا وا نیەو، ئەو پەیمانانەی خوا داونی هەڕەشەکانیشی کە کردوونی، دەیانهێنێتە دی و، بەهەشت و دۆزەخیش هەرماو دەبن و دەمێنن.

٤- کە باسی پێگەی نێوان دوو پێگان (المنزلة بین المنزلتین)یان کردوە، بۆ ئەوە بووە بەرپەرچی خەواریج بدەنەوەو، بەرپەرچی مورجیئەش بدەنەوە، هەروەها

خۆشیان بپارێزن لە دادوەریی کردن لەنێوان عوسمان و عەلییدا، خوا لێیان ڕازی بێ کە ئایا کامیان لەسەر هەق بووە؟!

٥- کە باسی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهی عن المنكر)یان کردوە، ویستوویانە: بەرپەرچی شیعەی دوازدە ئیمامیی بدەنەوە، چونکە شیعەی ئیمامیی، کاتی خۆی بڕوایان وابووە کە دەبێ بێ دەنگ بی، لەبەرامبەر حوکمڕانانی لادەرو ستەمکاردا.

یانی: هەر کامێك لەو پێنج بنەمایە، بۆ بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی هەندێ لەو گرووپانە بوون کە لە سەردەمی ئەواندا بوون، واتە: ئەو بنەمایانەیان، زیاتر وەك کاردانەوە بوون.

**خاڵی چوارەم:**

**ڕۆڵی گرنگی موعتەزیلە لە بەرگریی کردن لە ئیسلام دا:**

موعتەزیلە لەڕۆژگاری خۆیاندا پارێزەری عەقیدەو فیکری ئیسلامیی بوونەو، لەو بارەوە بەسەرهاتێکتان بۆ دەگێڕمەوە:

{لە سەردەمی هاروونە ڕەشیددا سێیەمین حوکمڕانی عەبباسییەکان، کە لە ساڵانی: (١٤٩- ١٩٣ك/ ٧٦٦-٨٠٩م)دا ژیاوە، پادشای (سند)[١]، داوای لە هاروونە ڕەشید کردوە کە زانایەك لە زانایانی ئیسلام بنێرێ بۆ وتووێژ کردن لەگەڵ زەعیمی تائیفەی سیمنیی[٢]، ئەویش گەورەی قازییەکان دەنێرێ و ئەم وتووێژەیان لەبەین ڕوودەدا:

-زەعیمی سیمنییەکان دەڵێ: هەواڵم پێ بدە! ئایا خوایەکەی تۆ خاوەن دەستەڵاتە، یان بێ دەستەڵاتە؟

---

(١) سندو هند، ئەو کاتە دوو وڵات بوون لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

(٢) سیمنییەکان مولحید بوون.

+ قازیی دەڵێ: بەڵێ، خوا خاوەن دەستەڵاتەو هەموو شتێك دەتوانێ.

- سیمنییەکە دەڵێ: ئایا ئەو پەرستراوەی تۆ، دەتوانێ یەکێکی وەك خۆی دروست بکات؟

+ قازیی دەڵێ: ئەم پرسە لە پرسەکانی عیلمی کەلامە، عیلمی کەلامیش بیدعەتە، هاوەڵانی ئێمە نکوڵیی لێ دەکەن.

- ئەویش دەڵێ: هاوەڵانی تۆ کێن؟

+ قازیی دەڵێ: موحەممەدی کوڕی حەسەن و، ئەبو یووسف و، ئەبو حەنیفە، گوتوویانە: نابێ باسی عیلمی کەلام بکەن.

لێرەدا وتووێژەکە کۆتایی دێ و، زانا سیمنییەکە ئاوڕ دەداتەوە لە پادشای (سند)و دەڵێ: پێم گوتی: دینەکەیان چۆنە! ئەوانە نەزانن و لاسایی کەرەوەن، هەر بەهۆی دەسەڵاتەوە خۆیان فەرز کردوە، ئەگەرنا ناتوانن بەرگریی لە عەقیدەکەی خۆیان بکەن، ئەوەتا گوێت لە وەڵامەکەی بوو! {کە دیارە وەڵامەکەی زۆر فەقیر حاڵانەو نامەنتیقیی بووە}.

ئیدی قازیی بە تێکشکاویی دەگەڕێتەوە بۆ بەغدادو، نامەیەکی پادشای (سند)یش بۆ هاڕوونە ڕەشید دێت، پێی دەڵێ: من پێشتر پێم گوتی: دینەکەی تۆ پووچە {دیارە پێشتر هاڕوونە ڕەشید داوای لێ کردوە مسوڵمان بێ}، لە نامەکەدا بۆ هاڕوونە ڕەشید دەنووسێ: ئێستا یەقینم بۆ پەیدا بوو کە دینەکەی ئێوە لەسەر عەقڵ و مەنتیق بنیات نەنراوە.

هاڕوونە ڕەشیدیش زۆر تووڕە دەبێ و، دەڵێ: ئەوە کەسێك نیە وەڵامی ئەو مولحیدانە بداتەوە؟

یەکێك لە مەجلیسەکە پێی دەڵێ: پیاوی ئەو مەیدانە موعتەزیلەن، تۆش هەموویانت سجن کردون، ئنجا هاڕوونە ڕەشید دەڵێ: یەکێکم بۆ بێنن لە موعتەزیلە، گەنجێکی بۆ بانگ دەکەن کە ناوی (معمر بن عباد) دەبێ، کە لە ساڵی (٢١٥ك/٨٣٠ز)دا وەفاتی کردوە.

هارِوونە ڕەشید بەو گەنجە دەڵێ: پرسیارێکی ئاوا لە قازیی کراوەو، قازییش ئاوای وەڵام داوەتەوە، جەنابت دەڵێی چی؟ ئەویش دەڵێ: ئەو پرسیارە کە کابرای سیمنیی کردوویەتی، پرسیارێکی بێجێیەو مەحاڵە، چونکە دروستکراو نابێتە دروستکارو، هەرگیز شتێکی پەیدا کراو، وەك شتێکی بێ سەرەتا نابێ، بۆیە پرسیارەکە لە خودی خۆیدا شتێکی نامەنتیقییەو ناگونجێ، وەك ئەوەیە بڵێی: ئایا خوا دەتوانێ نەزان بێ؟ بۆیە ئەم پرسیارە بۆخۆی نامەنتیقییەو ناگونجێ.

ئنجا هارِوونە ڕەشید ئەو گەنجە دەنێرێ بۆ (سند)و لەوێ دووبارە موناقەشەکە دروست دەبێتەوەو لەوێ ئەو مولحیدە بۆڕ دەدا، پادشای (سند)یش نامەیەکی دیکە دەنێرێ و دەڵێ: دیارە ئێوەش خەڵکێکی واتان هەیە، هەقانیەتیی دینی خۆتان بچەسپێنێ}[1].

## خاڵی پێنجەم:

## تەبەنیی کرانی بیرۆکەی موعتەزیلە لەلایەن دەوڵەتەوە:

لە ڕۆژگاری مەئموونـدا، کە لە ساڵانی (١٩٨-٢١٨ك)دا حوکمڕانیی کردوە، لەو کاتەوە فیکری موعتەزیلە تەبەنیی دەکرێ و، وەك فیکرەیەك ڕەسمییەتی پێ دەدرێ لەلایەن دەوڵەتەوە.

هەروەها (معتصم)یش (٢١٨-٢٢٨)ك، هەر لەسەر تەبەنیی کردنی فیکری موعتەزیلە دەڕوا.

دوایی (الواثق)یش کە لە ساڵانی (٢٢٨- ٢٣٣ك)دا حوکمڕانیی کردوە، هەر لەسەر ئەوە بەردەوام دەبن، بەڵام دوایی لەسەردەمی (المتوگّل)دا (٢٣٣-٢٤٧) ئەو حاڵەتە کۆتایی پێ دێ.

---

(١) تيارات الفكر الإسلامي، د. محمد عمارة، ٤٥-٧١.

**خاڵی شەشەم:**

**موعتەزیلە بەرەنگار بووەوانی سەر سەختی ستەمی حوکمڕانان:**

هەموو ئەوانەی هەڵگری بیرۆکەی موعتەزیلە بوون، دژی حوکمڕانانی سەردەمی خۆیان، کە بەزاڵمیان زانیون، خەباتیان کردوەو، موعتەزیلە زۆر بەرگرییان کردوە لەحوکمی شووڕایی، پێش ئەوەی فیکرەکەیان بەڕەسمیی تەبەننیی بکرێ، بۆ وێنە:

١- (عبدالرحمن بن أشعث)، (٨٥- ٧٠٤)ز، کە لەدژی حەججاج و عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان شۆڕشی کرد، زانایەکی زۆر گەورە بووە، بەڵام شۆڕشەکەی تێك شکا، هەڵگری فیکری موعتەزیلە بووە.

٢- (حارث بن سریج)، کە دژی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك شۆڕشی کردوە، (١١٦ك/٧٣٤ز)، لە موعتەزیلە بوو.

٣- (زین العابدین علي بن الحسین بن علي) (٧٩-١٢٢ك/ ٦٨٨-٧٤٠ز)، لە کووفە دژی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك شۆڕشی کرد، لە موعتەزیلە بووە.

٤- (یزید بن الولید) (٨٦- ١٢٦ك/ ٧٠٥-٧٤٤ز)، لە موعتەزیلە بوو.

٥- (محمد بن عبدالله بن الحسن) کە بە (النفس الزکیة) ناسراوە، (٩٣-١٤٥/ ٧١٢- ٧٦٢م) دژی ئەبو جەعفەری مەنصووڕ لە مەدینە، ڕاپەڕی، لە موعتەزیلە بوو.

٦- (إبراهیم بن عبدالله بن الحسن) (٩٧-١٤٥ه/ ٧١٦-٧٦٣م) لە بەصرە دژی ئەبوجەعفەری مەنصووڕ، ڕاپەڕی، دیسان لە موعتەزیلە بوو.

## خاڵی حەوتەم:

### کودەتا کران بەسەر موعتەزیلەداو، نەمانیان لە دەوڵەتدا:

بە مردنی (الواثق بالله) (٢٣٣ك/٨٤٧ز)و، هاتنە سەرکاری (المتوکل) (٢٣٣-٢٤٧ك/ ٨٤٧-٨٦١ز) کودەتا بەسەر فیکری موعتەزیلەدا کراو، لەسەر کار لابرا، موعتەزیلە کە پێشتر فیکرەکەیان بەزۆر فەرز دەکرا بەسەر خەڵکیدا، ئنجا دژایەتیی کران و زۆر تووشی بەڵا هاتن، کە بەبۆچوونی من هەردووکیان هەڵە بوون.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە (د. محمد عمارة) زۆر پەرۆشیی دەردەبڕێ بۆ موعتەزیلە، کە فیکرەکەیان بەو شێوەیە لێکرا، بەڵام پێشێ کە فیکرەکەیان فەرز کراوە، ڕەخنە ناگرێ، کەچی دوایی کە کودەتایان بەسەردا دەکرێ، زۆر هاوسۆزییان بۆ دەردەبڕێ! کە ئەوەش جۆرێکە لە نادادگەریی و نامەنتیقیی، چونکە نە دەبوو فیکرەکەیان فەرز بکرێ و، نە دەبوو کودەتاشیان بەسەردا بکرێ، یەکێ لە هەڵە گەورەکانی دەوڵەتی عەبباسیی، ئەوەبوو ئەو بیرۆکەیەی بەسەر خەڵکیدا فەرز کرد.




## پوختەی هەڵسەنگاندنی موعتەزیلە

کورتەی قسان: موعتەزیلە نەفریشتە بوون، هەرچی بیڵێن، ڕاست بێ، نە شەیتانیش بوون، هیچیان بەکەڵك نەیەت، ئنجا موعتەزیلە لە بازنەی ئەهلی سوننەتدا بوون، بەپێی مەفهوومە زاراوەییەکە (جەماوەری مسوڵمانان) بەڵام بێگومان هەڵەی موعتەزیلە لەوەدا بووە، کە زێدە ڕۆییان کردوە لە پشت بەستن بە عەقڵدا، لەسەر حیسابی نەقڵ، لەوەدا زۆریان تێپەڕاندوە، ئەگەرنا کە زۆر ڕەخنە لە موعتەزیلە دەگرین، وە نەبێ ئەهلی حەدیسیش ئەوانەی کە نکوولّییان کردوە لە پێگەی عەقڵ، ئەوانیش پێکابێتیان، موعتەزیلە لە پشت بەستن بە عەقڵدا تێیان پەڕاندوە، نەیارەکانیشیان لەو بارەوە: کورتیان هێناوە، بەڵام حاڵەتی سروشتیی و ڕاست، ئەوەیە عەقڵ لە شوێنی خۆیدا بەکار بێ و، نەقڵیش لە شوێنی خۆیدا بەکار بێ و، بەگژ یەکدا نەکرێن، عەقڵ دەبێ لە خزمەتی نەقڵدا بێ، چونکە عەقڵ دەگونجێ بەهەڵەدا بچێ و، سنوورداریشە، بەڵام زانیاریی خوا (وەحیی) سنووری نیەو خوا هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام لەولاشەوە:

بێگومان بەبێ دەست کراوەیی و ئازادیی عەقڵ و بایەخ پێدانی، مرۆڤ لە وەحیی خوا بەهرەمەند نابێ. دیارە لەتەوەری پێنجەمی ئەم مەوسووعەیەشدا لە بەشێکی تایبەت بابەتی عەقڵ و نەقڵ دەتوێژینەوە.




# شیعــە

١- پێناسە.

٢- جۆرەکانی شیعە.

٣- وردە گرووپەکانی شیعە.




## پێنـاسـە

١- (الجرجاني) دەڵێ: {الشيعة: هم الذين شايعوا علياً رضي الله عنه، وقالوا إنه الإمام بعد رسول الله، واعتقدوا أن الإمامة لا تخرج عنه وعن أولاده}[1].

واتە: شیعە: ئەوانەن کە پەیڕەویی عەلییان خوا لێی ڕازی بێ، کردو، گوتیان: عەلی لەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، پێشەوای مسوڵمانانەو، قەناعەتیان وابوو کە نابێ پێشەوایەتیی لە خۆی و لە وەچەکەی بچێتە دەرێ.

دیارە ئێمە لێرەدا موناقەشەی ئەوە ناکەین چەندیان پێکاوەو چەندیان نەپێکاوە، کە بەتەئکید ئەوانەی لە سەردەمی خۆیدا، پشتگیریی عەلییان کردوە، شتێکی باشیان کردوەو ئەوانە ڕاست بوون، ئەوانەش کە دژایەتییان کردوەو نەیاری بوون، بەهەڵە داچوون و یاخیی بوون، بەڵام ئایا شتی وا هەیە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویێتی: عەلی لەدوای من حوکمڕانەو، ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان حوکمڕانییان لەو زەوت کردبێ؟ نەخێر، ئەوە هیچ بنەمایەکی

---

(١) التعريفات، ص ١٣١.

نیە، ئەدی ئایا ڕاستە کە دەبێ لەدوای خۆی وەچەی ئەو بۆ حوکمڕانیی مسوڵمانان هەڵبژێردرێن؟ نەخێر، ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، قسەیەکە شیعە دەیکەن و هیچ بنەمایەکی نیە، کە دوایی زیاتر قسەی لێ دەکەین.

٢- (د. محمد عمارة)[١] دەڵێ: { **یەکەم:** لەڕووی زمانەوانییەوە: (شیعة) بریتین لە کۆمەڵە خەڵکێك کە لەسەر کارێك کۆ دەبنەوە، هەروەها شیعە بە شوێنکەوتووانی پیاوێك یان بە هاوکارانی دادەنرێن، ئەویش لە وشەی (المشايعة)ەوە هاتوە، (المشايعة)ش واتە: (المطاوعة والمتابعة)، واتە: لەگەڵدا ڕۆیشتن و پەیڕەویی لێکردن، وشەی (الشيعة) بە (الشِّيَع) کۆ دەبێتەوەو، (شيَع)یش بە (أشياع) کۆ دەبێتەوە، یانی: کۆی کۆ (جمع الجمع)ە.

**دووەم:** لە ڕووی زاراوەییەوە: وشەی (شيعة) بەکار دەهێنرێ بۆ ئەو کۆمەڵانەی کە پشتگیرییان لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کردوە خوا لێی ڕازی بێ و، پەیڕەوییان لەخۆی و لە خزمەکانی کردوە، تەنانەت وای لێ هاتوە دوایی وەك زاراوەیەك کە دەڵێی: شیعە یانی: ئەوانەی کە پشتگیریی عەلییان کردوە، {لەسەرەتاوە شیعە وەك ئەوەی ئێستا هەیە، شیعەی ئیمامیی و، شیعەی زەیدیی و، نوصەیریی و، ...هتد، وا نەبووە، بەڵکو لە سەرەتاوە شیعە بریتی بوون لە کاسانێك کە پشتگریی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان دەکرد، کە زۆربەی هاوەڵان وابوون، پشتگیریی عەلییان دەکرد، کەمێکیش لەلای موعاویە بوون و، ژمارەیەکیش دانیشتوون، هەندێ دەڵێن: زۆربەیان دانیشتوون واتە: بێ لایەن بوون، بەڵام من پێم وانیە زۆربەیان دانیشتبن، بەڵکو بەشێکی زۆریان یان زۆربەیان لەگەڵ عەلی خوا لێی ڕازی بێ بوون}[٢] دیارە سەرەتاو دەستپێکی شیعەگەریی لەوانەوە سەری هەڵدا کە پشتگیریی عەلییان دەکردو، پێیان خۆش بوو ئەو حوکمڕان بێ، بۆ وێنە: میقدادی کوڕی ئەسوەدو سەلمانی فارسیی و

---

(١) ئەوەی (دکتور محمد عمارة) گوتوویەتی، یەکسەر وەریدەگێڕمە سەر کوردیی و دەقە عەرەبییەکەی چونکە زۆر درێژە، نایهێنم.

(٢) هی نێوان کەوانەکان {} زیادەی خۆمە.

ئەبو ذەری غیفاریی، هەر لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەمانەو هەندێ کەسی دیکە لە بەنی هاشم، بۆچوونیان وابوو کە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، ببێتە حوکمڕانی مسوڵمانان.

{منیش دەڵێم: کە عەلی ماوەی شەش مانگان بەیعەتی بە ئەبو بەکر نەدا، خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوە شتێکی تێدایە، کە هەندێك دەڵێن: عوزری بەوە هێناوەتەوە کە خەریکی قورئان بووە، کۆی کردۆتەوەو، هەندێك دەڵێن: گوتوویەتی: لەوە نیگەران بووم کە حیسابم بۆ نەکراوە! بەڵام بەندە (نهج البلاغة)م هەموو خوێندۆتەوەو زۆر لەو شتانە ورد بوومەتەوە، پێم وایە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، جۆرێك لە هەقی بەخۆی داوەو، پێشم وایە نەیپێکاوە، ئەو پێی وا بووە کە مادام خزمی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)و زاوایەتی، دەبووایە، ئەو بکەنە حوکمڕان لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئنجا کە نەیانکردۆتێ، نیگەرانییەکی بۆ دروست بووە، ئەو ئەنجامگیرییەم بە زەقیی بە قسەو هەڵوێستەکەیەوە دیارە، کە گوتوویەتی: مسوڵمانان بێ ئەوەی حیساب بۆمن بکەن، ئەو کارەیان کرد[1]، ئنجا پێم وایە ئەویش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو عورفەی ئەو کات، عورفی ئەو کاتە وابووە: سەرۆك عەشیرەت مردوە، کوڕەکەی لەجێی بووە بە حوکمڕان، ئەو کات لە هەر شوێنێکی دنیا: فارس، ڕۆم، چین، هیند، پادشا مردوە، کوڕی هاتۆتە جێی، ئنجا من وای تێدەگەم کە ئەویش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو عورفە، بەڵام نەیپێکاوە، هەر بۆیەش مسوڵمانان ڕوویان تێی نەبوو، چونکە زانیویانە کە لە هەڵوێستەکەیدا، نەیپێکاوە، لەوەدا کە بەیعەت بە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، نادات، ئاخر ئەو کاتەی کە ئەبو بەکر دەبێتە جێنشینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەمەنی لە شەست (٦٠) ساڵ زیاتر بووە، بەڵام عەلی ئەو کاتە تەمەنی دەوری سی (٣٠) ساڵ بووە، نیوەی تەمەنی ئەبو بەکر، هەڵبەتە تەمەنیش حیسابی هەیە، ئنجا پێگەیشتوێتیی و شارەزایی و دامەزراویی و لێزانیی و بار قووڵیی ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، کە لە ژیانەکەیدا دیارە، کە نەك هەر عەلی و عوسمان

---

(١) بڕوانە: نهج البلاغة، الخطبة: ٢١٧،ص ٣٨٩، {في التَظَلُّم والتشكيِّ من قريش} تحقيق: مؤسسة النشر الإسلامي، الطبعة الاولى: ١٤٣٤هـ - ٢٠١٣م.

شایستەیی و لێهاتوویی وەك ئەویان نەبووە، بەڵکو عەمەریش نەیبووە، چونکە: سێ چوار هەڵوێست دێنە پێشێ، ئەگەر ئەبو بەکر نەبووایە، بارو دۆخەکە زۆر خراپ دەبوو، وەك:

١- جەنگی هەڵگەڕاوەکان.

٢- بەڕێ کردنی سوپایەکەی ئوسامە.

٣- دۆخی وەفات کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

یانی: بەبۆچوونی من ئەبوو بەکر ئەوە نەبووە، کە عەلی وەك وی تەماشای خۆی بکات و لەوەدا نەیپێکاوە، هەر بۆیەش مسوڵمانان ڕوویان لەگەڵیدا گۆڕاوە، تاکو دوایی کە تەماشای کردوە کەس پاڵپشتیی ناکات، ئنجا ئەویش بەیعەتی داوە بە ئەبو بەکر خوا لێیان ڕازی بێ، تەماشای کردوە وەزعەکەی بۆ ناچێتە سەر، ئیدی بەیعەتی داوە.

لەدوای ئەبو بەکریش مسوڵمانان عومەریان پێ گونجاوتر بووە، دوای ویش دیسان عوسمانیان پێ گونجاوتر بووە، ئیدی تازە واقیعی مێژوویی وابووەو بە ئێمە ناگۆڕێ، وەك ڕۆژێك هەندێ بەرپرسی شیعەی عێراق هاتبوونە لام، گوتم: ئنجا چیبکەین! تازە مێژووەکە وا گوزەراوە، هەقی عەلی چۆن بکەینەوە، ئەگەر گریمان هەقیشی بووبێ؟ ئێستا بەدەست من بووایە بۆ ئەوەی شیعەو سوننەو ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە پەیدا نەبێ، لەدوای عومەر دەمگوت: با عەلی خەلیفە بێ[1]، بەڵام تازە تێپەڕیوە! گوتیان: بێگومان وایە.

وەك کوردەواریی دەڵێن: (شەڕی دەوەن بە ئاشەو، بەدوای چوواندا چوونە)، تازە تێپەڕیوە.

ئنجا کەسیش بۆی نیە لێرەوە تانە لە مسوڵمانانی ئەو کاتە بدات: چونکە ئەوان تەماشایان کردوە لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەبو

---

(١) چونکە ئەو ڕایەش کاتی خۆی هەبووە کە هەندێ لە زانایانی پێشین، دوای ئەبو بەکرو عومەر، عەلییان پێش عوسمان خستوە لە پلەدا، خوا لە هەموویان ڕازی بێ.

بەکریان پێ لە هەموو کەس گونجاوتر بووە، بەڵێ عەلییش ئازایەتیی و زیرەکیی و زانایی هەبووە، بەڵام لە بواری حوکم و سیاسەتدا، وەك ئەبو بەکرو عومەری پێ نەکراوە، خوا لێیان ڕازی بێ}[1].

لەسەرەتاوە شیعە بەم واتایە دەهات، بەڵام ئێستا: هەر کەسێ عەلی پێش سێ خەلیفەکەی دیکە بخات، ئەوە شیعەیە، ئەمە بۆتە پێوەرێك، بەڵام ئەوەی پێشی نەخات، بە شیعە لەقەڵەم نادرێ.

ئنجا شیعە دەڵێن: پێشەوایەتیی (إمامة)ی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب و پێشەوایەکان لە کوڕەکانی، دەقی لەسەرە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەسیەتی کردوە بۆ عەلی و دەڵێن: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دیارییشی کردوە، هەروەها دەڵێن: وەك چۆن خوای مەزن، پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) داناوە، بەهەمان شێوە، لەدوای ویش عەلی داناوە بە جێنشین و، ئەو ئایەتەش لەگەڵ ئەوەیەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة[2].

ئنجا جیاوازیی نێوان شیعەو باقی مسوڵمانان ئەوەیە، کە مسوڵمانان بە گشتی: دەڵێن: نەخێر، هەڵبژاردنی حوکمڕان، دەبێ بە ڕاوێژی نێوان مسوڵمانان بێ، بە بەیعەت پێدان بێ لەلایەن ئۆممەتەوە، یان لەلایەنی نوێنەرانی ئۆممەتەوە، ئەوە جیاوازییە سەرەکییەکەیە، بەڵام شیعە قیاسی ئیمامەتیان کردوە لەسەر پێغەمبەرایەتیی و گوتوویانە: ئەوەش هەڵبژاردنێکی خوایییە، نەك هەڵبژاردنێکی بەشەریی!

ئنجا ئەوان ئیمامەکانیان بە پارێزراو لە گوناهو هەڵە (معصوم) دەزانن، بەڵکو هەندێکیان ئیمامەکان لە پلەی پێغەمبەرانیش بەرزتر دەکەنەوە، دەڵێن: لەبەر ئەوەی پێغەمبەرایەتیی لوتفێکی تایبەتەو تەواو بووە، بەڵام ئیمامەت لوتفێکی گشتییەو بەردەوامە، خومەینی لە کتێبی (الحكومة الإسلامية)دا دەڵێ: (إنَّ

---

(١) لێرەوە دەچینەوە سەر قسەکانی (د. محمد عمارة).

(٢) پێم خۆشە بەرگی چواری تەفسیرەکەم (تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز) بخوێننەوە، کە زۆر باش ڕەددی ئەوەم داوەتەوە، گوتوومە: ئەو ئایەتە هیچ پەیوەندیی بەو مەسەلەیەوە نیە.

من ضرورات مذهبنا أَنَّ أَئِمَّتنا مقاماً لا يبلغه ملك مقرب ولا نبي مرسل) واتە: لە پایەکانی مەزهەبی ئێمە ئەوەیە کە ئیمامەکانی ئێمە پلەیەکیان هەیە، هیچ فریشتەیەکی زۆر لەخوا نزیك و، هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراو، نایگاتێ![1]

{لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەری مسوڵمانان، شیعە بە کافر دانانێن، لەبەر ئەوەی ئەوە تەنها قسەیەکی بێ جێیەو، ناگاتە ئەوەی ئینسانی پێ کافر بێ، وەك (إبن تيمية) و زۆر زانای دیکەش وایان گوتوە}[2].

ئنجا بە سەرنجدانی سەرچاوەکانی فیکری شیعە، بۆمان دەردەکەوێ کە عەقیدەی هەبوونی دەق (نص) لەسەر ئەوە کە عەلی دەبێ ئیمام بێ و، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتی بۆ کردبێ، بوونی نەبووە، هەتا سەردەمی ئیمامی شەشەمیان (جعفر الصادق)، لەو کاتەوە ئەو بیرۆکەیە پەیدا بووە، بەڵام لەسەر دەستی ئەو نا، بەڵکو لەسەر دەستی هیشامی کوڕی حەکەم، کە لە ساڵی (١٩١ك)دا وەفاتی کردوە، کتێبێکی نووسی بەناوی: (کتاب الوصية والرد علي من أنكرها)، ئەگەرنا (إبن النديم) لە کتێبی: (الفهرست)دا، کە لە ساڵی (٤٣٨)ك نووسیویەتی، دەڵێ: پێشتر وەصیەت و دەق لەو بارەوە نەبووە، لە هیچ کام لە کتێبەکانی شیعەدا، هەتا (هشام بن الحكم) لەساڵی (١٩٠ك)دا ئەو کتێبە دەنووسێ، ئنجا ئەو بیرۆکەیە پەیدا دەبێ لەنێو شیعەدا، ئەگەرنا پێشتر هەر دەیانگوت: عەلی لەسەر هەق بووەو، عەلی شایستەتر بووە، بەڵام نەیاندەگوت: ئەمە وەسیەتی پێغەمبەرەو (صلی الله علیه وسلم) دەقی لەسەرە، ئەوە پێشتر نەبوو، هەتا ئەو کابرایە ئەو کتێبەی نووسی[3].

{ئنجا لە کتێبی (نهج البلاغة)شدا کە من زۆر بە وردیی بە شەرحیشەوە خوێندوومەتەوە، لەیەك شوێنیشدا عەلی خوا لێی ڕازی بێ، هەر بە ئاماژەش ئاماژە بەوە ناکات، کە بڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتی بۆ کردووم، یان بڵێ: فڵان دەقە ئەوە دەگەیەنێ}.

---

(١) بڕوانە: ص٥٢، ط القاهرة / ١٩٧٩م.

(٢) نێوان دوو کەوانەکان {} قسەی خۆمە.

(٣) إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات، ص ٥٢٣- ٥٢٥.




# جۆرەکانی شیعە

لێرەدا باسی جۆرە سەرەکییەکانی شیعە دەکەین، بەڵام ئەو پێڕو گرووپانەی کە لە شیعە گەریی پەیدا بوون، لێرە تەنیا ئاماژەیەکیان پێ دەکەین و، دواتر وردتر باسیان دەکەین، لەژێر ناوو نیشانی باطینییەکان (الباطنية)دا.

## چوار جۆرە سەرەکییەکانی شیعە:

**١- الزيـديـــة:** {الزيدية: التي تقول بإمامة زيد بن علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب، وهذه الفرقة أقرب الفرق الشيعية إلى السنة، فتحد عمل الله في الإمام بنوع من التأييد والتوجيه، وترفض القبول بوجود جزء من النور الإلهي في الإمام، كما أنها لا تقول بالرجعة أو الإمام المختفي، وأن الزيدية كانت ترى أن علياً أفضل الصحابة، وأحقهم بالخلافة، وإن لم يوجد نص صريح ... ورأيهم في الأصول كرأي المعتزلة تقريباً، لتَتَلمُذِ رئيسهم على (واصل بن عطاء) رأس المعتزلة}[1].

---

(١) الموسوعة الميسرة، ص ٣٢٣.

واتە: زەیدیەکان ئەوانەن کە پێیان وابوو زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، دەبێ ئەو پێشەوای مسوڵمانان بێ {ئەو مسوڵمانانەی ئەو کاتە کە لە دەوری (أهل البيت) کۆ بوونەوە، پێیان دەگوتن: شیعە، کە جیا بوون لەوەی ئێستا}[1] ئەوانەش نزیکترین کۆمەڵی شیعەکانن لە سوننەوە {یانی: لەزۆرینەی مسوڵمانان کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرو (صلى الله عليه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەکان ڕۆیشتوون} ئنجا ئەوانە کاری خۆیان لە پێشەوادا هەر لەوەدا کورت هەڵدێنن دەڵێن: خوا پشتگیریی ئەو پێشەوایە دەکات و ئاراستەی دەکات، بەڵام بەشێك لە نووری خوا نەچۆتە نێو ئیمامەوە {وەك شیعەی ئیمامیی دەڵێن} هەروەها بڕواشیان بە (رَجْعَة) نیە {واتە: یەکێ لە ئیمامەکان کە مرد، دوایی لە دنیادا زیندوو بێتەوە} بڕواشیان بە ئیمامی خۆ پەنهانکەریش نیە {کە مەهدی چاوەڕێکراوە} هەروەها زەیدییەکان پێیان وابوو کە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، باشترینی هاوەڵانەو لە هەمووشیان شایستە ترە بە جێنشینایەتیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەرچەندە نەیاندەگوت: دەقێکی لەسەرەو، ڕاو بۆچوونیان وەك هی موعتەزیلەکان وایە لە بنچینەکانی دیندا، چونکە پێشەوایەکەیان {کە زەیدە} قوتابی واصیلی کوڕی عەتا بووە، واصیلیش بە دامەزرێنەرو سەری موعتەزیلە دادەنرێ[2].

**٢- الإمـــامـيـة:** {فئة تعتقد بأن الإمامة ركن من أركان الدين، وأن الإعتقاد بالإمام جزء من الإيمان، وتعيين الإمام لا يعود إلى رأي الأمة واختيارها، بل هو تعيين صريح من النبـي لعلي، وتعيين من علي لمن بعدَهُ، وهذه هي فكرة الوِصاية...}[3].

---

(١) نێوان کەوانەکان {} زیادەی خۆمە.

(٢) لە ساڵی (١٩٩٦ز)دا چووم بۆ یەمەن، شیعەی زەیدیی لە مزگەوتەکانی خۆیاندا کە نوێژ دەکەن، هەروەك ئێمە کە باسی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان خوا لێیان ڕازی بێ، دەکەن، وەك چۆن باسی عەلی خوا لێی ڕازی بێ دەکەن، بەهەمان شێوە دەڵێن: (رضي الله عنه)، ڕێز لە جێنشینەکان دەگرن، بەڵێ، دەڵێن: عەلی شایستە تر بووە، بەڵام ئەوانیش (سێ خەلیفەکان) بە ستەمکارو داگیرکار دانانێن، دەڵێن: خەڵکەکە نەیانپێکاوە، بەڵام تانەش لە هاوەڵان نادەن، ئنجا هەندێ لە زانایانی گەورە، شیعەی زەیدیی بوون، وەك شەوکانیی و صەنعانیی و، هەندێکی دیکەش، ئنجا شیعەی زەیدیی ڕیوایەتی هاوەڵان وەردەگرن، وەك شیعەی دوازدە ئیمامیی نین.

(٣) الموسوعة الميسرة، ص ٣٢٣.

واتە: شیعەی دوازدە ئیمامیی کۆمەڵێکن کە پێیان وایە حوکمڕانیی و پێشەوایەتیی، پایەیەکە لە پایەکانی دین و، بڕوا بوون بە ئیمام، ئیمامی مسوڵمانان دوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، بەشێکە لە ئیمان و، دیاریی کردنی پیشەوا، ناگەڕێتەوە بۆ لای ئۆممەت، بەڵکو زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی لە لایەن پێغەمبەری خواوەیە (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش لەخواوە دیاریی کردوە، کە عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، خوا لێی ڕازی بێ، عەلییش هی دوای خۆی دیاریی کردوە، کە حەسەنە {ئەویش هی دوای خۆی بەم شێوەیە، تاکو دوازدە ئیمامەکە}، ئا ئەوەش بیرۆکەی ویصایەی پێ دەگوترێ {واتە: وەسیەت کردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێ، بۆ مسوڵمانان کە لەدوای خۆی بیکەن بە خەلیفە}.

کە لەڕاستییدا ئەوە هیچ بنەمایەکی نیەو، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، وەك پێشتریش باسم کرد، ئنجا بۆ زانیارییتان! شیعەی دوازدە ئیمامیی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا هاتوە، زۆرینەی شیعەی هاوچەرخی ئێستا پێك دەهێنن: لە عێراق هەن، لە لوبنان، لە ئێران، لە هندستان، لە پاکستان و لەزۆر شوێنی دیکەی دنیا هەن.

دەتوانین بڵێین: شیعە بەگشتی - بەهەموو جۆرەکانیانەوە - دەیەك (١/١٠)ی مسوڵمانان پێك دەهێنن و، هەر لە دە (١٠) مسوڵمانان، یەکێکیان شیعەیە.

ئنجا شیعەی دوازدە ئیمامیی دەڵێن: ئەو وەسیەت کردنە بەردەوام بووە لە کوڕەکانی عەلییدا کە لە فاتیمەی زەهران خوا لێیان ڕازی بێ، ئەگەرنا عەلی خوا لێی ڕازی بێ، کۆمەڵێکی زۆر هاوسەری بوون، لەدوای فاتیمە، بەڵام شیعە دەڵێن: ئەو وەسیەتە، تەنها بۆ ئەو کوڕانە بووە کە لە فاتیمە بوون، هەتا دەگاتە ئیمامی دوازدەیەمیان، لەبەر ئەوەش ناویان لێنراوە: (الإثنا عشرية)، چونکە بڕوایان بەوە بووە کە لەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)،

دوازدە کەس دیاریی کراون، تاکو دەگاتە سەر ئیمامی دوازدەیەمیان، دوازدە ئیمامەکەش ئەوانەن:

١- أبو الحسن علي بن أبي طالب (المرتضى) ٢٣ق.هـ - ٤٠هـ.
٢- أبو محمد الحسن بن علي (الزكيى) ٣ - ٥٠هـ.
٣- أبو عبدالله الحسين بن علي (سيد الشهداء) ٤ - ٦١هـ.
٤- أبو محمد علي بن الحسين (زين العابدين) ٣٨ - ٩٤هـ.
٥- أبو جعفر محمد بن علي (الباقر) ٥٧ - ١١٤هـ.
٦- أبو عبدالله جعفر بن محمد (الصادق) ٨٠ - ١٤٨هـ.
٧- أبو إبراهيم موسى بن جعفر (الكاظم) ١٢٨ - ١٨٣هـ.
٨- أبو الحسن علي بن موسى (الرضى) ١٥٣ - ٢٠٣هـ.
٩- أبو جعفر محمد بن علي (الجواد) ١٩٥ - ٢٢٠هـ.
١٠- أبو الحسن علي بن محمد (الهادي) ٢١٤ - ٢٥٤هـ.
١١- أبو محمد الحسن بن علي (العسكري) ٢٣٢ - ٢٦٠هـ.
١٢- أبو القاسم محمد بن الحسن (المهدي) ٢٥٦ - ...هـ}[١].

٣- **الكيسانية**[٢]: {الكيسائية: لم يحصروا الإمامة في أبناء فاطمة الزهراء، وإنما قالوا: إنها انتقلت من الإمام علي إلى ابنه محمد بن الحنفية ٢١- ٨١هـ، ويعتقدون بأنه لم يمت، وهم من الغلاة، وانقرضوا منذ زمن بعيد}[٣].

واتە: شیعەی کەیسانییە پێشەوایەتییان کورت هەڵنەهێناوە لە کوڕەکانی عەلییدا کە لە فاتیمەی زەهڕا لەدایك بوون، بەڵکو گوتوویانە: لەدوای عەلی خوا لێی ڕازی بێ، پێشەوایەتیی گواستراوەتەوە بۆ موحەممەدی حەنەفییە،

---

(١) إزالة الشبهات ..ص٥٢٥- ٥٢٦.
(٢) ئەوانە ئێستا نەماون.
(٣) إزالة الشبهات، ص ٥٢٦.

ئنجا دەڵێن: موحەممەدی حەنەفییەش نەمردوە بەڵکو دێتەوە، ئەوانەش لە تێپەڕێنانن و ماوەیەکی زۆرە نەماون.

٤- **الإسماعيلية**[١]: {وهم من الباطنية الغلاة، حتى في نظر الإثني العشرية، ويوجد منهم في عصرنا: (البهرة، والنصيريون، والدروز)، فقد اتفقوا مع الإثني عشرية على تسلسل الإمامة من علي حتى جعفر الصادق، ثم جعلوها بعد الصادق، لابنه إسماعيل: ١٤٣هـ، وليس لابنه موسى الكاظم، كما قالت الإثنا عشرية، ثم انفرد الإسماعيلية منذ إسماعيل بسلسلة خاصة بهم من الإمامة}[٢].

واتە: ئیسماعیلییەکان لە جۆری شیعەی باطینیی، زۆر ڕۆچوون {هەتا لە بازنەی ئیسلام دەرچوون} تەنانەت شیعەی دوازدە ئیمامییش دەڵێن: ئەوانە لە (غلاة)ن، {(غلاە)یش یانی: ئەوانە لە بازنەی ئیسلامەتییدا نەماون}، لەم سەردەمەی ئێمەشدا ئەو ئیسماعیلییانەی کە هەن ئەو کۆمەڵانەن:

١- (بەهەرە) {لە هیند و پاکستان}.
٢- (نوصەیریی) {لە سووریا، دوایی زیاتر باسیان دەکەم، کە پێیان دەگوترێ: عەلەویی و ئەوە ناوێکی چەواشەکارییە، بەڵکو ناویان نوصەیرییە}.
٣- شیعەی (دروز) {لە لوبنان و سووریا هەن}.

ئەوانە لەگەڵ شیعەی دوازدە ئیمامییدا یەك دەنگن، لەسەر زنجیرەی ئیمامەکان، گوتوویانە: لە عەلییەوە تاوەکو جەعفەری صادیق درێژ دەبێتەوە، دوایی لەدوای جەعفەری صادیق، شیعەی دوازدە ئیمامیی دەڵێن: مووسای کاظم پێشەوایە، بەڵام ئیسماعیلییەکان دەڵێن: نەخێر، ئیسماعیلی کوڕی پێشەوایە، {ئیسماعیلی کوڕیشی پێنج شەش ساڵ پێش جەعفەری صادیق مردوە، بەڵام دەڵێن: ئەو ئیمامە، ئەوەش جۆرێکە لە ئەفسانە، دەنا باب جارێ مابێ، کوڕ پێنج شەش ساڵ پێش بابی مردبێ، چۆن دەبێتە ئیمام؟!} دوای ئیسماعیلیش زنجیرەی پێشەوایەکان لە کوڕەکانی ئیسماعیل دادەنێن.

---

(١) ئەوانە ئێستا هەن.

(٢) إزالة الشبهات، ص ٥٢٦.




## وردە گرووپەكانی شیعە

ئەوەی باسمان كرد، چوار جۆرە سەرەكییەكەی شیعە بوون، ئنجا براو خوشكانی بەڕێز! جەنگەڵستانی شیعە جەنگەڵستانێكە ئینسان بەزەحمەت سەری لێ دەردەكا، دوایی لەكاتی خۆیدا بۆتان باس دەكەم، بۆ وێنە:

أ- فاتیمییەكان هەر لە شیعە بوون، كە دووسەدو حەفتا (٢٧٠) ساڵ دەوڵەتیان هەبووەو حوكمیان كردوە، حوكمی میصرو مەغریب و شامیان كردوەو، هەندێك جاران حوكمی بەشێك لە حیجازیشیان كردوە.

ب- هەروەها (القرامطة)، ئەوانیش هەر لە لقەكانی شیعە بوون و، هی دیكەش زۆرن، دوایی باسیان دەكەم.

دیارە هەندێكیان مشت و مڕ هەیە لەسەر ئەوەی: ئایا مسوڵمانن، یان مسوڵمان نین! بەڵام هەندێكیان هەبوون كە شیعەی دوازدە ئیمامیی خۆشیان دەڵێن: ئەوانە (غلاة)ن، كە ژمارەیان نزیكەی هەژدە تاقم بوون، بەڵام ئێستا كەمتر وایە مابن، ئەگەر تەنها فیكریان مابێ كە ئەمانەی خوارەوەن:

{١- السبئية. ٢- الكاملية. ٣- البَنانية. ٤- المُغَيرية. ٥- الخباصية. ٦- المنصورية. ٧- الغُرابية. ٨- الذمية. ٩- الهشامية. ١٠- الزرارية. ١١- اليونسية. ١٢- الشيكانية. ١٣- الزرامية. ١٤- المغوصية. ١٥- البدائية. ١٦- النُّصيرية. ١٧- الإسماعيلية. ١٨- الخطابية}[١].

ئەو هەژدە تاقمە، شیعەی ئیمامیی بە مسوڵمانیان نازانن، چونکە ئەوانە بەزۆریی (باطني) بوون، یان (تألیه)ی عەلییان کردوە، واتە: بە پەرستراویان داناوە، یان گوتوویانە: خوای پەروەردگار هاتۆتە نێو بەدەنی عەلییەوە، ئنجا گوتوویانە: هەورە تریشقە دەنگی عەلییەو، برووسکەش زەردەخەنەکەیەتی، ئێستاش شیعەی نوصەیریی وا بیر دەکەنەوە، بۆیە ئەوان هەر کەسێ سەرکردە بێ، بە پەرستراوی دەزانن، هەر بۆیە کاتێ جەللادەکانی ڕژێمی سووریا خەڵکیان دەکوشت، دەیانگوت: بڵێ: {لا إله إلاّ بَشّار} بڵێ تەنیا بەششار پەرستراوە! هەروەها فاتیمییەکانیش لانی کەم جاروبار حاکمەکانیان بە پەرستراو دادەنا.



---

(١) الموسوعة الميسرة، ص ٣٢٤.



# بەشی هەشتەم

## ڕافیزە ( الرافضة )

١- پێناسە.

٢- هەڵوێستی مسوڵمانانەو جوامێرانەی زەید لە بەرانبەر ڕافیزەدا.




## پێناسە

١- (د. محمد عمارة) گوتوویەتی:

{الرافضة في عرف أهل السنة والجماعة -بمذاهبهم ومدارسهم المختلفة- هم الشيعة، وسُمُّوا بذلك لرفضهم شرعية خلافة أبي بكر الصديق وعمر بن الخطاب وعثمان بن العفان، ومن ثَمَّ رفضوا شرعية التأريخ الإسلامي.

بداية ظهور هذا الإسم:

تمذهب (زيد بن علي بن الحسين بن علي) {٧٩- ١٢٣هـ} في الأصول، بمذهب المعتزلة، إذ كان تلميذاً لـ{واصل بن عطاء}: ٨٠-١٣١هـ، واتجه في المعارضة لبني أمية إلى طريق الثورة، وتجريد السيف مخالفاً عمّه جعفر الصادق القائل: {إن بني أمية يتطاولون على الناس حتى لو طاولتهم الجبال لطالوا عليها، وهم يستشعرون بُغْضَ أهل البيت، ولا يجوز أن يخرج واحد من أهل البيت حتى يُأْذَنَ الله بزوال ملكهم} فلما أعلن زيد ثورته ضد هشام بن عبد الملك سنة: ١٢٢هـ، رفض الشيعة الإمامية، أتباع جعفر الصادق، الإنخراط في القتال معه، بعد أن كانوا قد بايعوه، فَسُمُّوا رافضةً لذلك منذ ذلك التأريخ.

ومن المؤرِّخين مَنْ يعلِّل رفْضَ الشيعة الإمامية للثورة خَلْفَ زيد بن علي، بامتناعه عن إدانة أبي بكر وعمر بن الخطاب، رغم تفضيله علياً عليهما}[١].

واتە: لە عورف و باوی {ئەهلی سوننەت و جەماعەت}دا، ڕافیزە بە پێڕو تاقم و قوتابخانە جۆراو جۆرەکانیانەوە، بەگشتی بە شیعە دەگوترێ، ئەو شیعانەی کە ڕەوایەتیی خیلافەتی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانیان خوا لێیان ڕازی بێ، ڕەت کردۆتەوە، هەر بۆیەش مێژووی ئیسلامییان ڕەت کردۆتەوە، {واتە: ئەو ماوەیەی کە ئەو سێیانە تێیدا حوکمڕان بوون ڕەتیان کردۆتەوە}، ئنجا سەرەتای پەیدا بوونی ئەو ناوە {رافضة} بەو شێوەیە بوو:

زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی {کە پێشتر باسمان کرد}، لە بنچینەکانی ئیسلامەتییدا، لەسەر مەزهەبی موعتەزیلە بوو، قوتابی واصیلی کوڕی عەتا بوو، کە دامەزرێنەری فیکری ئیعتیزالە، بەڵام زەید بە پێچەوانەی جەعفەری صادقیی مامییەوە، ئیعلانی دژایەتیی بەنی ئومەییەی کرد لە ڕێگای هەڵکێشانی شمشێرو چەکەوە، جەعفەری صادیق قسەیەکی هەیە کە لەزۆر لە کتێبەکاندا هاتوە، گوتوویەتی: (بەنی ئومەییە ستەم لە خەڵك دەکەن، تەنانەت ئەگەر چیاش لەڕاستیان ڕابێ، بەسەریدا زاڵ دەبن، ئەوانە ڕقیان لە بنەماڵەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، دروست نیە هیچ کەس لە بنەماڵەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دژیان ڕاوەستێ، هەتا خوا مۆڵەت دەدا لە بەین بچن)[٢].

کاتێك کە زەید شۆڕشەکەی خۆی ڕادەگەیەنێ دژی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك، لە ساڵی (١٢٢ك)دا، شیعەی ئیمامیی شوێنکەوتووانی جەعفەری صادیق کە زۆرینەی شیعەیان پێك هێناوە، قبووڵ ناکەن کە بچنە نێو سوپاکەیەوە، هەرچەندە پێشتریش بەیعەتیان بە زەید داوە، بۆیە لەو ڕۆژەوە

---

(١) إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات، محمد عمارة، ص ٤٧١-٤٧٣، و (الملل والنحل) للشهرستاني.

(٢) ئەوە ڕای ئەو بووە، ئنجا چەندی پێکاوە یان نەپێکاوە، ئەوە شتێکی دیکەیە، بینیویەتی هەرچی دژی بەنی ئومەییە شۆڕش دەکات، سەرکەوتوونابێ، ئیدی ئەو قەناعەتەی بۆ دروست بووە.

ناویان لێنرا: ڕافیزە {واتە: ڕەفزیان كرد كە لەگەڵ زەید دابن و، لەدژی بەنی ئومەییە شۆڕش بكەن}.

بەڵام هەندێ لە مێژو نووسان دەڵێن: بۆیە شیعەی دوازدە ئیمامیی ڕەفزیان كرد كە لەگەڵ زەیددابن، لەدژی بەنی ئومەییە، چونكە ئەو ئامادە نەبوو ئیدانەی ئەبو بەكرو عومەران بكات خوا لێیان ڕازی بێ، هەرچەندە دەیگوت: عەلی لەوان چاكترە، بەڵام ئامادەش نەبوو كە ئیدانەی حوكمڕانیەكەیان بكات و بڵێ: ڕەوا نیە، {دەیگوت: حوكمەكەیان ڕەوایە، مادام خەڵك هەڵی بژاردوون، بەڵام خەڵك نەیانپێكاوەو، عەلی لەوان چاكتر بووە، ئێستاش شیعەی زەیدیی هەر وا دەڵێن}.

٢- لە (المعجم الوسيط)یش دا هاتوە:[١]

{الرافضة مؤنث الرافض، والرافضة طائفة من الجنود تركوا قائدهم وانصرفوا، والرافضة: فرقة من الشيعة تجيزُ الطَّعْنَ في الصَّحابة سُمُّوا بذلك لأَن أَوَّليهم رفضوا زيد بن علي حين نهاهم عن الطَّعْن في الشيخين، والجمع: روافض}، واتە: (رافضة) مێینەی (رافض)ە، هەروەها (رافضة) كۆمەڵە سەربازێكن كە فەرماندەكەیان بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن.

هەروەها (رافضة) كۆمەڵێكن لە شیعە تانەدان لە هاوەڵان بەڕەوا دەزانن و، بۆیەش ئەو ناوەیان لێنراوە چونكە پێشووەكانیان زەیدی كوڕی عەلییان ڕەفز كرد كاتێك ڕێگریی تانەدان لەم دوو پیاوە گەورە (أبوبكر و عمر)ی لێكردن، كۆی (رافضة) (روافض)ە.

ئنجا هەر چۆن بێ ئایا هۆی ناو نرانیان بە (رافضة) لەبەر ئەوە بووە كە: زەیدیان ڕەفز كردوە، یان لەبەر ئەوە بووە كە: ڕەوایەتیی حوكمڕانی ئەبو بەكرو عومەریان ڕەفز كردوە؟ گرنگ ئەوەیە ئەوە ناوێكی گشتییەو زۆر جار بۆ كۆی شیعە بەكاردێ، جگە لە شیعەی زەیدیی.

---

(١) ص ٣٦٠.




## هەڵوێستی مسوڵمانانەو جوامێرانەی زەید لە بەرانبەر شیعەی (رافضة)دا

با شتێکتان بۆ بگێڕمەوە کە لە کتێبەکانی مێژوودا هاتوە، دەربارەی هەڵوێستی زەید کە چەندە جوامێرانەو مسوڵمانانە بووە! کاتێ کە لە بەنی ئومەییە ڕاپەڕی، کۆمەڵێکی زۆری شیعە چوون بۆ لای، گوتیان: ئێمە هاتووین هەندێ پرسیارمان هەیە، ئەگەر وەڵامەکانت بەدڵی ئێمە بن، لەگەڵتین {لەو کاتەدا کە زەید ئیعلانی ڕاپەڕینی کردوەو بەنی ئومەییە خەریکە سوپا ساز دەکەن، کاتێکی زۆر هەستیار، مەبەستم ئەوەیە کە ئینسانی دیندارو خاوەن مەبدەء، دەبێ هەڵوێستی چۆن بێ! لە شێنەییدا هەموو کەس ئازایە، بەڵام ئینسان لە هەڵوێستدا دەردەکەوێ!} زەیدیش دەڵێ: باشە، فەرموون، دەڵێن: پێمان بڵێ: ئەو حوکمڕانییە کە ئێستا بەدەست بەنو ئومەییەوەیە، ڕەوایە یان ناڕەوایە؟ دەڵێ: ناڕەوایە، دەڵێن: ئەو ناڕەوایەتییە لەکوێوە هاتوە؟ ئایا لە سێ جێنشینەکەی دیکەوە نەهاتوە، ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان؟ دەڵێ: با، دەڵێن: دەی باشە بۆچی لەدژی بەنو ئومەییە چەك هەڵدەگری، ئەدی بۆچی ئەوان ڕەت ناکەیەوە؟ زەیدیش دەڵێ: من پێم وایە عەلی کوڕی ئەبو تالیب شایستەتر

بووە بە جێنشینایەتیی، بەڵام مسوڵمانان ئەویان دانەنا، {دیارە زەیدیش بڕوای بەوە نەبووە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتێکی کردبێ ئەم مەسەلەیە دەقێکی لەسەر بێ} ئیدی مسوڵمانان لەو کاتدا ڕەوایەتییان پێ نەدا، ئنجا ئەوانەی پێش عەلییش حوکمیان بە دادگەریی کردو حوکمیان بە شەریعەت کردو ڕێك و ڕاست بوون، بەبەڵگەی ئەوە کە عەلی هاوکاریان بووو، بنەماڵەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاوکاریان بوون، ئنجا گوتی: من لە هیچ کام لە بنەماڵەی خۆمم نەبیستوە کە بەرائەت بکەن لە ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، منیش لەسەر ڕێچکەی بنەماڵەی خۆمم، هەر بیستوومە بنەماڵەی ئێمە دۆستایەتییان کردوون و، مەدحیان کردوون و، قسەی خێریان دەربارە کردوون!

ئەوانیش گوتیان: ئەگەر تۆ ڕەوایەتیی حوکمڕانیی ئەبو بەکرو عومەر ڕەفر نەکەی، ئێمە لەگەڵت نابین[1].

لێرەدا بەباشی دەزانم وتووێژێکی نێوان [ علي بن الحسين (زين العابدين)] بابی [زید] و [محمد الباقر (أبو جعفر)] و کۆمەڵێك لە شیعەی رافیزەی عێراق بگێڕمەوە:

کۆمەڵێك لە خەڵکی عێراق هاتنە لای (زين العابدين) و قسەی ناشیرینیان بەهەرکام لە [ أبوبكر و عمر و عثمان] گوت، ئەویش پێی گوتن:

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحشر)دا، باسی سێ جۆر لە مسوڵمانان دەکات: (کۆچ کردووەکان، پشتیوانان، ئەوانەی دوای وان)، باسی کۆچکەران بەم شێوەیە دەکات، دەفەرموێ:

﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ ﴾

---

(١) بڕوانە: البداية والنهاية لابن كثير، ج١٠ ص ١٧٨-١٧٩ ، ط٤ / ٢٠١٥م.

ئنجا پێی گوتن: ئایا ئێوە لەوانن؟ گوتیان: نەخێر، ئێمە لە کۆچکەران نین.

گوتی: ئەدی لەوانەن کە خوای بەبەزەیی دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾

{ئەمەش باسی پشتیوانەکانە} ئایا ئێوە لەمانەن؟ گوتیان: نەخێر لەوانەش نین.

ئنجا پێی گوتن: ئنجا منیش سوێند دەخۆم کە لەو کەسانەش نین، کە خوای پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾

خوا دەفەرموێ: ئەوانەی لەدوای ئەوانیش (کۆچکەران و پشتیوانان) دێن، {واتە: تابیعین تاکو مسوڵمانانی ئێستاش و تاکو ئاخیر زەمان} (تایبەتمەندترین سیفەتیان ئەوەیە) دەڵێن: پەروەردگارمان! لەو برایانەمان خۆش بە، کە بە ئیمانەوە پێش ئێمە کەوتوون و، کینەو بوغز مەخە نێو دڵمان بەرانبەریان، پەروەردگارمان! بێگومان تۆ زۆر میهرەبانیی و زۆر بەبەزەیی.

پێی گوتن: سوێند بەخوا، ئێوە لەوانەش نین، چونکە ئێوە ڕقتان لەو هاوەڵانەیە خوا لێیان ڕازی بێ، دەبرۆن ئاواو ئاوا بچن[1].

---

(١) بڕوانە: الجامع لأحكام القرآن، للقرطبي، ج١٨ ص٢٥.




# ناصیبە ( الناصبة )[1]

١- پێناسە.

٢- هەڵوێستی هاوسەنگی زانایان و خۆشویستنی هاوەڵان و خزمان پێکەوە.

٣- هەڵوێستی بوێرانەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە لەو بارەوە، لەبەرانبەر نادر شادا.

٤- هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانی گرووپ و تاقمە لادەرەکان، لادان بووە لە خەتی ڕاست و هاوسەنگ.

---

(١) ئەمانە ڕێك لەگەڵ ڕافیزەدا دژ دەوەستن، چونکە ڕافیزە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا خوا لێیان ڕازی بێ، دەبوغزێنن و، ناصیبەش خزم و نیزیکەکانی.




## پێناسە

١- (إبن منظور) دەڵێ: {والنَّواصِبُ قومٌ يَتَدَيَّنُونَ بِبِغْضَةِ عليّ عليه السلام[١]}[٢]، واتە: نەواصیب کۆمەڵێکن ئەوە بە عیبادەت و دینداریی، دەزانن، کە ڕقیان لە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب بێ، خوا لێی ڕازی بێ.

٢- (الذهبي) دەربارەی یەزیدی کوڕی موعاویە دەڵێ: {وكان ناصبياً، فظاً، غليظاً، جِلفاً يتناولُ المُسْكر ويفعل المنكر}[٣] واتە: یەزید ناصبییەکی قسە ڕەقی دڵڕەقی تەبیعەت خراپ بووە، (شەڕابی) سەرخۆشکەری خواردۆتەوەو گوناهی کردوون.

وەك چۆن ڕافیزە بۆتە نازناوێك بۆ شیعە، کە ڕقیان لە هاوەڵان بووە، بەتایبەتی هەرسێ خەلیفەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ناصیبەش بە پێچەوانەوە، ڕقیان لە خزمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

---

(١) ئەو گوتوویەتی: (علیه السلام) دەنا من بەهەموویان دەڵێم: (رضي الله عنه)! ئنجا بۆ زانیاریتان لە زۆربەی کتێبان لەدوای ناوی عەلی دەگوترێ: (کرم الله وجهه)، نازانم ئەوەیان لەکوێ هێناوە! بەحەقیقەت: خوا تەنها (رضي الله عنهم)ی بۆ بەکار هێناون.

(٢) لسان العرب، ج١٤، ص١٥٧.

(٣) بڕوانە: سیر أعلام النبلاء، ج٤ ص ٣٧، ٣٨.

بووە، ئنجا ڕافیزەو ناصیبە، ئەگەر هەردووکیان کۆ بکەیەوە، پێغەمبەری خوا، نە خزمەکانی دەمێنن، نە هاوەڵانی!! بەڵام دیارە وەك چۆن هی شیعە لادان بووە، بە حەقیقەت هی ناصیبەش بەهەمان شێوە، شایانی باسیشە زۆرێك لە بەنو ئومەییە ناصیبیی بوون، لەوانەیە هەندێ شت هەیە پێتان سەیر بێ! لە (الکامل في التأريخ)ی (إبن الأثير) و (البداية والنهاية)ی (إبن کثير)دا هاتوە کە موعاویە لەسەردەمی خۆیدا وەك بنەما داینابوو: کە دەبێ لەسەر مینبەر جنێو بگوترێ بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب، ئەوەش بەردەوام بووە لە ڕۆژگاری حوکمڕانانی بەنو ئومەییەدا، تاکو سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ئەو ئایەتەی کە ئێستاش هەندێ وتار بێژ دوای وتارەکەیان لەسەر مینبەر دەیڵێن:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٩٠﴾ النحل

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەو ئایەتەی لەشوێنی ئەو جنێوانە دانا، کە موعاویە فەرمانی پێ کردبوون، دەبووایە هەر کەسێ دەچێتە سەر مینبەر، قسە بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب بڵێ!! وەك (الحافظ ابن حجر العسقلاني) گوتوویەتی: (إن بني أمية شَتموا سيدنا علياً واتخذوا لَعْنَهُ على المنابر سنةٌ)[1].

واتە: بەنو ئومەییە جنێویان بە گەورەمان عەلی دەگوت و لەعنەت لێکردنی ویان لەسەر دوانگان، کردبوو بە بڕیارو ڕەفتارێکی بەردەوام.

هەروەها لە (صحيح مسلم: ٢٤٠٩)دا هاتوە لە (سهل بن سعد) خوا لێی ڕازی بێ کە: (أُستعمل على المدينة رجل من آل مروان، قال فدعا سهل بن سعد فأمره أن يشتم علياً...)، واتە: پیاوێك لە بنەماڵەی مەڕوان کرابوو بە بەرپرس (والي) مەدینە، ئەویش (سهل بن سعد)ی بانگ کردو فەرمانی پێکرد جنێو بە عەلی بڵێ...

---

(١) فتح الباري، ج٧ ص٧١.

هەروەها هەمان مەبەست لەبارەی جنێو پێدرانی عەلییەوە لەلای موعاویە، ئەلبانیی لە (صحيح سنن أبي داود: ٣٨٧٧)دا هێناویەتی.

ئاگادار بن! هەندێ شت هەیە، بەبەلاش شیعە وا شێت نەبوون، من باسی کتێبەکانی ئەوان ناکەم، کە شتی نابەجێ و ناڕاستیان زۆر تێدایە، بەڵام هەندێ ڕاستیی هەن لە مێژووی خۆشماندا چەسپێنراون.

دەگێڕنەوە: ئەو کاتەی کە عەبدوڕەحمانی کوڕی مەلجەم عەلی کوڕی ئەبو تالیبی شەهید کرد، موعاویە خەڵکی لە شام بە شێوەیەك لە عەلی تێگەیاندبوو، کاتێ پرسیاریان کرد چۆن کوژراوە؟ گوتیان: لە ڕێی نوێژێ، دەیانگوت: بۆچی عەلی نوێژی دەکردن؟ {هەرچەندە ئەوە شتێکی سەیرەو جێی گومانیشە}.

جارێك مامۆستایەکی خۆمان گوتی: مامۆستا! بابم تۆی زۆر خۆش دەوێ، گوتم: خوا خۆشی بوێ، لە چییەوە ئاوا مەحەببەتی بۆ من پەیدا بووە؟ گوتی: جارێك ئەو لەنوێژی جەژن بووە، تۆش هاتووی بۆ مزگەوتێ، دوو پیاوی پیرت لەملاولا بوون، ئەوانیش لەبەرت هەڵساونەتەوە، تۆش دەستت ماچ کردوون و مەحەببەتت لەگەڵ نواندوون، بابیشم کە تۆی وا بینیوە، گوتوویەتی: تا ئێستا نەمزانیوە فلانکەس ئاوایە! کە دەستی ئەو دوو نەفەرەم ماچ کردوە، پێی سەیر بووە! هەندێ کەس لەوانەیە ئێمەی وا بۆ وێنا کرابێ، بەجۆرێکی دیکە بمانناسێ! بۆیە دەڵێم: بچنە نێو خەڵك و بەشداریی شین و شایی خەڵك بکەن، چونکە وەك ئەوەی ئێمە خۆمان دەناسین، مەرج نیە خەڵك وامان بناسێ.

من دەزانم شیعە ئەفسانەو درۆیان زۆرە، بەڵام بە هەقیقەت بەنو ئومەییەش بە جیددیی کاریان لەسەر ئەوە کردوە، کە عەلی و کوڕەکانی و خزمەکانی لەبەر چاوی خەڵك بخەن، بە حیسابی خۆیان لەوانەیە وایان لێك دابێتەوە: ئەگەر وا نەکەن، خەڵك لێیان دەئاڵێ و شۆڕشیان لەدژ دەکەن! ئاوا ڕەنگە بە جۆرێ لە جۆرەکان، مەسەلەکەیان شەرعاندبێ، بەڵام نە شەرعییەو، نە هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامیشەوە هەیە.




## هەڵوێستی هاوسەنگی زانایان و خۆشویستنی هاوەڵان و خزمان پێکەوە

دوو پارچە شیعر لە ئیمام شافیعییەوە گێڕراونەتەوە {موحەممەدی کوڕی ئیدریس} کە لە باپیرەی هەشتەم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) پێك دەگاتەوە: شافیعیی لە وڵاتی یەمەن بووە، لەسەردەمی عەبباسییەکاندا، عەبباسییەکان دەبیستن کە شافیعیی خۆشەویستیی (أهل البیت)ی هەیە، لە یەمەنەوە بە کەلەپچە کراویی دەیهێنن بۆ بەغدا، پازدە بیست کەسی دیکەشی لەگەڵدا دەبن، کە تۆمەتبار کراون بەوە، کە ئەوانە پشتگیریی (ئالی عەلی) دەکەن، هەموو ئەوانەی لەگەڵی دەبن، دەیانکوژن، دوو سێ زانا لەوێ دەبن، کاتێ نۆرە دەگاتە سەر شافیعیی کە بکوژرێ، دەڵێن: ئەوە زانایەکی زۆر چاکەو حەیفە بکوژرێ، دەکەونە قسە لەگەڵی، لە ڕیوایەتێکدا بینیومە دەڵێن: ناتکوژین، بەڵام لێرە مەمێنە، ئەویش دەچێ بۆ میصر، ئنجا لە میصرِ بەو بۆنەوە گوتوویەتی:

**إن كان رفضاً حب آل محمد ** فليشهد الثقلان أني رافضي**

واتە: ئەگەر خۆشویستنی بنەماڵەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ڕەفز دابنرێ، ئەوە با جینن و ئینس شاهید بن کە من ڕافیزییم.

شیعرێکی دیکەشی لێ گێڕدراوەتەوە دەڵێ:

إذا نحــن فضَّلنا عـليـــاً فإنّنـا * روافض بالتفضيل عند ذوي الجهل
وفضل أبي بكر إذا مــا ذكرتـــه * رميتُ بِنَصْبٍ عند ذكري ذا الفضل
فلا زلتُ ذا رَفْضٍ ونَصْبٍ كلاهما * بحـــبهما حـــتى أُوَسَّدَ في الرمـــل

واتە: ئەگەر باسی سیفەتە چاکەکانی عەلییمان کرد، لەلای خەڵکی نەفام، بەڕافیزیی لەقەڵەم دەدرێین و، ئەگەر باسی چاکەی ئەبو بەکریشمان کرد، بەهۆی باس کردنی چاکەی ئەبو بەکرەوە، بەناصیبی دادەنرێین، ئیدی بەردەوام من هەم خاوەنی ڕەفزم، هەم خاوەنی نەصبم، هەتاکو دەمخەنە نێو لمەوە، {واتە: هەتاکە دەمنێژن، هەم ئەبو بەکرو هەم عەلییشم خۆش دەوێن}.

{إبن تیمیة}ش دەڵێ:

إن كان نصباً حب أصحاب محمد ** فليشهد الثقلان أَنِّي ناصبـي

واتە: ئەگەر خۆشویستنی هاوەڵانی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، بە نەصب لەقەڵەم بدرێ، با جینن و ئینس بزانن کە من ناصیبییم.

هەڵبەتە ڕێگای ڕاست ئەوەیە: کە هەم هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان (صلی الله علیه وسلم) خۆش بوێن و، هەم خزمەکانی، ئەوانەی کە بە ڕێبازی ئەودا ڕۆیشتوون.




## هەڵوێستی بوێرانەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە لەو بارەوە، لەبەرانبەر نادر شادا

کاتی خۆی نادر شای ئەفشاریی، کە بەغدای گرتوەو چۆتە نەجەف و کەربەلا {نادر شاه شیعە بووە} لە ساڵی: (١١٥٦ک/ ١٧٤٣ز)دا نامەیەك دەنووسێ بۆ شێخ حەسەنی گڵە زەردە - کە لە دێی (گڵە زەردە)ی لای سولەیمانی دانیشتوە، لەساڵی (١٠٨٨ک/١٦٧٧ز)دا لەدایك بووە و لە: (١١٧٥ک/١٧٦٢ز) دا کۆچی دوایی کردوە - بۆی دەنووسێ: تۆ لە ئەهلولبەیتی، منیش هاتووم بەرگریی لە مەزهەبی باپیرت: جەعفەری صادیق و (ئەهل و لبەیت) بکەم، لەبەر ئەوە وەرە بۆ لامان و ڕێزت لێ دەگرین، شێخ حەسەنیش نامەیەکی بۆ دەنووسێتەوەو دەڵێ:

ئەوە کە بانگەشەی خۆشویستنی (أهل البیت) دەکەی، ئەگەر ڕق لێ هەڵسانی هاوەڵان (بغض الأصحاب)ی تێکەڵ بووبێ، بەکەڵك نایەت [و، ناگونجێ بە بیانووی خۆشویستنی خزمانی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)، ڕقت لە هاوەڵانی ببێتەوە]، ئەوەش کە دەڵێی: وەرە بۆ لام، منی پەڕپووت و بێچارە توانای هاتنم نیە، بیستووشمە باسی شەڕ دەکەی لەگەڵ

عوسمانییەکاندا، ئەو شەڕە مەکە، ئەگەرنا دەدۆڕێی! دیارە {نادر شاە} بە قسەی ناکات و شەڕەکە دەکات و، لە شەڕەکەشدا دەدۆڕێ.[1]

---

(١) بڕوانە: (الشيخ معروف النودهي البرزنجي) للشيخ محمد الخال، ص٧٥.
هەروەها بڕوانە: (تەسەووف و ڕەوتی نیشتیمانی)، نووسینی: شێخ یەحیا بەرزنجی، لاپەڕە: ٩٥، ٩٦.

ئەمەش دەقی هەردووك نامەكەیە:

١- نامەكەی نادرشاە:
{ منّي إلى الحَبْر النبيل والشريف الغِطْريف الأصيل، ذي المآثر والمناقب والمِنَن: السيد حسن، نَسَمات التسليمات ونَفَحات التحيات وبعْد: فإن أَجلَّ مطالبي وأول مآربي ترويج فذْهَب جدِّكم: جعفر الصادق الإمام الهمام منبع العلوم والحقائق، وإِن حُبِّي لِأجدادكم لمعلوم، وأَنَّ مجيئكم إلينا لَزِمَ أَشدَّ اللُّزوم فبوصول أَمرْي إِليكم إِئْتِنا لَنَبترك بكم وبمن لديكم، وإِلاّ فَسَتَنْزِلُ نارُ غضبي عليكم، والسلام عليكم}.

٢- وەڵامەكەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە بۆ نادر شاە:
{بسم الله الرحمن الرحيم، الحمدلله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولاعدوان إلا على الظالمين، والصلاة والسلام على سيّدنا محمد وعلى آله وصَحْبه أجمعين، وبعد:

فقد أخذتُ كتابكم، أمّا دعوى حُبُّ أجدادي فلا أعْلَمُ أهذا الحبّ مشوبٌ بِبعْضِ الأصحاب أم لا؟ فإن كان مشوباً بِبَعْضهم فلا ينفعك يوم الحساب، بل يكون سبباً للحساب والعذاب، وأما قولكم: إن قصدي ترويج مذهب الصادق رضي الله عنه، فهو وإن كان من أجلِّ التابعين وأكمل المجتهدين، لكن لانقراض أصحابه، ما صار مذهبه مدوناً، ولوعلمنا تدوينه لآتبعناه لكوننا من ذريته.

وأما أنا فكاسف الحال عليكَ البال لا أقدر على المجيء، ولكن أوصيك بوصايا إن عملت بها نجوت،

١- منها: أن لا تحارب مع السلاطين العثمانية...

٢- ومنها أن ما أَضْمَرْت من تخريب الموصل والحرب مع أهلها، فلا تفعله...

٣- ومنها أن تُعَجِّل في التوبة ولإستغفار... ولاسّلام على من اتَّبع الهدى }.

تێبینی: چەند ڕستەیەكمان لە نامەكەی شێخ حەسەن قرتاندن، بەمەبەستی كورتكردنەوە.




## هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانی گرووپ و تاقمە لادەرەکان: لادان بووە لە خەتی ڕاست و هاوسەنگ

لەکۆتایی باسی ناصیبەو ڕافیزەدا، دەمەوێ ئەوەتان بۆ باس بکەم، برایان و خوشکانی بەڕێز! کە ئەگەر تەماشای مێژووی مسوڵمانان بکەین، دەبینین زۆر لەو تاقم و گرووپ و تەوژمە فیکرییانە، لە ئەنجامی کاردانەوەی یەکدیدا پەیدا بوون، بۆ وێنە: شیعە هەڵساون بە حیسابی خۆیان مەحەببەتیان بۆ خزمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربڕیوە، کە بێگومان ئەوەش هەقە و، هیچ مسوڵمانێك نکووڵیی لێ نەکردوە، چونکە: خزمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، مەزڵووم بوون، زوڵمیان لێ کراوە، ئەوەتا تەماشا دەکەین عەلی خوا لێی ڕازی بێ، شوێنکەوتووانی خۆی شکست (خذلان)یان بەسەردا هێناوە، دوایی بەناهەق دەکوژرێ، پاشان حوسەین لە کەربەلا دەکوژرێ، دوایی ئەو زنجیرە ڕاپەڕینانەی خزمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەردەوام دەبن، زۆریشیان تێ دەچن و دەکوژرێن، بە گشتیش پیاوی زۆر چاك بوون و زۆریان زانا بوون و، زۆر عابید بوون، لەنێو خەڵکدا زۆر خۆشەویست بوون، هەر ئەوە نەبووە تەنها خزمی پێغەمبەر بووبن (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا شیعە

کە تەماشایان کردوە، هەر زوڵمیان لێکراوە، کاردانەوەیەکیان بۆ دروست بووەو، تێیان پەڕاندوە لە خۆشویستنیان و ڕێز لێ گرتنیان و بەپیرۆز گرتنیانداو، لەبەرامبەردا بەنەزانیی وایانزانیوە کە هاوەڵان زوڵمیان لێ کردوون و، شتەکەیان بردۆتەوە سەر ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان خوا لێیان ڕازی بێ.

دوایی لەبەرامبەر ئەواندا، ناصیبە پەیدا بوون، بەحیساب بۆ بەرگریی کردن لە هاوەڵان، هەڵساون ئەوانیش ڕقیان لە ئالی عەلی داگرتوەو تێیان پەڕاندوەو، دواتر هەر کەسێ بۆنی (أهل البیت)ی لێ هاتوە، بوغزاندوویانە، بەتایبەت بەنو ئومەییە، کە بێگومان هی هەردووك لایان هۆکاری سیاسیی تێکەڵ بووە.

بەڵێ کە تەماشای ئەو ڕەوتە فیکرییانە دەکەین: هەموویان بەرهەم و زادەی کارو کاردانەوەن، بۆیە دەبێ ئەو پەندە وەربگرین کە هەمیشە ئینسان دەبێ خەتی نێوەڕاست بگرێ و، لەخۆی وریا بێ، عاتیفەو سۆز زاڵ بوون بەسەریدا، تووشی هەر کام لە تێپەڕاندن (إفراط) و بە زایەدان (تفریط)ی نەکات.




# ئەهلی حەدیس
# ( أهل الحديث )

١- پێناسە.

٢- سەردەم و هۆكاری سەرهەڵدانی ئەو ڕەوتە.

٣- پێشەوای ئەو ڕەوتە.

٤- بنەما فیكرییەكانی ڕەوتی ئەهلی حەدیس، بەتایبەت ئەحمەدی كوڕی حەنبەل.

٥- ڕەخنەگرتنی دووان لە شەرعزانانی حەنبەلیی مەشڕەب لە حەنبەلییەكان.

بەڕێــزان!

ئێمە لە پێنج (باس)دا قسە لەبارەی ئەو تەوژمە فیکرییەو شوێنکەوتووانییەوە دەکەین، کە ئەوانیش مەرج نیە لە قەوارەیەکی دیاریکراویی سیاسییدا بەرجەستە بووبن، بەڵام وەك ڕەوتێك و تەوژمێکی فیکریی هەبوون و، ئێستاش هەن، هەڵبەتە ئەوە کە: { دەبێ بەدوای ڕێبازی پێغەمبەری خوا بکەوین}، ئەوە شتێکە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، لێتان تێك نەچێ، کە دەگوترێ {ئەهلی حەدیس} بەو واتایە نیە کە هەر ئەوانە گرنگییان بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوادواە، یان هەر ئەوانە گرنگییان بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوە! بەڵام ئەوانە بەجۆرێك مامەڵەیان لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردوە، مۆرکێکی تایبەتییان وەرگرتوە، کە باسی دەکەین و، لەو ڕووەوە بە ڕەوتێکی فیکریی دادەنرێن.




## پێناسە

دكتۆر (محمد عمارة) گوتوویەتی:

{أهل الحديث: هم التيار النصوصي الذي جعل النصوص والمأثورات المرويّة مرجع الدين الوحيد –أو شبه الوحيد- رافضين إدخال الرأي والعقل والقياس والتأويل وغيرها من أدواة النظر العقلي، في سَبْرِ غَوْرِ النصوص، مُفَضِّلين على ذلك الوقوف عند ظواهر النصوص أو قريباً من هذه الظواهر}[1].

واتە: (أهل الحديث) بریتیە لەو تەوژمە دەقگەرایەی كە دەقەكان و ئەو شوێنەوارە گێڕدراوانەی گێڕدراونەوە، دەكەن بە تاكە مەرجیع و سەرچاوەی دین، یاخود نزیك لە تاكە سەرچاوەو، ڕەفزی دەكەن كە بۆچوون و عەقڵ و قیاس و تەئویل و جگە لەمانەش، لە ئامرازەكانی سەرنجدانی عەقڵیی، بەكار بهێنن بۆ ڕۆچوون بە دەقەكانداو قووڵ لێ تێگەیشتنیان، لەجیاتی ئەوە، ئەوە بەباشتر دەزانن كە لەلای ڕواڵەتی دەقەكان، بوەستن یاخود نزیك لە ڕواڵەتی دەقەكانەوە بوەستن.

منیش تا ڕاددەیەكی زۆر ئەو پێناسەیەم بەدڵەو پشتگیریی دەكەم و پێم وایە تەعبیر لە واقیع و حاڵی ئەو تەوژمە دەكات.

---

(١) إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات، د. محمد عمارة، ص١٣٣، ١٣٤.




## سەردەم و هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو ڕەوتە

هەروەها دکتۆر (محمد عمارة) گوتوویەتی:

{كان العصر العباسي هو الحِقبة الزمنية التي اشتهر فيها أمر هذه الفرقة، لأن ازدهار مدارس الرأي والنظر الفلسفي والعقلاني، وتأثيرات الوافد اليوناني العقلاني، والوافد الفارسي الإشراقي، قد أَفْزَعَتْ قِطاعاً كبيراً من عامة الأمة، فَوَجَد وجدانُه التعبيرَ عن الأمن من هذا الفزع، في الحصن الذي تمثّل في مدرسة (أهل الحديث)}[1].

واتە: سەردەمی عەباسییەکان ئەو ڕۆژگارە بوو، کە ئەو تەوژمەی تێدا دەرکەوت، چونکە گەشە کردنی قوتابخانەکانی ڕەئی و، سەرنجدانی فەلسەفیی و عەقڵانیی و، کاریگەرییەکانی هاتنی فیکری یۆنانیی عەقڵانیی و، هاتنی فیکری ڕووحانیی ئیشراقیی فارسیی، خەڵکێکی زۆری لە ئۆممەت ترساند {کە بەهۆی هاتنی ئەو فیکرانەوە، نەیارانی ئیسلام کارێکی وا بکەن، ئیسلام بخەنە ژێر هەژموونی خۆیانەوە، بۆ ئەوەی مسوڵمانەتیی لە نێوەڕۆکی خۆی خاڵی بکەنەوە}[2] بۆیە ئەهلی حەدیسیان بەو قەڵایە زانی کە پەنای پێ بەرن. {لەبەرامبەر ئەو بیرۆکانەدا، کە لە یۆنانەوەو، لە فارسەوەو، لە هیندەوە دێن}.

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٢) نێوان کەوانەکان {} زیادەی خۆمە.




## پێشەوای ئەو ڕەوتە

پێشەوای ئەو ڕەوتە، زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە کونیەکەی (أبو عبدالله)یە (١٦٤-٢٤١)ك/ (٧٨٠-٨٥٨ز) و خاوەنی (المسند)ە، بەڵام جگە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئەم زانایانەش خۆیان لەو بازنەیەدا دەبیننەوە:

١- إسحاق بن راهويه: ٢٣٨هـ إمام الجرح والتعديل.

٢- البخاري: ٢٥٦هـ.

٣- أبو داود: ٢٧٥هـ.

٤- الدارمي: ٢٨٠هـ.

٥- الطبراني: ٣٦٠ هـ.

٦- البيهقي: ٤٥٨هـ.

٧- إبن عبدالبر: ٤٦٣هـ.

٨- أبو الوفاء ابن عقيل: ٤٣١- ٥١٣هـ.

٩- إبن تيمية: ٦٦١-٧٢٨هـ.

١٠- إبن القيم: ٦٩١-٧٥١هـ[1].

---

(١) إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات، د. محمد عمارة، ص ١٣٣- ١٣٤.




## بنەما فیکرییەکانی ڕەوتی ئەهلی حەدیس، بەتاییەت (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)

بەڕای ( ابن القيم ) کە یەکێکە لە زانا بەرجەستەکانی ئەو ڕەوتە:

بەرنامەو میتۆدی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو پێنج بنەمایەدا خۆی بینیوەتەوە:

{الأول: النصوص: فإذا وجد النَّصَّ، أفتى بموجَبِه ولم يلتفتْ إلى ما خالَفَه، ولا مَن خالَفه كائناً من كان.

الثاني: ما أفتى به الصحابة: إذا وجد لبعضهم فتوىً لا يُعْرَف له مخالِف منهم فيها، لم يَعْدُها إلى غيرها، ولم يُقَدِّمْ عليها عملاً ولا رأياً ولا قياساً.

الثالث: إذا اختلف الصحابة: تخيَّر من أقوالهم ما كان أقربها إلى الكتاب والسنة، ولم يخرجْ عن أقوالهم، فإن لم يتبيَّن له موافقة أحد الأقوال، حكى الخلاف فيها ولَم يجْزِمْ بقولٍ.

الرابع: الأخذ بالمرسل والحديث والضعيف، إذا لم يكن في الباب شيء يدفعه.

الخامس: القياس للضرورة: فإذا لم يكن عند الإمام أحمد في المسألة نص ولا قول الصحابة، أو واحدٍ منهم، ولا أثر مرسل أو ضعيف، عَدَلَ إلى الأصل الخامس وهو القياس فاستعمله للضرورة}[1].

واتە:

**یەکەم:** ئەگەر دەق (نص)ی بەدەست گەیشتبێ لە شتێکدا، یەکسەر فەتوای پێ داوەو چاودێڕی ئەوەی نەکردوە چ شتێك پێچەوانەی ئەوەیە، یاخود کێ پێچەوانەی ئەوە دەجووڵێتەوە، مادام فەرموودە هەبووبێ، لە هەر بوارێکەوە، یەکسەر فەرموودەکەی کردوە بە فەتواو تەبەننیی کردوە.

**دووەم:** ئەگەر فەرموودەی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) دەست نەکەوتبێ، تەماشای کردوە ئەوەی کە هاوەڵان وەك فەتوا گوتوویانە، مادام لەنێوان خۆیاندا لەسەری ناکۆك نەبووبن، {ئەوەی کە هاوەڵان فەتوایان پێ داوە}، یەکسەر کاری پێ کردوەو نەچۆتە سەر کردەوەو قسەو قیاسی هیچ کەس {بۆیەش باسی کردەوەی کردوە، چونکە پێشەوا مالیك، کردەوەی ئەهلی مەدینەی بە سەرچاوەیەکی تەشریع داناوە}.

**سێیەم:** ئەگەر هاوەڵان لەنێوان خۆیاندا ڕاجیا بووبن، تەماشای کردوە کام لە ڕایەکان لە قورئان و سوننەت نزیکترە، ئەو ڕایەی تەبەننیی کردوە، بەڵام لە چوار چێوەی قسەکانی ئەوان نەچۆتە دەر، بەڵام ئەگەر بۆی دەرنەکەوتبێ کامەیان لە قورئان و سوننەت نزیکترە، ڕایە جیایەکانی گێڕاونەوە، بەڵام هیچ ڕایەکی تەبەننیی نەکردوە، گوتوویەتی: فلان هاوەڵ وای گوتوەو فلان وای گوتوە، بەڵام بۆخۆی هیچی نەگوتوە، لەبەر ئەوەی بۆی ساغ نەبۆتەوە کامیان لە قورئان و سوننەتەوە نزیکترە.

**چوارەم:** کاری بە فەرموودەی مورسەل و[2] بێ هێزیش کردوە، ئەگەر لەو بارەوە شتێك نەبووبێ کە پێچەوانەی ئەو فەرموودە مورسەلە یان بێ هێزە بێ.

---

(١) إعلام الموقعين عن رب العالمين، لابن القيِّم، ج١ ص ٧٦-٧٧، ط٣ ٢٠٠٨.

(٢) حەدیسی مورسەل ئەوەیە کە تابعیی یەکسەر دەیداتە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و باسی هاوەڵەکە نەکا.

**پێنجەم:** ئەگەر زۆر ناچار بووبێ، پەنای بردۆتە بەر قیاس، ئەگەر لەو بابەتەدا دەقی بەدەستەوە نەبووبێ و قسەی هاوەڵیش نەبووبێ بەگشتی و، شوێنەوارێکی مورسەلی دەست نەکەوتبێ و، شوێنەوارێکی بێ هێزیشی دەست نەکەوتبێ، ئەوە بەناچاریی پەنای بردوە بۆ قیاس.

ئەگەر تەماشای: ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعیی بکەین، وایان نەکردوە، بۆیەش لەم ڕەوتەدا دەق (نص)و گێڕراوەکان (مرویات) (بەبۆچوونی من) زۆر لە قەبارەی خۆیان زیاتریان دراوەتێ و، وایدەبینم ئەو تەوژمە زێدەڕۆیی (إفراط) ی تێدایە لە دەست گرتنی وشك بە دەقەکانەوە، ئەمەش لەبەرانبەر بەزایەدان (تفریط)ی موعتەزیلەدا لە دەست گرتن بە دەقەکانەوە.

لەولاشەوە دەشتوانین بڵێین: ئەو ڕەوتە بەزایەدانی تێدایە لە حیساب کردن بۆ عەقڵدا، لەکاردانەوەی زێدە ڕۆیی کردنی موعتەزیلەدا، لە پشت بەستن بە عەقڵدا، ڕای ڕاستیش ئەوەیە، هەم دەق لە شوێنی خۆیدا بەکار بهێنرێ، هەم عەقڵ لە جێی خۆیدا سوودی لێ ببینرێ، بەڵام بەتەئکید هەر کاتێك بۆمان دەرکەوت کە ئەو دەقە، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی، یان کردوویەتی، یان دانی پێدا هێناوە، لەوێدا نابێ بەعەقڵ بەرهەڵستیی هیچ دەقێك بکەین، بەڵام شتێك بۆت ساغ نەبووبێتەوە، یان لەگەڵ عەقڵێکی ساغدا تێك بگیرێ، یان لەگەڵ واقیع، یان عیلمدا، تێك بگیرێ، وەك کاتی خۆی گوتمان[1]، دەبێ چاو بەو دەقەدا بگێڕدرێتەوە، بەڵام ئەم ڕەوتە، کەمتر وابووە چاو بەدەقەکاندا بگێڕنەوە، هەر بۆیەش مەزهەبی حەنبەلیی کەمترین شوێنکەوتووی هەیەو، نەیتوانیوە زۆر گەشە بکات، بەڵام تەماشا دەکەین: مەزهەبەکانی دیکە زۆر گەشەیان کردوە، هەر بۆیەش بەشێك لە زانایان (أحمد بن حنبل)یان زیاتر بە فەرموودەناس (محدِّث) ناسیوە، نەك بە شەرعزان (فقیە)!

---

(١) لەتەوەری یەکەم، لە بەشی سێیەمیدا.




## ڕەخنە گرتنی دووان لە شەرعزانانی حەنبەلیی مەشرەب، لە حەنبەلییەکان

لێرەدا قسەی دوو لە زانایانی سەلەفیی دێنم، کە لە بارەی حەنبەلییەکانەوە زۆر بە ئینصافەوە قسەیان کردووە:

١)- یەکێك لەوانە (عبدالرحمن ابن الجوزي)یە، کە یەکێکە لە زانایانی حەنبەلیی مەزهەب، قسەیەکی زۆر بە ئینصافانە دەکات، چونکە تەماشا دەکات، گرفتار بووە بەدەست هەندێ قسەو بیرو ڕایانەوە دەڵێ:

{رأيتُ من أصحابنا مَنْ تكلَّم في الأصول بما لا يصلح ...، فَصنَّفوا كتباً شانوا بها المذهب، ورأيتهم قد نزلوا إلى مرتبة العوام، فحملوا الصفات على مقتضى الحِسِّ، فسمعوا أن الله خلق آدم على صورته، فأثبتوا له صورة ووجهاً زائداً على الذات، وفماً ولهواتٍ وأضراساً وأضواءً لوجهه، وَيَدينِ وأصبعينِ وكفاً وخنصراً وإبهاماً وصدراً وفخذاً وساقينِ ورجلين، وقالوا: ما سمعنا بذكر الرأس! وقد أخذوا بالظاهر في الأسماء والصفات، تسميةً مُبْتَدَعَةً ولا دليل لهم في ذلك من النقل ولا من العقل، ولم يلتفتوا إلى النصوص الصارفة عن الظواهر إلى المعاني الواجبة لله تعالى، ولا إلى إلغاء ما توجِبُهُ الظواهر من

صفات الحدوث}[١]، هەروەها دەڵێ: {لقد شان أبو يعلى[٢] الحنابِلَةَ، شيناً لا يَغْسِلُهُ ماء البحر}[٣].

واتە: لە هاوەڵانمان کەسی وام بینیوە: قسەی کردوە دەربارەی بنچینەکانی دین، کە قسەکەی بەکەڵك نایەت و، هەندێ کتێبیان نووسیون کە مەزهەبی ئیمام ئەحمەدیشیان پێ ناشیرین کردوە، بینیومن کە دابەزیون بۆ پلەی خەڵکی عەوام، {یانی وەك زانایان قسەیان نەکردوە، بەڵکو وەك خەڵکی ئاسایی قسەیان کردوە}، چونکە سیفەتەکانی خوایان دابەزاندوون، بەپێی ئەوەی کە هەستەکان دەیخوازن، بیستوویانە کە هاتوە: {إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَم عَلَى صُورَتِهِ} واتە: خوا ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کرد[٤]، بۆیە هەڵساون وێنەیان بۆ خوای بەرز بڕیار داوە، دەم و چاویان بۆ بڕیار داوەو گوتوویانە: خوا ڕووی هەیەو دیمەنی هەیە، کە زیادن لە زاتی، هەروەها زاریان بۆ بڕیار داوە {گوتوویانە: خوا زاری هەیە} و پووکی هەن و ددانی خرێنەی هەن و، ڕووی خوا پڕشنگی هەیەو، دوو دەستیان بۆ خوا بڕیار داون و، دوو پەنجەیان بۆ بڕیار داون و، لەپە دەستیان بۆ خوا بڕیار داوەو، پەنجە گچکەو پەنجە گەورەیان بۆ بڕیار داوە {لەبەر ئەوەی ئەوانە لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوون و وەك پێشتر گوتمان: دەق مورسەل بێ، یان بێ هێز (ضعیف) بێ، هەر هێناویانەو فەتوایان پێ داوە} هەروەها سینەیان بۆ داناوەو ڕانیشیان بۆ داناوەو، دوو لاق و دوو پێشیان بۆ داناون! بەڵام گوتوویانە: نەمانبیستوە خوا سەری هەبێ! ئنجا لە باسی ناوو سیفەتەکانی خوادا، یەکسەر

---

(١) تأريخ المذاهب الإسلامية، محمد أبو زهرة، ص ١٩٣.

(٢) فەقیهێکی حەنبەلیی مەشهوورە، لە (٤٥٧ك)دا وەفاتی کردوە.

٩٣) تأريخ المذاهب الإسلامية، محمد أبو زهرة، ص ١٩٤.

(٤) ئەمە دوو واتای هەن: یەکەمیان: خوا ئادەمی دروست کرد لە سەر شێوەی ئادەم خۆی، واتە: هەر لەسەر ئەو شێوەیەی دروست کردوەو نەگۆڕاوە.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: خوا ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردوە، کە مەبەست پێی وێنەی و مەعنەوییە، واتە: خوای بەخشەر لە سیفەتەکانی (زانیاریی، ویست، توانا، دیتن، بیستن ....) بەشی ئادەمی داوە.

ڕواڵەتی دەقەکانیان گرتوە کە نە بەڵگەی نەقڵیی لەسەرە، نە بەڵگەی عەقڵیی لەسەرە، تەماشای ئەو دەقانەیان نەکردوە، کە مانایەکان لە ڕواڵەتەکانیان لادەدەن، بەرەو هەندێ واتا کە بۆ خوا پێویستن، هەروەها تەماشای ئەوەیان نەکردوە، کە دەبێ ئەوەی ڕواڵەتی دەقەکان دەیگەیەنێ، کە بریتیە لە واتایەك کە لەگەڵ دروستکراوەکاندا دەگونجێ، نابێ بۆ خوا بەکار بێ[١].

ئنجا {ئیبن و لجەوزی} دەڵێ: ئەبو یەعلا حەنبەلییەکانی بەشێوەیەك ناشیرین کردوە، کە ئاوی بەحرێ ناتوانێ پاکیان بکاتەوە[٢].

بە کورتیی حەنبەلییەکان لە قەزیەی زۆر دەست گرتن بە دەقەکانەوە، بەبێ گەڕانەوە بۆ مانایەکانیان، زۆر تێیان پەڕاندوە.

٢)- (د. عبدالله بن یوسف الجدیع)یش لەو بارەوە دەڵێ: {ولعلّ الإنصاف یوجبُ القولَ: مبالغاتُ بعض الحنابلة لا تَخْفى في الإثبات، فقد صُنِّفَت طائفةٌ من الكتب، بعد زمن الأمام أحمد بن حنبل، منتصرين فيها للسنة في إثبات الصفات، والرد على أهل الأهواء، وفي تلك الكتب حق غالب، لكنها اشتملت على الواهي والمنكر والموضوع من الروايات، كما فيها من العبارات الزائدة في الإثبات ما لا يحل القول به، لفقده صحيح البرهان، وذلك ما سلّط عليهم مخالِفَهم كالأشعرية وغيرهم}[٣].

---

(١) خوا کە دەفەرموێ: {لَیس كمثلِهِ شيء} الشورى- ئیدی تەواو، تۆ نابێ بچی بۆ شتەکانی دیکە، ئەو وشانەش کە بەکار هاتوون: {(یَوْم یُكشَف عن ساق)، (فإنَّك بأعيُننا)، (یَدُ الله)...} ئایا ئەوانە چین؟؟

ئەوانە: دەبێ تەماشای سیاقەکانیان بکەین، ئایا خوا مەبەستی ئەوەیە باسی سیفەتێکی خۆی بکات، کە دەست (ید)ە، یاخود دەیەوێ مانایەکی دیکە بگەیەنێ، بۆ وێنە: (فإنَّك بأعیننا) یانی: تۆ لەژێر چاودێریی ئێمەدای، تۆ دەبێ مانا مەجازییەکەی لێ بگری، چونکە خوا مەبەستی ئەوەیە تۆ لەژێر چاودێریی ئێمەدای، نەك مەبەستی ئەوەبێ باسی چاوەکانی خۆی بکات! هەروەها......

(٢) بۆ زانیارییتان! لەو بەغدایەی ئێستا، کەسی وا هەبووە لە مەزهەبی حەنبەلیی، لەسەر مینبەرێ دانیشتوە و گوتوویەتی: من پێم وایە: خوا ئاوا بە چوار مەشقیی لەسەر عەرش دانیشتوە!

(٣) العقیدة السلفیة في كلام رب البریة، وكشف أباطیل المبتدعة الردیة، ص٤٧-٤٨، ط٣، ٢٠٠٨م.

واتە: ویژدان و دادگەریی وا دەخوازێ کە بڵێین: زێدە ڕۆیی کردنی هەندێ لە حەنبەلییەکان ناشاردرێتەوە، لە ئیسپات کردن و چەسپاندنی سیفەتەکاندا بۆ خوا، لەدوای ئیمام ئەحمەددەوە هەندێ کتێب دانراون کە بە حیساب پشتگیرییان کردوە لە سوننەت، بۆ چەسپاندنی سیفەتان بۆ خواو، بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەوانەی کە شوێن ئارەزووەکانیان کەوتوون، ئنجا لەو کتێبانەدا هەقی زۆر هەیە، بەڵام ڕیوایەتی بێ هێزو بەکەڵك نەهاتووو هەڵبەستراویشیان تێدایە، هەروەها هەندێ عیبارەتیان تێدایە بۆ ئیسپاتی سیفەتەکانی خوا، کە دروست نیە بگوترێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، ئەوەش وای کردوە، ئەوانەی پێچەوانەی ئەوانن، وەك ئەشعەرییەکان و[1] غەیری وانیش قسەیان بەسەریاندا زاڵ بێ.



---

(١) ئەو وای گوتوە، بەڵام ئایا ئەشعەرییەکان بەو شێوەیە بوون، کە هەندێ لە سەلەفییەکان دەیانخەنە ڕیزی تاقمە لادەرەکان؟ نەخێر ئەوە ئەصڵ و ئەساسی نیە، دوایی لە بەشی یازدەیەمدا دێینە سەری.




# ئەشعەرییەکان ( الأشاعرة )

١- پێناسە.

٢- کەش و هەوای تێدا سەرهەڵدانی ڕەوتی ئەشعەریی.

٣- ڕەوتی ئەشعەریی و خستنە ڕووی وێنەیەکی تازەی هاوسەنگی ئیسلام.

٤- (أبو الحسن الأشعري) چۆن توانی ببێتە پارێزەر (محامي) عەقیدەو فیکری جەماوەری مسوڵمانان؟

٥- وتووێژە ناودارەکەی نێوان (أبو الحسن الأشعري) و (أبو علي الجبائي).

٦- کەسایەتییە دیارەکانی ڕەوتی ئەشعەریی.




## پێناسە

ئەم تەوژمە پاڵ دەدرێتە لای دامەزرێنەرەکەی کە بریتیە لە: {أبو الحسن، علي بن إسماعيل بن إسحاق بن سالم بن إسماعيل بن عبدالله بن موسى بن بلال بن أبي برده بن أبي موسى الأشعري (٢٦٠-٣٢٤هـ/ ٨٧٤-٩٣٦م)} ئەبو حەسەنی ئەشعەریی زۆر کتێبی هەن، بەڵام ئەو کتێبانەی کە دوایی دایناون، دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە بۆ {ڕێبازی زۆرینەی مسوڵمانان} گرنگترینیان ئەم دووانەن:

١- (مقالات الإسلاميين)[١].

٢- (الإبانة عن أصول الديانة).

هەندێ لە زانایان دەربارەی ئەو کتێبەی دووەمی دەڵێن: لەلایەن هەرە زۆری ئۆممەتی ئیسلامییەوە تەبەننیی کراوە، چونکە باسی عەقیدەی ئیسلامیی دەکاو، باسی تێگەیشتنی هاوسەنگ دەکات بۆ ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا.

---

(١) هەندێ لە زانایان دەڵێن: یەکەم کەس کە وشەی (الإسلاميين)ی بەکارهێنا (أبو الحسن الأشعري) بووە، لە کتێبی: (مقالات الإسلاميين)دا.

(أبو الحسن) لە شاری (بەصرا) لە دایك بووەو لە (بەصرا)ش پێگەیشتوە، ئەو کاتەش (بەصرا) چەقی هزری ئیسلامیی (معتزلة) بووەو، لە سەرەتای تەمەنیەوە (أبو الحسن) موعتەزیلیی بووە، بەڵام دوایی لە تەمەنی چل (٤٠)ساڵیی بەولاوە واتە: لە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچییدا، وازی لە ڕەوتی موعتەزیلە هێناوەو گوتوویەتی: ئەوە من گەڕامەوە بۆ ڕێبازی {جەماوەری مسوڵمانان} یان: {ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت} کە ئەو کاتە زیاتر بە ڕێبازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ناسراوە، چونکە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل زۆر دژی ڕەوتی موعتەزیلە بووە.




# كەش و هەوای تێدا سەرهەڵدانی ڕەوتی ئەشعەریی

ئەو كەش و هەوا فیكرییەی ئەو گۆڕانكارییەی لە (أبو الحسن الأشعري) دا هێناوەتە دی، كە ببێتە خاوەنی قوتابخانەیەك، ئەوەبووە كە: لەنێوان {ڕەوتی عەقڵگەرا} - كە موعتەزیلە تەبەننییان كردوەو لە ژێر كاریگەریی فەلسەفەی یۆنانییدا بووە، دوای ئەوەی كە كتێبەكانی ئەو فەیلەسووفانە وەرگێڕراونە سەر زمانی عەرەبی لەسەدەی سێیەمی كۆچییدا - و {ڕەوتی دەقگەرا}دا، كە بەوشكیی ڕواڵەتی دەقەكانیان گرتوەو، زیاتر قوتابخانەی حەنبەلیی تەعبیری لێ كردوە، دژایەتییەكی زۆر توند هەبووە، موعتەزیلە گوتوویانە: دەبێ زیاتر پشت بە عەقڵ ببەستین و، ئەوانیش گوتوویانە: نەخێر دەبێ پشت بەدەق ببەستین، وەك گوتم: یەكیان بەملاداو ئەوی دیكەیان بەو لادا تێی پەڕاندوە، بەم شێوەیە لەو كاتەدا، خەتی نێوەڕاست، تا ڕادەیەكی زۆر ون بووە، ئنجا وەك پێشتریش گوتم: زیاتر لە كاردانەوەی یەكدیشدا ئەو تێپەڕاندنە دروست بوودو، لەكاردانەوەی یەكدیدا زیاتر لەیەك دوور كەوتوونەتەوە.

لەو کاتەدا ئۆممەتی ئیسلامیی پێویستیی بە کەسێك بوو کە بیخاتەوە سەر ڕاستە ڕێ و، ئەو تەڕەفە لەیەك دوور کەوتووانە، لێك نزیك بخاتەوە، کە وەك دوو دوژمنی سەرسەختی یەکدی دەکەوتنە بەرچاو، ئۆممەت پێویستیی بەکەسێك بوو، دەربازی بکات لە کەوتنە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانییی، ڕزگاری بکات لە کاریگەریی ئەو قوتابخانەیەی کە دەڵێ: دەبێ بە وشکیی دەست بە دەقەکانەوە بگرین و، حیساب نەکەین بۆ عەقڵ و ڕۆشنبیریی و فیکرو واقیع! ئنجا (أبو الحسن) سوارچاکی ئەو مەیدانە بوو، ئەو کەسەبوو هات ئەو کارەی ئەنجامداو قوتابخانەیەکی میانجیی دروست کرد، کە بتوانێ هەموو تەڕەفەکان بەیەکەوە کۆ بکاتەوە.

باسی
سێیەم

# ڕەوتی ئەشعەریی و خستنە ڕووی وێنەیەکی تازەی هاوسەنگی ئیسلام

قوتابخانەی ئەشعەریی توانی وێنەیەکی تازە بۆ میانجێتیی ئیسلامیی، پێشکەش بکات، کە دوور بێ لە عەقڵگەرایی موعتەزیلەکان و، دووریش بێ لە دەق گەرایی حەنبەلییەکان، خەڵکەکە بەیەکەوە جارێکی دیکە کۆ بکاتەوە، کە زۆربەی هەرە زۆری ئۆممەتیش دواتر لەسەر ئەو ڕەوتە کۆبوونەوە.

## سیماو نیشانە بنەڕەتییەکانی ڕەوتی ئەشعەریی:



١- موعتەزیلە لە بواری بە پاك گرتنی خوای پەروەردگاردا، هێندە ڕۆچووبوون، گەیاندبوویانە ئەو ڕاددەیەی کە خوای بێ وێنە هیچ سیفەتی نین، کە زیاد بن لە زاتی! ئنجا لەبەرانبەری واندا ئەهلی حەدیسیش زێدەڕۆییان کردبوو لەئیسپاتی سیفەتەکانی خوادا، هەتا ئەندازەی وێچواندنی خوا بە دروستکراوەکانی و، تا ئەندازەی جەستاندنی خوا لەلایەن هەندێکیانەوە، وەك لە (إبن الجوزي)شەوە هێنامان.

ڕەوتی ئەشعەریی هات گوتی: نەخێر، {تنزيه بلا تعطيل، وإثبات بلا تشبيه}، خوا بەپاك دەگرین بەڵام سیفەتەكانی لێ پەك ناخەین و، سیفاتەكانیشی بۆ دەچەسپێنین و، تەشبیهیشی ناكەین، واتە: نایجەستێنین.

٢- شەرعزانەكان ئەوانەی سەرگەرمی هەڵهێنجانی حوكمە شەرعییەكان بوون، خۆیان دوور دەگرت لە عیلمی كەلام و دەیانگوت: موعتەزیلە زیاتر سەرگەرمی ئەوەن، ئەوانیش لەبەر ئەوەی ڕقیان لە موعتەزیلە هەڵدەستا، هەر زیاتر خەریكی لایەنی فیقهیی بوون، ئەهلی كەلامیش خۆیان دوور دەگرت لە فیقهو ئوصوڵی فیقهـ و، زیاتر سەرگەرمی لایەنی فیكریی بوون، بەڵام (أبو الحسن) هەم عیلمی كەلام و هەم فیقهی جارێكی دیكە بەیەكەوە كۆ كردەوە، لەسەر بناغەی پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە، چونكە قورئان و سوننەت، وەك چۆن باسی فیقه دەكەن، باسی عەقیدەو تەوحیدیش دەكەن.

٣- لەنێوان سەلەفییە دەقگەرایەكاندا كە هەستیارییان بە عەقڵ هەبوو و دوورییان لێدەگرت و، لە نێوان ئەهلی فەلەسەفە و كەلامدا، كە زیاتر بەلای عەقڵدا دەشكانەوەو، دەقەكانیان پشت گوێ دەخست، قوتابخانەی ئەشعەریی گوتی: نەخێر، ئێمە هەم دەبێ عەقڵ بێنین، هەم نەقڵ بێنین و، لەسەرە بناغەی عەقڵێكی سەلیم لەو نەقڵە تێبگەین و، ئەو نەقڵە بە شێوەیەكی سەلیم دابەزێنین بۆ سەر واقیعی خۆمان.

٤- هەروەها لەنێوان جەبرییەكاندا -كە دەیانگوت: ئینسان هیچی لەدەست نایەت و هیچی بەدەست نیە-و موعتەزیلەكاندا -كە دەیانگوت: ئینسان بەدیهێنەری كردەوەكانی خۆیەتی- قوتابخانەی ئەشعەریی گوتی: نەخێر، نە وایە كە ئینسان هیچی لەدەست نەیەت، وەك جەبرییەكان دەڵێن و، نەواشە كە ئینسان بەدیهێنەری كردەوەكانی خۆی بێ، بەڵكو ئینسان كردەوەكانی خۆی بەدەست دێنێ، ئەوە نیە كە هیچی بەدەست نەبێ، بەڵام ئەوەش نیە كە هەمەكارە بێ.

٥- (مشبِّهة)کان دەیانگوت: خوای بێ هاوەڵ لە بەهەشتێ دەبینرێ بەچاوی سەر، وەك چۆن ئێستا ئێمە شت دەبینین، ئاوا خوا دەبینین، موعتەزیلەکانیش دەیانگوت: خوای بەرزو مەزن لە بەهەشتێش نابینرێ.

بەڵام ئەشعەرییەکان گوتیان: خوا دەبینرێ، بەڵام وەك ئێستا نا، کە ئێمە تەماشای شتێك دەکەین، چونکە ئەوە جەستاندنە، بەڵکو بەشێوەیەك کە نازانین چۆنە؟

٦- دەقگەرایەکان دەیانگوت: قورئان قەدیمە، هەم مانایەکەی، هەم واتاکەی، هەم دەنگەکەی {بۆ زانیارییتان! هەندێك لە حەنبەلییەکان (موصحەف) لە دوو توێی بەرگێکدا بووە، گوتوویانە: پەڕەکانیشی قەدیمن، مەرەکەبەکەش کە پێی نووسراوە، هەر قەدیمە، دەنگەکەش کە ئێمە قورئانی پێ دەخوێنین، هەر قەدیمە!} موعتەزیلەش دەیانگوت: قورئان دروستکراوە.

ئەشعەرییەکان گوتیان: نەخێر، بەڵکو قورئان وەك فەرمایشتی خوا قەدیمەو سیفەتی خوایە، بەڵام ئەو مەرەکەبەی پێی دەنووسرێ و، ئەو دەنگەی کە ئێمە قورئانی پێ دەخوێنین و، ئەو پێستەی لەسەری دەنووسرێ، ئەوانە دروستکراون.

ئەمانە هێڵە گشتییەکانی قوتابخانەی ئەشعەریی بوون.




# (أبو الحسن الأشعري) چۆن توانی ببێتە پارێزەر (مُحامي) عەقیدەو فیکری جەماوەری مسوڵمانان؟

سەر گوزشتەکەی بەم شێوەیە بوو:

**١)**- دایکی ئەبو حەسەنی ئەشعەریی دوای ئەوەی کە بابی مردوە، شووی کردۆتەوە بە (أبو علي الجُبّائي) کە پێشەوای موعتەزیلە بووە لەکاتی خۆیداو، لەنێوان ساڵانی: (٢٣٥-٣٠٣ك/ ٨٤٩-٩١٦ز)دا ژیاوە.

ئنجا (أبو الحسن) قوتابی (أبو علي الجُبّائي) بووەو، لە فیقهیشدا قوتابی (أبو إسحاق المروزي) بووە، کە لە ساڵی (٣٤٠ك)دا، وەفاتی کردوە، ئەویش قوتابی (المُزَني) بووە، کە لە ساڵانی: (١٧٥-٢٦٤ك)دا ژیاوەو (المزني)ش هاوەڵی شافیعیی بووە، کە لە (١٥٠-٢٠٤ك)دا ژیاوە.

**٢)**- لە تەمەنی دە (١٠) ساڵیی، هەتا چل (٤٠) ساڵیی، یەکێك بووە لە ناودارترین بانگخوازانی موعتەزیلە، واتە: سی (٣٠) ساڵ لەسەر فیکری

موعتەزیلە بووەو، چەندان كتێبی لەو كاتەدا نووسیون، زۆر پیاوێكی زەبر دەست و ناودار بووە.

٣)- لە تەمەنی چل (٤٠) ساڵییدا گۆڕانكاریی بەسەردا هات، گۆڕان بەسەر داهاتنەكەشی - وەك لە ژیانەكەیدا - هاتوە، دیتنی دوو خەون بووە، كە بۆخۆی ئاوا باسی كردوون:

**یەكەم:** {لقد وقع في صدري في بعض الليالي شيءٌ مما كنت فيه من العقائد، فقمت وصليت ركعتين وسألت الله تعالى أن يهديني الطريق المستقيم، وَنُمت، فرأيت رسولَ الله صلى الله عليه وسلم في المنام فشكوت إليه بعض ما بيَ من الأمر، فقال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: ((عليك بسنتي)) فانتبهت!!، وعارَضْتُ مسائل الكلام بما وجدت في القرآن والأخبار، فَأَثبتُّه ونبذتُ ما سواه ورائي ظهرياً}[1].

واتە: لە هەندێ شەواندا شەوێكیان دەربارەی ئەو عەقیدەو بیرۆكانەی موعتەزیلە كە لە مێشكمدا بوون هەندێ شتم چووە نێو دڵ {گومانێك، ئیشكالێكی بۆ پەیدا بووە} منیش هەڵسام دوو ڕكات نوێژم كردن و لەخوای بەرز پاڕامەوە، كە ڕێی ڕاستم پێشان بدات، پاشان خەوتم، لەخەوندا پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بینی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! حاڵم ئاوایە، هەندێ ئیشكالم بۆ پەیدا بووە، ئەویش فەرمووی: (عليك بسنتي) واتە: ڕێبازی من بگرە، منیش خەبەرم بۆوەو هەرچی مەسەلەكانی عیلمی كەلام هەن، بەپێی ڕای موعتەزیلە، ئەوانەی كە پێم وابوو لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، تێك دەگیرێن، هەمووم لابردن، تەنیا دەستم بە قورئان و سوننەتەوە گرت و، ئەوانی دیكەم هەموویان لابرد.

**دووەم:** {لقد نمت فرأيت النبـي (صلى الله عليه وسلم) فقال لي: {ماذا صنعت فيما أمرتك به؟} فقلت: قد تركت الكلام ولزمت كتاب الله وسنتك، فقال لي: {ما أمرتك بترك الكلام، وإنما أمرتك بِنُصرة المذاهب المرويّة عنّي فإنّها الحق} فقلت: يا رسول الله! كيف

---

(١) مذاهب الإسلاميين، ج١ ص ٤٨٧-٥٠٤، ط١٩٧١، د. عبدالرحمن بدوي، وتيارات الفكر الإسلامي، د. محمد عمارة، ص ١٦٥-١٦٦.

أَدَعُ مذهباً تصورت مسائله وعرفت أدلته منذ ثلاثين سنة، لرؤيا؟ فقال لي: {لو لا أني أعلم أن الله تعالى يمدك بمدد من عنده، لما قمتُ عنك حتى أبيِّن لك وجوهها}[١].

واتە: خەوتم، لە خەوندا بەخزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەیشتم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەوەی کە فەرمانم پێ کردی {ڕێبازی من بگرە} چیت کرد؟ منیش گوتم: وازم لە هەموو ئەو باس و خواسانەی عیلمی کەلام هێنا، تەنیا دەستم بە قورئان و سوننەتی تۆوە گرت {واتە: بە وشکیی دەقەکانم گرتوە} ئەویش پێی فەرمووم: فەرمانم بەوە پێ نەکردی، کە واز لە زانستی کەلام بێنی، بەڵکو فەرمانم پێکردی کە ئەوەی لەمن گێڕدراوەتەوە لە فەرمایشتەکاندا، تۆ بەهۆی ئەو عیلمی کەلام و فیکرەوە، ئەوە سەربخەی و بچەسپێنی {چونکە دەق هەرپێویستی بە عەقڵ دەکات بیچەسپێنی} منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئنجا چۆن مەزهەبێك کە ماوەی سی (٣٠) ساڵە پرسەکانی لە مێشکمدا جێگیر بوون، بەهۆی خەونێکەوە وازیان لێبهێنم؟ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەگەر نەمزانیبایە کە خوای بەرز لەلایەن خۆیەوە ڕێنمایی تۆ دەکات، هەڵنەدەستام لەلات، هەتا هەموو مەسەلەکانیم بۆ ڕوون دەکردیەوە. {واتە: بەڵام خوای زاناو توانا بۆت ڕوون دەکاتەوەو بۆت ئیلهام دەکات}.

## کاتی ڕاگەیاندنی وەرچەرخانەکەی:

ئێمە ئێستا کە وەك بەسەرهات دەیگێڕینەوە، زۆر ئاسانە، بەڵام بۆخۆی زۆر قورس بووە:

ئەو کاتە جیهانی ئیسلامیی کەوتۆتە نێو دوو ڕیانێکەوە: -وەك پێشتر باسمان کرد- خەڵکێك هەبووە وەك چۆن ئێستا خەڵکێك هەن لەژێر کاریگەریی فیکری

---

(١) مذاهب الإسلاميين، ج١ ص ٤٨٧-٥٠٤، ط١٩٧١، د. عبدالرحمن بدوي، وتيارات الفكر الإسلامي، د. محمد عمارة، ص ١٦٥-١٦٦.

عەلمانیی و لیبراڵیی دان، ئەو کاتەش خەڵکێکی زۆر لەژێر کاریگەریی فیکری موعتەزیلە دابوون، موعتەزیلەش لەژێر کاریگەریی فیکری یۆنانیی دابوون، بەولاشدا خەڵکێکی دەقگەرای وەك حەنبەلییەکان هەبوون، کە تا ڕاددەیەکی زۆر عەقڵیان ئیهمال کردبوو، مەبەستمان خودی ئیمام ئەحمەد نیە، بەڵام دوای وی عەقڵیان بەڕێژەیەکی زۆر ئیهمال کردو، گرنگییان بە لایەنی فیکریی نەدا، ئنجا ئەگەر گرینگییش بە لایەنی فیکریی نەدەی، ناتوانی لەگەڵ واقیعدا بژی، کاریگەرییت نابێ، ئنجا لە حاڵێکی وادا ئەبو حەسەنی ئەشعەریی لە موعانات دابووە، دیارە حەتمەن لەخوا پاڕاوەتەوەو بەس خوا دەزانێ چەند شەوو ڕۆژان خەوی لێ زڕاوە، دوعای کردوەو پاڕاوەتەوەو ئیستیخارەی کردوە، تاکو ئەو دوو خەونەی بینیون، ئنجا دوای ئەوەی کە تەواو دڵی دەچەسپێت، هەندێ لەزانایان دەڵێن: (الإبانة فی أصول الدیانه)ش دەنووسێ، دەچێتە سەر مینبەر لە شاری (بەصرا) کە وتاربێژێکی زۆر مەشهووریش بووە، دەڵێ:

هەرکەسێ ناسیومی، ناسیومی، هەرکەسیش نەیناسیوم، من فڵان کەسی کوڕی فڵان کەسم، چل (٤٠) ساڵە لەسەر فیکری موعتەزیلەم، فەڕوەیەك (عەبا)یەکی لەبەردا دەبێ، دەڵێ: ئێستا چۆن ئەو فەڕوەیە دادەکەنم، ئاوا فیکری ئیعتیزال و ئەو بیرۆکانەی موعتەزیلە واز لێ دێنم و دەگەڕێمەوە بۆ ئەو ڕێبازەی کە پێم وایە ڕاستە، ئەو ڕێبازەی کە پێغەمبەری خواو (صلى الله علیه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەکان و هاوەڵان لەسەری بوون و، پێشەوایانی وەك ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعیی و ئەحمەد لەسەری بوون.




## وتووێژە ناودارەکەی نێوان (أبو الحسن الأشعري) و (أبو علي الجبائي)

دیارە (أبو علي الجبائي) کە مامۆستای بووە، لێی دەپرسێ: تۆ چۆن ئەو گۆڕانکارییەت بەسەردا هاتوە؟

(أبو الحسن)یش دەڵێ: پرسیارێکم هەیە؟

(أبو علي) دەڵێ: فەرموو.

(أبو الحسن) دەڵێ: ئایا یەکێ لە بنچینەکانی موعتەزیلە ناڵێ: (يجب على الله مراعاة الأصلح للعبد؟) واتە: لەسەر خوا واجبە کامە بۆ بەندە چاکترە خوا ئەوەی بۆ بکات؟

(أبو علي) دەڵێ: با.

(أبو الحسن) دەڵێ: باشە سێ برا هەن: یەکیان مسوڵمانە، یەکیان کافرە، یەکیان بە نابالغیی مردوە، ئایا ئەوانە سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟

(أبو علي) دەڵێ: موسوڵمانەکە لە بەهەشتێ دایە، کافرەکەش ئەهلی دۆزەخە، منداڵەکەش ئەهلی دەرباز بوونە، بەڵام ناچێتە پلە بەرزەکانی بەهەشت.

(أبو الحسن) دەڵێ: بۆچی ناچێ؟

(أبو علي) دەڵێ: لەبەر ئەوەی کردەوەی باشی نەبووەو، پێش ئەوەی باڵغ بێ وەفاتی کردوە.

(أبو الحسن) دەڵێ: ئەدی ئەگەر منداڵەکە ڕەخنە لە خوا بگرێ بڵێ: ئەی خوایە! بۆچی منت نەژیاند، تاکو منیش بەهۆی کردەوەی چاکەوە، پلە بەرزەکانی بەهەشتم بەدەست هێنابایە؟

(أبو علي) دەڵێ: خوا پێی دەفەرموێ: بۆتۆ وا باشتر بوو بە نابالغیی بمری، چونکە ئەگەر گەورە بووبای، بە کافریی دەمردی.

(أبو الحسن) دەڵێ: ئنجا کافرەکە بۆی هەیە بڵێ: خوایە! منیشت بۆچی بە نەباڵغیی نەدەمراند، تاکو تووشی جەهەننەمێ نەبووبام؟

ئیدی ئەبو عەلی جوببائیی هیچ قسەی پێ نەما، چونکە ڕاستە، بۆ ئەو کافرە وا باشترە بە نەباڵغیی بمرێ، ئنجا (أبو الحسن) دەڵێ: کەواتە: ئەو فیکرەیەی ئێوە هەڵەیە، خوای بەرزو مەزن ناگونجێ ئێمە شتی لەسەر واجب بکەین، ئنجا لەوێوە ڕەوتەکەی خۆی ئیعلان کرد.




# کەسایەتییە دیارەکانی ڕەوتی ئەشعەریی

کەسانێکی زۆر ناودار هەبوون لە قوتابخانەی ئەشعەرییدا بۆ نموونە:

١- الباقلاني: أبو بكر محمد بن أبي الطيب: ٤٥٣هـ/ ١٠٠٣م.

٢- إمام الحرمين: أبو المعالي الجويني، عبدالملك بن عبدالله بن يوسف: ٤١٩-٤٧٨هـ/ ١٠٢٨-١٠٨٥م.

٣- حجة الإسلام الغزالي، أبو حامد محمد بن محمد بن محمد: ٤٥٠-٥٠٥هـ/ ١٠٥٨-١١١١م.

٤- فخرالدين الرازي، محمد بن عمر بن حسين الرازي: ٥٤٤-٦٠٦هـ.

زۆری دیکەش هەبوون لە زانایان، لەکۆتاییدا من هەر ئەوەتان پێ دەڵێم: ئەوەی کە دەگوترێ: قوتابخانەی ئەشعەریی گرووپێك بوونە وەك موعتەزیلەو ئەوانە، ئەمە هیچ ئەصڵ و ئەساسی نیە، بەڵکو ئەشعەرییەکان چەندان سەدە پارێزەری عەقیدەی {جەماوەری مسوڵمانان}و ئەو ڕەوتە گشتییە بوون کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەری بووە، بەڵێ ڕاستە دوایی هەندێ فیکرو بۆچوونیان هەبوون، کەم و زۆر هەڵەو لادانیان تێدا بووە، بەڵام بە گشتیی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت {جەماوەری مسوڵمانان} بوون.




# ماتوریدییەکان

# ( الماتُريدية )

١- پێناسە:

٢- جیاوازییەکانی نێوان قوتابخانەی ئەشعەریی و قوتابخانەی ماتورێدیی.

**بەرێـــزان!**

بۆ زانیارییتان! ئەم تەوژمە لەم ناوچەیەی ئێمە کەم بووە، زیاتر تەوژمی ئەشعەریی مەشهوور بووە، بەڵام لەو وڵاتانەدا کە پێیان دەگوترێ: (ما وراء النهر)، وەك هیندستان و پاکستان و ئەندۆنووسیاو مالیزیاو ئەفغانستان و ئێران و ...هتد، ئەو قوتابخانەیەی: (أبو منصور الماتريدي) لەوێ زیاتر ڕەواجی هەبووە.

(أبو منصور)یش لەگەڵ (أبو الحسن)دا هاوچەرخ بوون و، لەزۆر لە بیرو بۆچوونەکانیشدا وەك یەك بوون، ئەوانیش هەر خاوەنی فیکرێکی ئیسلامیی میانجیی بوون و، هەوڵیانداوە لایەنە ناکۆك و لێك دوور کەوتووەکان بەیەکەوە کۆبکەنەوە.




## پێناسە

وەك چۆن (الأشعرية) ڕەوتێکی فیکریی و عەقیدەیی بوو کە (أبو الحسن الأشعري) دایمەزراندوە، (الماتريدية)ش بەهەمان شێوە ڕەوتێکی فیکریی و عەقیدەیی بوو، کە (أبو منصور الماتريدي) دایمەزراندوە.

ماتوریدیی دیارە نازناوی: (محمد بن محمد بن محمود)ە، کە ناسراوە بە (أبو منصور الماتريدي) لە (ماتريد) لەدایك بووە، کە گەڕەکێکە لە شاری (سمرقند) و لەساڵی (٣٣٣ك)دا وەفاتی کردوە.

(أبو منصور) چەند کتێبێکی هەن، وەك:

١- (كتاب تأويل القرآن).

٢- (كتاب مأخذ الشرائع).

٣- (كتاب الجدل).

٤- (كتاب الأصول في أصول الدين).

٥- (كتاب رد الأصول الخمسة).

شایانی باسە: {ئەبو مەنصووڕ} لە ڕووی مەزهەبەوە، حەنەفیی بووە.




# جیاوازییەکانی نێوان:
# قوتابخانەی ئەشعەریی و قوتابخانەی ماتوریدیی

لەبەر ئەوەی قوتابخانەی ماتوریدیی لە زۆربەی بۆچوونەکانیدا وەك قوتابخانەی ئەشعەرییەو، تەنها چەند جیاوازییەکی کەم لەنێوانیاندا هەن، بۆیە تەنیا باسی جیاوازییەکانیان دەکەین، ئەگەر نا لە شتەکانی دیکەدا: وەك ئیمان و عەقیدەو، حیساب کردن بۆ عەقڵ و نەقڵ، هەرکامیان بەپێی خۆی، هەروەها لە ڕووی ناوو سیفەتەکانی خواوە، لەڕووی پێناسەی ئیمانەوەو ...هتد، وەك یەکن.

## پێنج جیاوازیی سەرەکیی:

**یـــەك:** ئەبو مەنصووڕی ماتوریدیی دەربارەی ناسینی خوا دەڵێ: دەگونجێ عەقڵ دەرکی ئەوە بکات کە خوا بناسین، چونکە خوا سبحانە و تعالی لە زۆر ئایەتەکانی قورئانی بەڕێزدا، فەرمانی بەوە کردوە کە خوا بناسین کەواتە: دیارە عەقڵ لە توانایدا هەیەو، دەگونجێ خوا بناسێ، بۆیەش ناسینی خوا

لە ڕێی عەقڵەوە لەسەر مرۆڤ پێویستە، واتە: ئەوان دەڵێن: ئەگەر گریمان خوا پێغەمبەرانیشی نەناردبایە، عەقڵ لەسەر مرۆڤی پێویست دەکرد، کە خوا بناسێ، بەڵام ئەشعەرییەکان دەڵێن: نەخێر، عەقڵ دەتوانێ خوا بناسێ، بەڵام هەتا وەحیی و نەقڵ نەیەت، لەسەر مرۆڤ پێویست نابێ خوا بناسێ و، بەندایەتیی بۆ بکات، یانی: ئەبو حەسەنی ئەشعەریی دەڵێ: ناسینی خوا تەنیا بە شەرع پێویست دەبێ، بەڵام ئەبو مەنصوڕی ماتوریدیی دەڵێ: ناسینی خوا بە عەقڵیش و بە نەقڵیش پێویستە.

**دوو:** ئەبو مەنصووڕی ماتوریدیی دەڵێ: شتەکان لە خودی خۆیاندا جوانییان هەیەو ناشیرینییان هەیە، بۆ وێنە: قەتڵ شتێکی ناشیرینە، نوێژ شتێکی جوانە، ئنجا عەقڵ دەتوانێ پەی بەجوانیی هەندێ لە شتەکان بەرێ، هەروەها ناشیرینیی هەندێ لە شتەکانی دیکە، بەڵام ئەبو حەسەنی ئەشعەریی دەڵێ: ئێمە تەنها بەهۆی شەرعەوە دەزانین، ئەو شتە پاکەو چاکەو جوانەو پەسەندەو، دەبێ بکرێ و، ئەو شتەش ناپەسندو خراپەو، دەبێ دووریی لێ بگیرێ.

منیش لێرەدا بۆچوونی ماتوریدییم پێ ڕاستترە، لەهی ئەبو حەسەنی ئەشعەریی، ئیبن و تەیمیەش لێرەدا بەرپەرچی ئەشعەرییەکان دەداتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین: ئەوە یەکێکە لە هەڵەکانی ئەشعەرییەکان کە نکووڵیی دەکەن لەوەی عەقڵ بتوانێ جوانیی و ناشیرینیی شتەکان بزانێ، بەڵام تۆ لەواقیعدا تەماشا بکە! لەدەرەوەی بازنەی مسوڵمانانیش، خەڵك هەیە دەزانێ: دادگەریی شتێکی باشەو، زوڵم خراپەو، یارمەتیی دانی خەڵك باشە، ئەوانە عەقڵ دەتوانێ دەرکیان بکات، بەڵام دەتوانین بڵێین: بەعەقڵ فەرز نابێ پەسندەکان ئەنجام بدرێن و، خۆ لە خراپەکان دوور بگیرێ، تاکو شەریعەت فەرمان دەکا، ئەوەیان دەگونجێ.(١)

**ســێ:** ماتوریدیی دەڵێ: خوای پەروەردگار پاکە، لەوەی شتێك بکات پووچ بێت و، هیچ حیکمەتێکی لەپشتەوە نەبێ و، کردەوەکانی خوا هەموویان بەپێی

---

(١) وەك لە تەوەری دووەمیشدا باسمان کردوە، بڕوانە: بەشی دووەم، بنەمای پازدەیەم: لاپەڕە: ٣٠٢-٣٠٦ / چاپی یەکەم / ٢٠١٨ز.

حیکمەتن، بەڵام خوا سبحانە و تعالی پابەند نیە بەوەوە کە چی چاکە بۆ مرۆڤەکان، ئەوە بکات، یان چی چاکترە، وەك موعتەزیلە گوتوویانە، چونکە هەرچی بیەوێ دەیکات و، دەست بەستراو نیە، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە موعتەزیلە ئەوە لەسەر خوا بە پێویست دەزانن، بەڵام ئەبو حەسەنی ئەشعەریی دەڵێ: کردەوەکانی خوا (تعلیل) هەڵناگرن، یانی: ناگونجێ بڵێی: خوا بۆیە ئەو فەرمانەی کردوە، چونکە ئەو حیکمەتەی تێدایە، یان بڵێی: بۆیە ئەوەی فەرمووە، لەبەر فلان ئامانجە، ئەمەش لەبەر ئەوەی خوا لێی ناپرسرێ لەوەی دەیکا، بەڵام مرۆڤەکان لێیان دەپرسرێ!

بەڵام من لێرەشدا ڕای ماتوریدییم پێ ڕاستە، چونکە ئەوە زیاتر لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێ، کە کردەوەکانی خوا هەموویان ئامانج و حیکمەتیان لەپشتە، هەرچەندە ئامانج و حیکمەتەکە پەیوەندیی بە خواوە نیە سبحانە و تعالی، دەبێ ورد بنەوە لە شتەکان! ئەبو حەسەنی ئەشعەریی بۆیە دەڵێ: ئەگەر بڵێین: خوا بۆیە ئەو کارەی کردوە، تاکو ئەو ئامانجە بێنێتە دی، کەواتە: خوا پێویستیی بەو ئامانجەیە، ئەویش وردی بیر لێ کردۆتەوە، بەڵام بەوە لەمە دەربازمان دەبێ، کە بڵێین: خوای کارزان بۆیە دەفەرموێ: وا بکەن، یان ئەو کردەوەیەی بۆیە کردوە، لەبەر ئەوەی ئامانجێك دێتە دی کە پەیوەستە بە دروستکراوەکانەوە، ئەگەرنا خوای بەرزو مەزن بێ نیازە لەوەی ئامانج بهێنێتەدی، بەڵام خوا بەبەزەییە، بەخشندەیە، میهرەبانە، ئەو ئامانجانە دەهێنێتە دی کە مرۆڤەکان لێیان بەهرەمەند دەبن، ئەوە هیچ زیانێکی تێدا نیەو، هیچ ئەوە ناگەیەنێ کە خوای تاك و پاك پێویستیی بە غەیری خۆی هەیە.

لێرەدا دەتوانین چەند وێنەیەك بهێنینەوە:

أ- ئەشعەرییەکان دەڵێن: دەگونجێ خوا خەڵك دروست بکات و ئەرکیشیان نەخاتە سەرشان، بەڵام ماتوریدییەکان دەڵێن: ئەوە ناگونجێ و خوای بەرز مادام خەڵکی دروست کردوە، ئەرکیشیان دەخاتە سەرشان، حیکمەتی خوا وا دەخوازێ، ئەدی بۆچی دروستیان دەکات؟! ئەشعەرییەکان دەڵێن: نا، ئەگەر دروستیان بکات و

هیچ ئەرکیشیان نەخاتە سەرشان و هیچ پێغەمبەرێکیشیان بۆ نەنێرێ، هیچ شتێك ڕوو نادات، بەڵام ماتوریدییەکان دەڵێن: نا، کاری بێ حیکمەت و کرداری بێ ئامانج، لە خوا ناوەشێتەوە.

لێرەش قسەی ماتوریدییەکانم پێ ڕاستە.

ب- ئەشعەرییەکان بە گریمانەی عەقڵیی دەڵێن: دەگونجێ خوا سبحانە و تعالی کەسێك کە فەرمانبەریی بۆ دەکات، سزای بدات و، کەسێك کە سەرپێچیی لێ کردوە، پاداشتی بداتەوە، ئەوە بە گریمانەی عەقڵیی، نەك گریمانەی شەرعیی، بەڵام ماتوریدیەکان دەڵێن: ئەوە پێچەوانەی حیکمەتە، خوا شتی وا ناکات.

کە بە بۆچوونی من قسەی ماتوریدییەکان ڕاستەو، ئەوە زیاتر لەگەڵ عەقڵی سەلیمدا دەگونجێ، بەڵێ خوا هەموو شتێکی لەدەست دێ، بەڵێ ویستی خوا ڕەهایەو هیچ کۆت و بەندی لەسەر نیە، بەڵام ویستی خوا لەگەڵ ڕەحمەتی خوا، لەگەڵ زانیاریی خوا، لەگەڵ حیکمەتی خوا، ئەو سیفەتانەی خوا، هەموویان پێکەوە کار دەکەن، ئەوە نیە بڵێی: دەسەڵاتەکەی دووربێ لە حیکمەتەکەی، یاخود خواست و ویستەکەی، دووربێ لە زانست و میهرەبانییەکەی، بەڵکو سیفەتەکانی خوا هەموویان پێکەوەن.

ج- ئەشعەرییەکان دەڵێن: لەڕووی عەقڵییەوە دروستە خوای پەروەردگار بەڵێن بداو نەیهێنێتە دی، چونکە خوا نابێ هیچ شتێکی لەسەر پێویست بێ! کە مەسەلەکە هەمووی بەرگریی کردن بووە لە زانیاریی و دەستەڵاتی خواو، ڕەهایی ویستی خواو، زیاتر بۆ بەرپەرچدانەوەی موعتەزیلەو مورجیئە وایان گوتوە، چونکە ئەوان گوتوویانە: لەسەر خوا پێویستە ئەو بەڵێنانەی داونی، بیانهێنێتەدی، هەڕەشەکانیش کە کردوونی، بیانچەسپێنێ، مورجیئەش گوتوویانە: خوا بۆی هەیە پاداشتی کەس نەداتەوەو، سزای کەس نەدات، وەك کاتی خۆی باسمان کرد، بەڵام ئەشعەرییەکان لەڕووی گریمانەی عەقڵییەوە گوتوویانە: دەگونجێ خوای پەروەردگار بەڵێنەکانی خۆی نەهێنێتە دی، بەڵام ماتوریدییەکان دەڵێن: نەخێر، مادام خوا بەڵێنی داوە، بەپێی حیکمەتی خۆی، بەڵێنەکانی خۆی دەهێنێتە دی.

بە دڵنیایی منیش قسەی ماتوریدییەکانم پێ ڕاستترە، نەك لەبەر ئەوەی خوای کارزان ناتوانێ بەڵێنەکانی بهێنێتە دی، بەڵکو لەبەر ئەوەی خوای کاربەجێ خاوەنی هەموو سیفەتێکی باشەو، بێ بەڵێنییش، سیفەتێکی خراپەو لەخوا ناوەشێتەوە.

**چوار:** ئەبو حەسەنی ئەشعەریی بڕوای بە وەدەستهێنان (کسْب) هەیەو، موعتەزیلەکان دەیانگوت: ئینسان کردەوەکانی خۆی بەدی دێنێ، دەیانخوڵقێنێ و، جەبرییەکان دەیانگوت: خوا کردەوەکانی بۆ دەخوڵقێنێ، ئەبو حەسەنی ئەشعەریی ویستوویەتی هێڵێکی نێوەڕاست بگرێ، گوتوویەتی: ئینسان نە کردەوەکانی خۆی دەخوڵقێنێ، نە ئەوەشە هیچیی لەدەست نەیەت، بەڵکو بەدەستیان دێنێ، ئنجا ئەبو مەنصووری ماتورێدییش هەروا دەڵێ، بەس جیاوازییەکەیان ئەوەیە: ئەبو حەسەنی ئەشعەریی دەڵێ: وەدەست هێنان (کسب) ی مرۆڤ بۆ کردەوەکانی، لەگەڵ کردەوەی خوادا، کە بریتیە لە دروستکردن (خلق)، بەیەکەوەن، یانی مرۆڤ هەڵیدەبژێرێ و، خوای پەروەردگار بۆی دەخوڵقێنێ، بەبێ ئەوەی مرۆڤ کاریگەریی هەبێ، لە بەدیهێنانی کردەوەکانیدا، بەڵام ماتوریدییەکان دەڵێن: مرۆڤ کردەوەکانی خۆی وەدەست دێنێ، بە هێزێك کە خوا پێی داوەو ئەو کردەوەیە خۆی پەیدای دەکات، خەڵقی ناکات، بەڵام کاریگەریی لەسەری هەیە، کە ئەوەی ماتوریدییەکان هێڵێکی نێوەڕاستە لەنێوان موعتەزیلەو ئەشعەرییەکاندا، بەڵام زیاتر بەلای موعتەزیلە دایە[1].

**پێنج:** ماتوردییەکان دەڵێن: خوای بێ هاوەڵ ئەو سیفەتانەی کە هەینی، بۆی دەچەسپێنین، بەڵام سیفەتەکانی جیا نین لە زاتی، بەڵام ئەشعەرییەکان دەڵێن: سیفەتەکانی خوا، غەیری زاتی خوان، ئنجا لێرەدایە ئەو قسەیەی کە لە کتێبەکانی عیلمی کەلامدا هەیە، دەڵێ: {لا هي هو، ولا هي غيره}، سیفەتەکانی خوا، عەینی زاتی خوا نین، بەڵام لێی جیاش نین، بە ئیعتیبارێك عەینی زاتی خوا نین، کە خوا سیفەتەکانی نەبن، بەڵام جیاش نین، ئەوەی کە گوتوویانە: فرە ئەزەلیی {تعدد القدماء} ڕوودات، بەڵکو سیفەتەکان لەنێو زات دان[2].

---

(١) لە بابەتەکانی پێشووتردا لەو بارەوە بۆچوونی خۆم گوتوە، کە لە هی هەموویان جیاوازە.

(٢) ئەم چەند جیاوازییە لە کتێبی: (تأريخ المذاهب الإسلامية)ی محمد أبو زهرة، ص (١٧١-١٨٣)دا، هاتوون.

براو خوشكانی خۆشەویست! من پێم وایە ڕێی ڕاست و ساغ و بێ گرێ و گۆڵ هەر ئەوەیە كە: ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە خوای پەروەردگارەوە هەیە، دەقەكانی چییان گوتوە، هەروا بڵێین، چونكە سیفەتەكانی خوا، زۆر لەوە گەورەترن لە عەقڵی ئێمەدا جێیان ببێتەوەو چۆنیەتییەكەیان دەربخەین.




# باطینییەکان ( الباطــنیة )

١- پێناسە.

٢- دامەزرێنەری جووڵانەوەی (باطنیة) کێ بووە؟

٣- پێڕو تاقمە (باطنیة) سەرەکییەکان.

٤- کورتە هەڵسەنگاندنێکی گرووپە باطینییەکان.




## پێناسە

(باطنية) کێن و ئەو زاراوەیە یانی چی؟

ئێمە سێ دانە لە پێناسەکانی شارەزایان بۆ (باطنية) دێنین:

١- (د. محمد عمارة) بەم شێوەیە پێناسەی باتینییەکان دەکات: {الباطنية: مصطلح عام، -نسبة إلى الباطن المقابل للظاهر -يُطْلَقُ على العديد من الفرق الإسلامية وغير الإسلامية، التي لم تقف في قضية التأويل عند حدود الإعتدال، وإنما ذهبت فيها مذاهب الغُلوّ والتعميم والإطلاق.

فالتأويل هو: إخراج دلالة اللفظ من الدلالة الحقيقية، إلى الدِّلالة المجازية من غير أن يُخِلَّ ذلك بعادة لسان العرب في التجوُّز[١]، لكن الباطنية قد تميَّزوا عن الفرق المعتدلة في الموقف من التأويل، عندما لم يجعلوه ضرورة واستثناءً، وإنما جعلوه القاعِدَةَ، والأصلَ ذات العموم والإطلاق، لقد رأوا أن لكل ظاهر باطناً ولكل تنزيل تأويلاً}[٢].

---

(١) ئەم قسەیەی لە (إبن رشد)ەوە هێناوە، کە لەنێوان ساڵانی: (٥٢٠-٥٩٥ك)دا ژیاوە.

(٢) إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات، ص ١٤٦.

واتە: باتینییەت زاراوەیەکی گشتییە پاڵ دەدرێتە لای - باطن: پەنهان پێچەوانەی: ظاهر - ئاشکرا -، ئەم زاراوەی باتینییە وشەیەکە بەکار هاتوە بۆ زۆر لە پێڕو تاقمە ئیسلامیی و غەیرە ئیسلامییەکانیش، کە لەمەسەلەی تەئویل کردندا لە خەتی نێوەڕاست لایانداوەو، سەریان چۆتە تێپەڕاندن و بەرەهایی تەئویل کردن و گشتاندنی تەئویل.

تەئویل بریتییە لەوەی بێژەیەك لە دەلالەتی ڕاستەقینەو ئاشکرای خۆی، لابدەی بۆ دەلالەتی مەجازیی، بەبێ ئەوەی لەگەڵ عادەتی زمانی عەرەبییدا تێك بگیرێ، {واتە: دەبێ زمانی عەرەبیی تەحەمولی ئەوە بکات، نەك شتێ: بڵێی: پێچەوانەی زمانی عەرەبی بێ}.

بەڵام باتینییەکان بەوە جیابوونەوە لەو پێڕو تاقمە هاوسەنگانەی کە تەئویلیان کردوە {چونکە هیچ کۆمەڵێك نەبووە کەم و زۆر تەئویل نەکا}، کە تەئویل کردنیان نەکردوە بە شتێکی ناچاریی و حاڵەتێکی هەڵاواردن، بەڵکو کردوویانە بە بنچینەو ئەصڵ، کە بە گشتیی و ڕەهایی گوتوویانە: هەموو دەقێك وەك چۆن مانایەکی ڕواڵەتیی هەیە، مانایەکی شێرراوەشی هەیەو، هەموو تەنزیلێك {هەموو ئایەتێك کە خوا ناردوویەتە خوار} دەبێ تەئویل بکرێ.

دواییش باسی دەکەین کە مەبەستیان هەبووە لەوە.

٢- سەرچاوەیەکی دیکەش لە پێناسەی (باطنية) دا دەڵێ:

{الباطـنية: إسم يطلق على: (أ) الإسماعيلية في العصور الوسطى، بسبب تركيزهم على الباطن، والباطن يعني: ما وراء ظاهر التنزيل.

(**ب**) ثم يطلق بدرجة أقل خصوصية على أيِّ فردٍ يَرْمي باطِّراحه للمعنى الظاهر لمثل هذه النصوص مُؤْثِراً الباطن... ويمكن وصف منهج الباطنية في عبارات من أفكار أربعة جوهرية:

١- باطن. ٢- تأويل. ٣- خاص وعام. ٤- تقية، وكل منها يُلْتَزَمُ به سلفاً، أياً كان المذهب الذي يُدعى إليه}[1].

واتە: (باطنية) ناوێکە (أ) بەکار هێنراوە بۆ ئیسماعیلییەکان لەسەدەکانی نێوەڕاستدا، بەهۆی ئەوەوە کە زۆر جەختیان کردۆتەوە لەسەر دیوی پەنهانی دەقەکان، واتە: پشتی ڕواڵەتی دەقەکان.

**(ب)** هەروەها وشەی (باطنية) بە پلەیەکی کەمتر بەکار هێنراوە، بۆ هەر کەسێك کە مانای ڕواڵەتیی دەقەکان لادەباو مانا پەنهانەکەیان هەڵدەبژێرێ و، دەگونجێ میتۆدی (باطنية) لەچوار بیرۆکەدا کورت بکرێتەوە: (١- پەنهان، ٢- تەئویل، ٣- تایبەت و گشتی، ٤- تەقییە)، ئنجا هەرکامێك لەو پایانە پابەندیی پێوە دەکرێ، ئەو ڕێچکەیەی بۆی بانگ دەکرێ، هەرچییەك بێ.

٣- سەرچاوەیەکی دیکەش لەو بارەوە گوتوویەتی:

الباطـنية: {الباطنية: {وهي من فرق الشيعة ...، ويُطلق لقب الباطنية على الإسماعيلية بشكل خاص، وتَتَلَخَّصُ أفكار الباطنية في: التأويل، والحلول، والتناسخ:

التأويل: هو صرف اللفظ عن المعنى الراجح إلى المعنى المرجوح، لدليل يقترن به، فإذا لم يكن اللفظ محتملاً للمعنى الذي حمل عليه، ولم يُبَيِّن المتأوَلُ الدليل الذي حَمَلَهُ على ذلك، كان تأويلاً فاسداً بل تلاعباً بالنصوص.

والتأويل الفاسد هو الذي اعتمده الغلاة مُدَّعين أن للقرآن ظاهراً وباطناً، وأنّ المراد منه باطنه دون ظاهره، وهكذا أخذ الغلاة يُحَرِّفون اللفظ القرآني عن معناه الذي سيق له، إلى معاني تتفق مع عقيدتهم وتنسجم مع أهوائهم، ونزعاتهم وكان التأويل من أهم أسلحة الغلاة في التَحَلُّلِ من القيم الأخلاقية والشعائر الدينية، وفي إشاعة الإباحية والإلحاد.

والحلول: وهو من أخطر أفكار الغلاة ويريد به: حلول الإله ذاته أو روحه، جزءاً أو كلاً، في البشر، وقد اعتقد الغلاة بألوهية الأنبياء والأئمة، ويعتبرون الصلاة طاعة

---

(١) دائرة المعارف الإسلامية، ج٥ ص ١٥٣٤.

للشخص.. والزكاة عبارة عن إيصال كل ما يفيض من مؤونة الإنسان وعياله إلى الإمام..، ويقولون: أن الصوم هو عبارة عن السكوت عن كل ما يفعله الإمام، فليس فيه عيب... ويقولون: أن الحج عبارة عن زيارة الإمام، وأحلّوا جميع المحرمات..}[1].

واتە: (باطنية): لە تاقم و گرووپەکانی شیعەن. نازناوی (باطنية) بە تایبەت بۆ ئیسماعیلییەکان بەکاردێ و بیرۆکەکانی باطینییەکان لە سێ شتاندا کورت دەبنەوە:

تەئویل، چوونە نێو (حلول)، تەناسوخ.

**تەئویـل:** لادانی وشەیەکە لەمانایەکی لە پێشتری بۆ مانایەکی دوورتر، بەهۆی نیشانەیەکەوە، ئنجا ئەگەر بێژەکە ئەو مانایەی نەگەیاند کە لێی گیراوەو، بابای تەئویلکەر بەڵگەی نەخستە ڕوو لەسەر هەڵبژاردنی ئەو مانایە، ئەوە تەئویلێکی بێ کەڵکە، بەڵکو گاڵتە کردنە بە دەقەکان.

تەئویلی بێ کەڵکیش بەردەوام ئەو ڕۆچووە لە دین دەرچووانە پەنایان پێ بردوە کە گوتوویانە: قورئان ئاشکراو پەنهانی هەیەو، مەبەست پێی پەنهانەکەیەتی نەك ئاشکرایەکە! ئیدی بەو جۆرە تێپەڕێنەرەکان وشەکانی قورئانیان لەو مانایانەی بۆیان هاتوون لاداون، بەرەو چەند واتایەکی گونجاو لەگەڵ ئارەزووو ویستەکانیان.

هەروەها تەئویل گرنگترین چەکی لە دین دەرچووەکان بووە، بۆ خۆ دەرباز کردن لە بەهایەکانی ئیسلام و دروشمە ئاینییەکان و، بڵاو کردنەوەی بێ بەندو باریی و ئیلحاد.

**حـــلوول:** لە ترسناکترین بیرۆکەکانی ڕۆچووە زەندیقەکان بووەو، مەبەستیان پێی هاتنە نێوی خوا یان بەشێکی بووە بۆ جەستەی مرۆڤ، ئنجا ئەوانە بڕوایان بە پەرستراوێتیی پێغەمبەران و پێشەوایەکان بووەو پێیان وابووە، نوێژ کردن فەرمانبەریی کەسێکەو، زەکاتیش گەیاندنی زیادە خەرجیی و مەسرەفی ماڵ

---

(١) موسوعة الأديان في العالم، و الفرق الإسلامية، ص ١١٩، ١٢٠,

و خێزانە بۆ پێشەواو، گوتوویانە: ڕۆژوو گرتن بریتیە لە بێدەنگیی لە بەرانبەر هەر شتێکدا کە پێشەوا دەیکات و، حەج کردنیش سەردانکردنیەتی و، سەربارەش هەرچی قەدەغە کراوە، حەڵاڵیان کردوە....

**تەناسـوخ:** (تناسخ)یش ئەوەیە کە ڕووحی ئەو مرۆڤەی دەمرێ، بچێتە نێو ڕووحی کەسێکی دیکە، یان ژیانداریێکی دیکە، یان ڕووەکێك، بەپێی ئەو کردەوانەی کە کردوونی، بە حیساب ئەگەر کردەوەی باشی کردبێ، دەچێتە نێو بەدەنی کەسێکی باش، یاخود ژیانداریێکی باش و، ئەگەر خراپی کردبێ، دەچێتە نێو جەستەی ئینسانێکی خراپ، یاخود ژیانداریێکی خراپ.

**دوو وشەی دیکەش لە (باطنیة)دا بەکاردێن:**

**أ- الغنوصية:**

{نسبة إلى غنوصيص -أي المعرفة- وهي نزعة فلسفية، قديمة قائمة على التلفيق بين الفلسفة والدين والمزج بين المعارف المختلفة، وهي تسلك للخلاص سبيل المجاهدة الفردية والتجربة الروحية الذاتية التي ترتقي بصاحبها على طريق الفناء في المطلق والكل، وليس طريق الشريعة العامة، عقلية كانت أو سمعية، هذه الشريعة}[(١)].

واتە: {غونوصییەت} پاڵ دەدرێتە لای {غونوصیص} کە وشەیەکی لاتینییە، واتە: زانست، ئەویش بریتیە لە ڕێڕەوێکی فەلسەفیی لەمێژینە، کە لە ئەنجامی ئاوێتە کردنی فەلسەفەو دین و چەند زانستێکی جۆراو جۆردا، پێك هاتوە، کە مەبەست پێی ئەوەیە مرۆڤ دەبێ لە ئەنجامی ئەزموونی ڕووحیی خۆیدا، بەرز بێتەوە (بەحیساب لە خوا نزیك بێتەوە) هەتا دەگاتە حاڵەتی فەنا {واتە: لەخوادا فەوتاو ببێ، نەمێنێ} نەك لەڕێگای شەریعەتەوە، ئنجا ئەو شەریعەتە چ عەقڵیی بێ، چ سەمعیی بێ.

---

(١) إزالة الشبهات ، ص ٥٩٤.

ب- الأفلاطونية الجديدة:

ئەمە فەلسەفەی (أفلوطين) بووە، (٢٠٥-٢٧٠)ز، کە فەیلەسووفێکی یۆنانیی بووە لە (مصر) لەدایك بووەو، لە شاری ئەسکەندەرییە گەورە بووە، دوایی چووە بۆ ڕۆما، ژیانی خۆی لەوێدا بردۆتە سەر. فەلسەفەی ئەفلۆتین، تەفسیری بوون دەکات بە بیردۆزەی هەڵڕژان (فیض)، دەڵێن: خوا سبحانه و تعالى {ئەوان جاری وا هەیە دەڵێن: خیر، واحد، مطلق ..} بیر لەخۆی دەکاتەوەو، لە ئەنجامی بیر کردنەوە لەخۆیدا، کە خۆی فام دەکات، لەمەوە کائینێکی یەکەم پەیدا دەبێ، پێی دەگوترێ: عەقڵ، عەقڵیش بیر لەخۆی دەکاتەوەو بیر لەخواش دەکاتەوە، واتە: عەقڵ هەم دەبێتە (عاقل)، هەم دەبێتە (معقول) کەواتە: (متعدِّد)ە، بەڵام خوا یەکە، ئنجا ئەو عەقڵە لە ئەنجامی بیر لەخۆ کردنەوەیدا، نەفسی گشتی، لێ پەیدا دەبێ، کە دنیا پڕ دەکا، دوایی لەوەوە خڕۆکەکان پەیدا دەبن، ئنجا لەوەوە نەفسەکانی بەشەریی پەیدا دەبن.

ئنجا هەندێکیان دەیگەیەنن بە دە (١٠) عەقڵ (نظرية العقول العشرة)ی پێ دەڵێن!

گرنگ ئەوەیە بزانن کە (باطنية) کارتێکراو بووە، قوتابخانەی غنووصیی و ئەفلاطوونیی نوێ.




## دامەزرێنەری جووڵانەوەی (باطنية) کێ بووە؟!

با لەو بارەوە سەرنجی قسەو بیرو ڕای ژمارەیەك لە شارەزایان بدەین:

١)- (الشهرستاني) گوتوویەتی: (عبدالله بن سبأ) پێی وابووە (علي) خوا لێی ڕازی بێ نەمردوە، چونکە بەشێکی خوای تێدایەو، ناگونجێ بخرێتە ژێر ڕکێفەوە، ئنجا ئەوە خۆیەتی کە لە هەوردا دێ و، هەورە تریشقە دەنگی و برووسکە زەردەخەنەیەتی و، دواتر دادەبەزێتە سەر زەوی و، وەك چۆن پڕ کراوە لە ستەم، پڕی دەکاتەوە لە دادگەریی.

٢)- (إبن عساكر) گوتوویەتی: (إبن سبأ) جوولەکە بووە خۆی بە مسوڵمان دەرخستوەو بە وڵاتانی مسوڵماناندا گەڕاوە، تاکو لە فەرمانبەریی حوکمڕانان لایان بدات و، ئاژاوەیان بخاتە نێوان[1].

٣)- (المقريزي): نووسیویەتی: لە (إبن سبأ)ەوە سەرجەم ڕۆچووەکانی ڕافیزە پەیدابوون و، ئەو قسەیەش کە دەڵێ: بەشێکی خوا دەچێتە جەستەی ئیمامەکانەوە، لەوەوە داکەوتوە.

---

(١) تهذيب تأريخ ابن عساكر، لابن بدران، ج٧، ص٤٢٧، ط١.

٤)- (البغدادي): گوتوویەتی: مێژوو نووسان دەڵێن: ئەوانەی بناغەی (باطنية) یان دانا لە ڕۆڵەکانی مەجووسییان بوون، بەهۆی ئەوەوە کە ئارەزوو مەندی ئایینی پێشووانیان بوون و، لە ترسی شمشێرەکانی مسوڵمانانیش نەدەوێران ئاشکرای بکەن، ئیدی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) بەپێی بنەمایەکانی خۆیان تەئویل دەکردن[1].

٥)- (اليماني): نووسیویەتی: دەرکەوتنی (عبدالله بن ميمون القداح) لە ساڵی دووسەدو حەفتاو شەش (٢٧٦)ی کۆچییدا بوو، فێڵ و پیلانی لە دژی مسوڵمانان گێڕان و ئاژاوەو خراپەی بۆ پەیدا کردن[2].

٦)- (إبن القيم) نووسیویەتی: پاشان مەهدی مولحید (عبيدالله بن ميمون القداح) دەرکەوت، کە باپیرەی جوولەکە بوو، لە ماڵێکی مەجووسیی بوو، بەدرۆو ساختە خۆی پاڵدایە لای بنەماڵەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و، لافی ئەوەی لێدا کە ئەو مەهدییەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موژدەی هاتنی داوە! ئیدی دەسەلاتی پەیدا کردو زاڵ بوو و کارەکەی پەرەی ستاند، تاکو وەچە مولحیدەکەی و مونافیقەکان، کە لە هەموو کەس دژایەتییان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) بێزراتر بوو، دەستەڵاتیان ڕانا بەسەر وڵاتانی (مغرب) و (مصر) و (حجاز) و (شام)دا[3].

---

(١) الفرق بين الفرق، للبغدادي، ص ١٨.

(٢) كشف أسرار الباطنية، لليماني، ص ١٧.

(٣) المنار المنيف، ص ١٥٤.




## پێڕ و تاقمە (باطنیة) سەرەکییەکان

تاقم و پێڕە (باطنیة)کان زۆر جۆراو جۆر بوون، بەڵام ڕەنگە سەرەکییەکانیان ئەم چواردەیە بووبن، کە هەر کامێکیان لە بڕگەیەکدا دەتوێژینەوە:

### ١- الإسماعیلیة:

دوو پێناسەیان لەبارەوە دێنین:

**یەکەم:** {ئیسماعیلییەکان لە پێڕو تاقمی شیعەی دوازدە ئیمامیی جیا بوونەوە، کاتێك ڕاجیایی کەوتە نێوانیان، کە ئایا لەدوای جەعفەری صادیق کێ پێشەوابێ؟

١- (موسی الکاظم) کە کوڕی جەعفەری صادیق بووە.

٢- یاخود ئیسماعیل کە ئەویش کوڕی جەعفەری صادیق بووە؟

ئیسماعیلییەکان گوتیان: ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر ئیمامە، چونکە گەورەتر بووە لە (موسی الکاظم) و لە ساڵی (١٤٣ك)دا، پێش بابی بە پێنج ساڵان وەفاتی کردوە، مادام ئەو کوڕی گەورەی بابی بووە، دەبێ ئەو ئیمام بێ.

شیعەی دوازدە ئیمامییش گوتیان: نەخێر دەبێ (موسى الكاظم) بێ، کە لە ساڵی (١٨٣ک)دا، وەفاتی کردوە، واتە: لەدوای بابی، بابی لە (١٤٨ک)دا وەفاتی کردوە.

{ئنجا تەماشا بکەن! ئینسان کە لە عەقڵ و مەنتیق و لە ڕاستە ڕێی شەریعەت دوور دەکەوێتەوە، تووشی شتی چەند سەرسوڕهێنەر دەبێ! کوڕێك پێنج ساڵان پێش بابی مردبێ، چۆن دەبێتە ئیمام؟ هەر ئەصڵەن شیعەی دوازدە ئیمامییش پێم وایە (جعفر الصادق) لەوە عاقڵتر بووە بڵێ: من ئیمامی مسوڵمانانم! بەو واتایەی ئەو جێنشینی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)! ئاخر ئەوە چ ئیمامێکە خۆی بشارێتەوەو، هیچی بەدەست نەبێ؟ خەلیفەو حوکمڕان و ئیمام ئەو کەسەیە مسوڵمانان هەڵیبژێرن! بۆیە من پێم وایە هیچ کام لە ئیمامەکانی شیعە، ئەو جۆرە بیر کردنەوەیەی ئێستا لەنێو شیعەدا باوە، کە گوایە: ئەوانە خۆیان بە ئیمامی مسوڵمانان زانیوە، پێم وایە هیچیان وایان بیر نەکردۆتەوە.

بۆ وێنە:

جەعفەری صادیق لەگەڵ ئەبو حەنیفەو مالیکدا هاوچەرخ بوون، پێکەوە دانیشتوون و وتووێژیان بووە، ئیدی جەعفەری صادیق پێی نەگوتوون: دەبێ بەیعەت بەمن بدەن! بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانە لەبنەماڵەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون و، بنەماڵەو خزمانیشی زۆر چەوساونەتەوە لەلایەن هەر کام لە ئومەوییەکان و عەبباسییەکانەوە کە ئامۆزای خۆشیان بوون و، لەئەنجامی ئەوەشدا کە خەڵك دڵسۆز بوونە لەگەڵیان و لێیان ئالاون، ئنجا ڕەنگە خەڵکی قۆڵبڕو ساختەچیشیان تێدا بووبێ، کە ئەو جۆرە قسانەیان بڵاو کردبێتەوە، ئەگەرنا (جعفر الصادق) گوتبێتی: ئیمامم، ئاخر ئیمامی کوێی و ئیمامی کێی، کاتێك خەڵك بەقسەت نەکا؟ نەخێر ئەویش یەکێك بووە لەو زانایانەی لەنێو مسوڵماناندا بوون}[1].

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

ئنجا ئیسماعیلییەکان بوونە زۆر پێڕو تاقم، هەمووشیان (باطني) بوون، بۆ وێنە: ئایەتێك هەیە مانا ڕواڵەتییەکەی دیارە، بەڵام ئەوان گوتوویانە: نا ئەوە مەبەست نیە، ئەوە مانایەکەی ئیمام دەیزانیّ، ئیمامیش نەفەرێك بووە، یان مەعلووم بووە، یان نەزانراو بووە، ئەویش گوتوویەتی: ئەو ئایەتە مەبەستی ئەوەیە، لەبەر ئەوەش وایان کردوە، پێدەچیّ دەستی پیسیان چوویێتە نێو، بۆ ئەوەی ئیسلام لە نێوەڕۆکی خۆی خاڵی بکەنەوە.

{بۆ وێنە: شیعەی نوصەیریی دەڵێن: پێنج پایەکانی ئیسلام، بریتین لە: (محمد، علی، حسن، حسین، فاطمە)و، دەڵێن: حەج بریتیە لەوەی بچیە لای ئیمام}.

دیارە ئیسماعیلییەکان گوتوویانە: ئیسماعیل نەمردوە، بەڵکو خوا شاردوویەتەوە، چونکە مەترسیی لێی هەبووە کە بکوژریّ!

ئنجا ئیسماعیلییەکان حوکمڕانییشیان کردوە، بۆ وێنە: لە مەغریب و میصر لەڕێی (فاطمیة)کانەوە، (٢٧٢) ساڵ حوکمیان کردوەو، لە هەندیّ ناچەی ئێران (١٧٧) ساڵ حوکمیان کردوەو، لە سووریا (٣٠٧) ساڵ حوکمیان کردوە، ئێستاش ئیسماعیلییەکان لە سووریا لە شوێنێکن، پێی دەگوتریّ: (السلمیة)، لە ئێرانیش لە هەندیّ شوێن هەن، لە نزیك (قوم)، لە ئەفغانستانیش هەن، لەویّ لەقەبیان (موفتەدا)یە، دیسان لە (بەنجاب) و (کشمیر)یش هەن و، لە (عومان) هەن و لە (مەسقەت) هەن و، لە (تەنزانیا)ش هەن.

بەڵام ئێستاش لەگەڵدا بیّ، فیکرەی ئیسماعیلییەکان تەم و مژێکی زۆری بەسەرەوەیەو، هیچ کەس وەك پێویست سەری لیّ دەرناچیّ، ڕەنگە بۆ خۆشیان سەریان لیّ دەرنەچیّ، چونکە لە هەر شوێنەی بە جۆرێك باسی دەکەن، گرنگ ئەوەیە وەك هی مسوڵمانان نەبیّ[1].

---

(١) الموسوعة المیسرة، ص ٣٨.

**دووەم:** {الإسماعيلية: إسم عام للفرق التي تعتقد بإمامة الإبن الأكبر للإمام الصادق، وهو إسماعيل أو إمامة نَجْلِهِ محمد، وسُمُّوا بأَسماء مختلفة، بشتى المناطق، منها: الباطنية، والتعليمية، والسبعية، والحَشيشيّة، والملاحدة، والقرامطة}[١] .

واتە: ئیسماعیلییە، ناوێکی گشتییە بۆ ئەو تاقمانەی کە پێیان وابووە، کوڕە گەورەکەی جەعفەری صادیق، دەبووایە ئیمام بێ، نەك (موسى الكاظم) و دوای ویش موحەممەدی کوڕی، زۆر ناویان بۆ بەکار هێنراون، بەپێی جیاوازیی ناوچەکان: وەك: باطینیی، تەعلیمی، حەوتیی {چونکە ئیسماعیل دەبێتە ئیمامی حەوتەم} حەشیشیی، مولحیدەکان، قەرامیتەکان، ئەوانەیان هەموو بۆ بەکار هێنراون.

## ٢- القرامطة:

ئەم گرووپە باطینییە دژ بە ئیسلامە لەژێر پەردەی شیعەگەرییدا خۆپەنهانکەرە، لە ساڵی (٢٨١ك)دا، پەیدا بوون، لە سەردەمی خیلافەتی (المعتضد بالله)، کە یەکێك بووە لە حوکمڕانەکانی بنەماڵەی عەبباسیی.

شارەزاو پسپۆڕانی مێژوو ئاوایان باس دەکەن:

القرامطة: {فرقة من غلاة الشيعة وفرع من الإسماعيلية، ظهر في جنوبي ما بين النهرين، بعد ثورة (الزنج) المشهورة ٢٦٤هـ/٨٧٧م، ولا يختلف الفرع عن الأصل إلاّ في بعض المسائل الثانوية، أمّا النقاط الأساسية في المذهب فمشتركة بينهما، أمّا تسميتهم القرامطة، فتعود إلى فلاّح عراقي اسمه: حمدان قرمط، أمّا من حيث الدين، فلم يكن للقرامطة دين أو شعائر تذكر، وقد خرّب أحد قادتهم (أبو طاهر) الكعبة}[٢] .

واتە: کۆمەڵێکن لە شیعە زۆر ڕۆچووەکان و لقێکن لە ئیسماعیلییەکان، کە لە خوارووی نێوان دوو ڕووبارەکان پەیدا بوون، لەدوای شۆڕشی زەنج، ئنجا ئەو

---

(١) موسوعة الأديان في العالم، الفرق الإسلامية، ص ٦٧.

(٢) الموسوعة الميسرة، ص٤٤١.

لقەش لەگەڵ ئەو ئەصڵە، هیچ جیاوازییان نیە، جگە لە هەندێ بابەتی لاوەکیی، بەڵام لە شتە بنچینەییەکاندا هەر یەکن (واتە: قەرامیتە و ئیسماعیلییە)، لەبەر ئەوەش پێیان گوتراوە: قەرامیتە، دامەزرێنەرەکەیان جوتیارێکی عێراقیی بەناوی (حەمدان قەرمەت) بووە، ئەو زیاتر ئەو جموجۆڵەی دامەزراندوە، بەڵام لەرووی دیندارییەوە، قەرامیتە هیچ دروشمێکی دینداریيان نەبووە، بەڵکو یەکێك لە سەرکردەکانیان بەناوی {ئەبو تاهیر} کاتی خۆی کەعبەی رووخاندوە.

هەروەها هەمان سەرچاوە دەڵێ: (لە ساڵی (٣١٧ك)دا لە سەردەمی خەلیفە (المقتدر بالله)دا، (ئەبو تاهیر) هێرشی کردە سەر مەککە، لەکاتی حەجدا و سی هەزار (٣٠،٠٠٠) حاجی کوشت، لە پیاوەکان، ئافرەتەکان و منداڵەکانیشی هەموو کردنە کۆیلە، دەرگای کەعبەی شکاندو بەردە رەشەشی هەڵقەندو، بردی بۆ (قطیف)، لە کەنداو، تاکو لە ساڵی (٣٣٩ك)دا، دوای بیست و دوو (٢٢) ساڵ، بەردە رەشە گێردرایەوە بۆ شوێنی خۆی[1])[2].

---

(١) لەدیبەیتەکەی[*] من و کاك مەلا بەختیاردا، گوتی: ئیسلام چی کرد بە قەرامیتە؟ چی کرد بە فاتیمییەکان؟ ئەمە هەر جێی پێکەنین بوو، چونکە قەرامیتە هەر جموجۆڵێکی ئیلحادیی بوون، لە مێژوودا دەڵێ: بیری زەمزەمیان پڕ کرد لە جەنازەی حاجیان، ئەو ئەبو تاهیرە سواری وڵاخ بوو، حاجیان کە تەوافیان دەکرد گوتی: ڕاوەستن با وتارتان بۆ بدەم، ئنجا وشەی زۆر ناشیرینی بەکار هێنان، گوتی: ئێوە هەمووتان کەرن، وەك چۆن کەر بەدەوری ئاعوردا دەسووڕێتەوە، ئەوە چییە بەدەوریدا دەخولێنەوە؟ ئەو خوایەی کە ئێوە دەیپەرستن، بۆچی نایە بەرگریی لە ماڵەکەی خۆی بکات، بۆچی نایەت بەرگریی لە ئێوە بکات؟ دەڵێ: یەکێ لە زانایانی فەرموودەناس کە پیاوێکی زۆر بوێر بوو، لەگەڵ حاجییەکان بوو، گوتی: خوای پەروەردگار دەتوانێ بەرگریی بکات، بەڵام ئێمە بە ئێوە تاقی دەکاتەوە، داخۆ ئێمە جورئەت و غیرەتمان چەندە! ئەویش هەر لەوێ ئەو زانایەی کوشت، ئەوە قەرامیتە بوون، کە هەندێ لە عەلمانییەکان دەڵێن: ئیسلام زوڵمی لە قەرامیتە کردوە!!

(*) ئەو دیبەیت (مناظرة)یە لە: (٢٠١٦/٦/١٠)دا لە هۆڵی (تەوار) لە شاری سلێمانیی بوو و کەناڵە ئاسمانییەکان ڕاستەوخۆ گواستیانەوەو ئێستاش کراوە بە کتێب بە ناوونیشانی:

{سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لە ئەزموونی کوردستاندا} و تەرجەمەی عەرەبیش کراوەو لە میصر چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

(٢) نفس المصدر، ص ٧٦.

(هەروەها قەرامیتە دەوڵەتیان دامەزراندوە لە (بحرین) و (إحساء)و (قطیف) لەسەر بناغەی ئەو بیرۆکانەی خۆیان، کە بریتی بووە لە: ئیلحاد، ئەوە کە دنیا لەمێژینەیەو بێ سەرەتایەو کەس دروستی نەکردوە، بڕوایان بەوە هەبووە کە سامان هی هەموو لایەکە، پیاوو ئافرەت و، کەس لەکەس زیاتری بۆ نیە)[1].

## ٣- شۆڕشی زەنجییەکان (ثورة الزنج):

(د. حسن إبراهیم حسن) لە بارەی شۆڕشی زەنجیەکانەوە دەڵێ: (هەڵگیرسێنەری شۆڕشی زەنج پیاوێکی فارس بوو، ناوی (عەلی کوڕی موحەممەد) بوو لافی ئەوەی لێ دەدا کە زانیاریی نادیار دەزانێ، لافی پێغەمبەرایەتییشی لێ دا، هەندێ ئایەتی قورئانی بە جۆرێکی وا تەفسیر دەکردن، کە تەفسیری (باطني) بوون، زۆر دڵڕەق و خوێن ڕێژ بوو، ڕەحم و بەزەیی نەدەزانی، یەکێك لە کارەکانی ئەوەبوو هێرشی کردە سەر شاری بەصرە، لەساڵی (٢٥٧ك)دا، بەنوێژی نیوەڕۆیە ئاگری لە شاری بەصرە بەرداو هەرچی خەڵکی تێدا بوو، هەمووی کوشتن، مەگەر ئەوەی ڕایکردبێ و، مزگەوتە گەورەکەی کردە تەویلەی ئاژەڵ و ئەسپەکانی، ئەم فیتنەیە بەردەوام بووە لە ساڵی (٢٥٥ك تا ٢٧٠ك)، واتە: پازدە ساڵ، دەوڵەتی عەبباسیی پیاوو ماڵ و چەکێکی زۆریان بەکار هێنا، تاکو توانیان ئەو بەڵایە لەکۆڵ ئۆممەت بکەنەوە)[2].

---

(١) الفرق بين الفرق ص ١٧٠- ١٨٠، وفضائح الباطنية للغزالي: ص ١٢-١٣.

(٢) تأريخ الإسلام السياسي، ج٣ص ٢١٣،٢٩٠.

## ٤- نوصەیرییەكان[١] (النُّصيرية):

١- (الجرجاني) دەڵێ: {النصيرية: قالوا: إنَّ الله حلَّ في علي}[٢].

واتە: نوصەیرییەكان گوتوویانە: خوا هاتۆتە نێو عەلی كوڕی ئەبی تالیب.

٢- لە (الموسوعة الميسرة في الأديان والأحزاب والمذاهب المعاصرة)دا هاتوە: {(النُّصيرية): حركة باطنية ظهرت في القرن الثالث للهجرة أصحابها يُعَدُّون من غلاة الشيعة الذين زعموا وجوداً إلهاً في علي وأَلَّهوه، مقصدُهم: هَدْمُ الإسلام ونَقْضُ عُراه، وهم مع كل غازٍ لأرض المسلمين، ولقد أطلق عليهم الإستعمار الفرنسي لسوريا اسم (العلويين) تمويهاً وتغطية لحقيقتهم الرافضية والباطنية، مُؤَسِّسُ هذه الفرقة: أبو شعيب محمد بن نصير البصري النُّميري: ٢٧٠هـ، عاصر ثلاثة من أئمة الشيعة وهم: علي الهادي، (العاشر) والحسن العسكري (الحادي عشر) ومحمد المهدي (الموهوم) الثاني عشر}[٣].

واتە: (نُصَيرية) جموجۆڵێكی (باطني)ین، لە سەدەی سێیەمی كۆچییدا سەریان هەڵدا، بە یەكێك لە تاقمە تێپەڕێنەرەكانی شیعە، كە لە بازنەی ئیسلام دەرچوون، دادەنرێن، بڕوایان وا بووە كە بوونی خوا لە عەلییدا بەرجەستە بووە، بۆیە عەلییان بە پەرستراو زانیوە، بەڵام مەبەستیان ڕووخاندنی ئیسلام و هەڵوەشانەوەی پایەكانیەتی و، هەر كەسێك هێرشی كردبێتە سەر وڵاتی مسوڵمانان، ئەوان لەگەڵی بوون و، هەركەسێ هێرشی كردبێتە سەر مسوڵمانان، ئەوان پەیوەندییان پێوە كردوە، ئیستیعماری فەڕەنسیی كاتێ سووریای گرت، ناوی (عەلەویی) بۆ دانان، وەك پەردە پۆش كردن لە مسوڵمانان و شاردنەوەی

---

(١) نوصەیرییەكان ئێستاكە لە سووریا هەن، بەهەڵە ناوی عەلەوییان بۆ بەكار دەهێنرێ.

(٢) التعريفات، ص ٢٣٣.

(٣) الموسوعة الميسرة في الأديان ... ج١ ص ٣٩٠.

حەقیقەتە باتینییە ڕافزییەکەیان، دامەزرێنەری ئەم تاقمە پیاوێك بوو کە کونیەکەی ئەبو شوعەیب بوو، ناویشی (موحەممەدی کوڕی نوصەیری بەصڕایی بوو) لە ساڵی (٢٧٠ك)دا، وەفاتی کردوە، هاوچەرخ بووە لەگەڵ سێ لە ئیمامەکانی شیعەکاندا، کە بریتین لە: (علي الهادي) ئیمامی دەیەم و (الحسن العسكري) ئیمامی یازدەیەم و (محمد المهدي) کە هەر بوونی نیەو، بە حیساب ئیمامی دوازدەیەمە.

## ٥- (الدروز- الدرزية) (الموحِّدون):

فەرهەنگەکان و ئەو کتێبانەی باسی مێژووی ئەو تەوژمانە دەکەن، ئاوا باسیان دەکەن:

بۆ وێنە:

(د. كميل الحاج) دەڵێ: {لهم صلة بالإسماعيلية الباطنية، ومؤسس هذه الفرقة: محمد بن إسماعيل الدرزي، (٤١١)هـ، وهم يعتقدون أن الخليفة الفاطمي: الحاكم بأمر الله (٣٧٥-٤١١)هـ هو الناسوت الذي حلّ فيه اللاهوت، ويسمُّون أنفسَهم بالموحِّدين.

أهم معتقدات الدرزية:

١- الإيمان بالتجسُّد الإلهي، أي أن الله تجسّد مرات عديدة.

٢- إن الحاكم بأمر الله هو التجسُّد الأخير، وأنه الآن في غيبة، وسوف يعود لِمُعاقَبَةِ الأشرار والكفار.

٣- الإيمان بالحدود الخمسة: العقل، والنفس، والكلمة، والسابق، والتالي.

٤- الإيمان بالنطقاء: نوح، إبراهيم، موسى، عيسى، محمد.

٥- الإيمان بأن لكل شيء باطناً وظاهراً.}[1].

---

(١) الموسوعة الميسرة، للدكتور كحيل الحاج، ص ٢٢٢-٢٢٣.

پێشتر باسمان کرد: زۆربەی هەرە زۆری گرووپە (باطنية)کان دەچنەوە سەر ئیسماعیلییە، کە ئەوانیش گرووپێکی شیعەن {د. کُمیل الحاج} دەڵێ: ئەوانە پەیوەندییان بە ئیسماعیلییە باتینییەکانەوە هەیە، دامەزرێنەری ئەم گرووپە (محمد بن إسماعيل الدرزي)ە، کە لە ساڵی (٤١١ك)دا مردوە، ئەوانە پێیان وابووە کە (الحاكم بأمر الله) کە یەکێ بووە لە خەلیفەی فاتیمییەکان و لەنێوان ساڵانی: (٣٧٥-٤١١ك)دا، ژیاوە، گوتوویانە: ئەو پیاوە ئەو ناسووتەیە کە لاهووت تێیدا بەرجەستە بووە! ناویان لەخۆیان ناوە خوا بەیەکگران (الموحِّدين).

گرنگترین بیرو بڕوایەکانیان:

١- خوا دەچێتە نێو جەستەی مرۆڤەوە، چەند جار خوا ئەوەی کردوە.

٢- (الحاكم بأمر الله)، بۆ دواجار بووە کە خوا چۆتە نێو جەستەی و، پێیان وایە نەمردوە، بەڵکو لە حاڵەتی خۆ پەنهان کردن دایە، دوایی دێتەوە بۆ سزادانی خراپەکاران و بێ بڕوایان.

٣- بڕوایان بە پێنج سنوورەکان هەیە: عەقڵ و، نەفس و، وشەو، پێشکەوتووو، هاتوو {هەر کامێك لەوانە مانایەکی تایبەتییان بۆ داناوە}.

٤- ناویان لەو پێنجانە ناوە (النطقاء): (نووح و ئیبراهیم و عیساو مووساو موحەممەد) سەلامی خوایان لێبێ.

٥- بڕوایان بەوە هەیە کە هەموو شتێك وەك چۆن ڕواڵەتی هەیە، دیوی پەنهانیشی هەیە.

ئەم گرووپە ئێستا لە سووریا هەن، لە شوێنێك بەناوی (جبل الدروز) و لە (لوبنان و فەلەستین)یش هەن، نزیکەی شەشسەد هەزار (٦٠٠٠٠٠) کەسێك دەبن.

بێگومان ئەوانە لە دەرەوەی بازنەی ئۆممەت دادەنرێن، بەڵام هەموو گرووپە شیعییەکان بە شیعەی دوازدە ئیمامییشەوە، کە ئێمە بە ئەهلی قیبلەیان دادەنێین،

هەموویان جۆرێك لە هاوسۆزییان لەگەڵ ئەو گرووپە شیعییانەدا هەیە، دورزیی بن، نوصەیریی بن، هەرچییەك بن، هەر لەبەر ئەوە کە لەناوی شیعەدا بەیەك دەگەنەوە، هاوسۆزیی و هاوکارییان لەگەڵ یەکدا هەیە!!

## ٦- إخوان الصفاء وخُلّان الوفاء:

لە پێنج کورتە خاڵدا باسی ئەم گرووپە دەکەین:

**یەکەم:** ئەوانە گرووپێك بوون سەرچاوەکانی مێژوو دەڵێن: کۆمەڵێکی پەنهان (جماعة سرّية) بوون، شیعەی ئیسماعیلیی و (باطني) بوون، خاوەن ڕێڕەوێکی فەلسەفیی ئاوێتەیی (تلفيقي) بوون، یانی: لە چەند شتێك ئەو فیکرەیان کۆ کردبووەوە، هەم هەندێ شتی ئیسلامی تێدا هەبوو، بەو شێوەیە کە بۆخۆیان تەئویلیان دەکرد، هەم لە فەلسەفەی یۆنان، هەم فەلسەفەی فارس، هەم لە فەلسەفەی هیند، کۆمەڵێك شتیان لێك دابوو، ئنجا ئەوانە هەر بەوەندە ئیکتیفایان نەکردبوو، کە چەند شتێك، وێڕای ئیسلام هەمووی بەیەکەوە گرێ بدەن، بەڵکو دەیانویست هەموو ئایینەکان بەیەکەوە کۆ بکەنەوە (ئیسلام و یەهوودیی و نەصرانیی، مەجووسیی).

**دووەم:** کاتی سەرهەڵدانی ئەم گرووپە: ئەم گرووپە لە شاری بەصرا سەریان هەڵدا، لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچییدا.

**سێیەم:** ئەم گرووپە پێیانوابووە کە فەلسەفە لە شەریعەت گرنگ ترە، بەشێوەیەك گوتوویانە: هەر کەسێك ئەهلی فەلسەفە بێ، کە ئەوان ناویان ناوە حیکمەت، پێویستیی بە شەریعەت ناکات، قسەیەکی زۆر باویان هەبووە، گوتوویانە: (الشريعة طب المرضى، والفلسفة طب الأَصِحّاء)، واتە: شەریعەت چارەسەری نەخۆشانە، بەڵام حیکمەت یان فەلسەفە، بۆ ئەوانەیە کە تەندروستن.

**چوارەم:** ئەوانە هەموو بیرۆکەو فەلسەفەی خۆیان لە کۆمەڵێك نامیلکەدا کۆ کردبۆوە، کە ژمارەیان (٥٠ یان ٥١ یان ٥٢)ە}[١][٢].

**پێنجەم:**

**أ-** (أبو حيان التوحيدي) ئاوا پێناسەی نامەکانیان دەکات، دەڵێ: {وهي مبثوثةٌ من كل فنٍ نتفاً بلا إشباعٍ ولا كفاية، وفيها خرافات وكنايات وتلفيقات وتلزيقات، وقد غَرِق الصّواب فيها لغلبة الخطأ عليها}[٣]، واتە: لە هەر زانستێك شتێکیان تێ هاویشتوە، بەڵام هیچی بایی ئەوەندە نیە کە ئینسان تێر بکات و، هیچی بە ئەندازەی پێویست نیە، کۆمەڵێك ئەفسانەو شتی بە کینایەی تێدایەو، کۆمەڵێك شتی لێکدراوو پێکەوە لکێندراوی تێدایە، ئەوەی کە ڕاستە، تێیدا نوقم بووە لەوەدا کە هەڵەیە.

**ب-** (أبو سليمان المنطقي السجستاني) دەڵێ: {تَعِبوا وما أَغْنَوا، ونَصَبوا وما أوجدوا، وحاموا وما وَرَدُوا، وغَنُّوا وما أَطْرَبوا، ونَسَجوا فَهْلَهَلُوا، وَمَشَطوا فَفَلْفَلوا}[٤].

واتە: زۆریان خۆ ماندوو کردوە، بەڵام هیچ سوودیان نەگەیاندوە، زۆر شەکەت بوون، بەڵام هیچیان دەستگیر نەبووە، زۆر لەدەوری سووڕاون، بەڵام نەچوونەتە سەر سەرچاوەکە، زۆریان گۆرانی گوتوە، بەڵام کەسیان وا لێ نەکردوە پێی هەڵپەڕێ، یان دڵ خۆش بێ، شتیان چنیوە، بەڵام چنینەکەیان زۆر شاش و بێ ڕووحەو، زۆر تێیانپەڕاندوەو، قسەی زۆر تیژیان کردوە.

---

(١) إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات، ص ٥٢-٥٣.

(٢) د. فوئاد مەعصوم، سەرۆك کۆماری ئێستای عێراق ٢٠١٧ز لە نامەی دکتۆراکەیدا بەناوی: {إخوان الصفاء، فلسفتهم وغايتهم} ص ٩٥-٩٦، ط٣، ٢٠٠٨م، ژمارە (٥٢)ەکە تەرجیح دەدات.

(٣) الإمتاع والمؤانسة، عن إخوان الصفا ص ٩٦.

(٤) نفس المصدر ج٢ص٦.

٧- یەزیدییەکان (الیزیدیة)[١]:

یەزیدییەکانیش قسە زۆرن لە بارەیانەوەو، هەوڵ دەدەم بە کورتیی و بە ئینصافەوە، هەرچی پێویستە لە بارەیانەوە بیهێنم، واقیعی خۆیان چۆنە ئاوا.

شایانی باسە: کاتی خۆی {٢٠١٠-٢٠١٤ز} من لە ئەنجوومەنی نوێنەران لە بەغداد، هەندێ یەزیدییم لەگەڵدا بوون، دەیانگوت: ئێمە ئایینەکەمان، پێش ئیسلامیشە! هەروەها دەیانگوت: ئێمە ناومان (ئێزدیی) یان (ئێزەدیی)یەو یانی: خۆمان دەبەینەوە سەر یەزدان، بەڵام ئەوەی کە ڕاستەو، قەناعەتم پێیەتی و مێژوو دەیگەیەنێ، ئەوەیە کە ئێستا لە سێ خاڵاندا بۆتان باس دەکەم:

**یەکەم:** پێناسەی یەزیدییەکان:

{الیزیدیة فرقة نشأت سنة (١٣٢)هـ إثْر انهیار الدولة الأمویة، کانت في بدایتها حرکة سیاسیة لإعادة مجد بني أمیة، ولکن الظروف البیئیة وعوامل الجهل انحرفت بها، فأوصلتها إلی تقدیس یزید بن معاویة، وإبلیس الذي یطلقون علیه إسم (طاوس ملك) وعزازیل}[٢].

واتە: یەزیدییەکان گرووپێکن لەدوای ساڵی (١٣٢)ك، لەو ساڵەدا کە دەوڵەتی ئومەویی ڕووخا، دامەزراون، لە سەرەتاوە ئەمانە کۆمەڵێکی سیاسیی بوون، ئامانجیان ئەوەبوو حوکمی بەنو ئومەییە بگێڕنەوە، بەڵام هەل و مەرجی ژینگەیی و نەزانیی، ئەوانەی لاداو، گەیاندنی بە ئەندازەیەك (کە دوایی باسی دەکەین، چۆن؟) کە یەزیدی کوڕی موعاویە زۆر بە پیرۆزو پاك بگرن[٣]، پاشان

-----

(١) ئەوانە لە کاردانەوەی شیعەدا پەیدا بوون.

(٢) الموسوعة المیسرة، ج١ ص٣٧١-٣٧٦.

(٣) زانایانی ئیسلام زۆریان بە جائیزیان داناوە لەعنەتی لێ بکرێ، هەندێکیان گوتوویانە: ئەگەر لەعنەتیشی لێ نەکرێ، نابێ دوعای بۆ بکرێ، هەمووشیان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی

ئیبلیسیش {ئەوان پێی ناڵێن: ئیبلیس و پێشی ناڵێن: شەیتان} کە پێی دەڵێن: تاوس مەلەك، یان مەلەك تاوس و پێشی دەڵێن: عەزازیل.

**دووەم: چۆنیەتی سەرهەڵدانیان:**

{دوای ئەوەی کە دەوڵەتی ئومەویی و سوپای ئومەوییەکان، لە ڕووباری گەورە لە باکووری عێراق لەساڵی (١٣٢ك)دا تێك شكا، لەبەرامبەر سوپای عەبباسییەکاندا، کە تازە شۆڕشیان دەکردو ڕادەپەڕین، فەرماندەی سوپایەکە کە ناوی: (إبراهيم بن حرب بن خالد بن يزيد) بوو، دوای ئەوەی تێك شكا، ڕای کرد بەرەو باکووری عێراق و، سوپا تێك شکاوەکەی ئومەوییەکانی کۆ کردەوە، بانگەشەی ئەوەی کرد کە یەزیدی کوڕی موعاویە، زۆر شایستەتر بووە بە جێنشینایەتیی، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە مسوڵمانان بە گشتی گوتوویانە، ئنجا ئەوەشی خستە پاڵ و گوتی: یەزیدی کوڕی موعاویە ئەو سوفیانییەیە کە چاوەڕێ دەکرێ، بێ[1]، ئنجا بۆچی چوونە باکوور (ناوچە کوردییەکان)؟ چونکە دایکی مەڕوان (مەڕوانی دووەم) ئەو مەڕوانەی کە لە ڕۆژگاری ئەودا دەوڵەتی ئومەویی ڕووخا، دایکی ئەو مەڕوانە کورد بووە، ئنجا چوونەتە لای خزمانیان لەوێ، لەسەرەتاوە بیرۆکەکە هەروا هاتوە، ئیدی وردە وردە هەر تێیان پەڕاندوەو تەقدیسیان کردوەو مەدحیان کردوە}.[2]

---

کە ئینسانێکی خراپ بووە، هیچ زانایەکم نەبینیوە مەدحی بکات، من باسی ئەوە ناکەم ئێستا هەندێ دەوڵەت کە حوکمی میراتییان هەیە، دێنن مەدحی یەزید دەکەن، بە حیساب ئەگەر مەدحی ئەو بکەن، هی خۆشیان تۆزێ ڕەوایەتیی پەیدا دەکات، قسەم لەوە نیە، بەڵام تەماشای بەرهەمی پێشینمان بکەین، ئەو زانا گەورە گەورانە، کەس ستایشی نەکردوە ئەگەر لەعنەتیشیان لێ نەکردبێ، دوعاشیان بۆ نەکردوە، پێشتریش لەو بارەوە هەندێك شتمان باسکرد.

(١) کە من پێم وایە ئەو دەقانەی باسی {سوفیانیی} دەکەن، هەر بەنی ئومەییە خۆیان هەڵیانبەستوون و ئەصڵ و ئەساسیان نیە، چونکە لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوە کە سوفیانیی دێ، وەك چۆن مەهدیی دێ، ئەو سوفیانییەی دێ، زەوی دوای ئەوەی پڕ بووە لە ستەم، پڕی دەکات لە دادگەریی، ئنجا بە حیسابی یەزیدییەکان ئەو سوفیانییە ئەو یەزیدەیە.

(٢) سەرچاوەی پێشوو.

**سێیەم: دامەزرێنەرانی:**

چوار کەسی سەرەکیی دامەزرێنەری گرووپی یەزیدیین:

کەسایەتیی یەکەم: (عَدِي بن مُسافر) کە یەکێ بووە لەوانەی کاتی خۆی دوای ئەوەی عەبباسییەکان دەسەڵاتیان هەبووە، هەر خۆیان شاردۆتەوە، لە سەدەی پێنجەمی کۆچییدا ژیاوە، لەچەنگ عەبباسیەکان ڕایکردوە دوایی لە لوبنانەوە دەچێ بۆ ناوچەی {هەکاریی} ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر مەڕوانی کوڕی حەکەم، شۆرەتی (شرف الدین) بووەو (أبو الفضائل)یشیان پێگوتوە، ئەو پیاوە بە شێخ عەبدولقادری گەیلانیی گەیشتوەو تەریقەتی تەصەووفی لێ وەرگرتوە، یەکێ بووە لە خەلیفەکانی، دەڵێن: پیاوێکی زۆر چاك بووە (إبن تیمیة) لە کتێبەکانی خۆیدا مەدحی دەکات، دەڵێ: عەدی پیاوێکی دیندارو پارێزکارو چاکەکار بووە، لە ساڵی (١٠٧٣ز) یان (١٠٧٨ز)دا، لەدایك بووە، لە تەمەنی نەوەد (٩٠) ساڵییدا وەفاتی کردوە، لە {لالش} ئەو لالشەی ئێستای ناوچەی شێخان، بەخاك سپێردراوە.

کەسایەتی دووەم: (صخر بن صخر بن مسافر)ە، نازناوەکەی (أبو البرکات) بووە، ئەویش لەگەڵ مامیدا ڕۆیشتوەو لەدوای خۆیشی بۆتە جێنشینی.

کەسایەتیی سێیەم: (عدي بن أبي البرکات) کە (أبي المفاخر)یشیان پێ گوتوەو بە (الکوردي) ناودار بووە، لە ساڵی (٦١٥ك)دا وەفاتی کردوە.

کەسایەتیی چوارەم: (شمس الدین أبو محمد) کە ناسراوە بە: (شیخ حسن) (٥٩١-٦٤٤)ك، لەسەردەمی ئەودا یەزیدییەکان لادەدەن و زێدەڕۆیی دەکەن لە خۆشویستنی یەزیدو عەدی کوڕی موسافیرداو، جۆرێك لە پەرستنیان بۆ دەکەن، دوایی ئەو زێدەڕۆییە سەر دەکێشێ بۆ پەرستنی ئیبلیسیش! ئنجا ئەو (شێخ حسن)ە، یەکەم کتێب بۆ یەزیدییەکان دادەنێ بەناوی (الجلوة لأصحاب الخلوة)، هەروەها کتێبی (موصحەفی ڕەش)یشیان هەیە، کە کۆمەڵێك بیرۆکەی فەلسەفەو ئایینە کۆنەکانیان هێناوە، بە تێکەڵ و پێکەڵیی.

ئەگەر بەشێوەیەکی زنجیرەی یەك لەدوای یەك، سەرنجی مێژووی سەرهەڵدانی ئایینی یەزیدیی بدەین، دەبینین، بەمجۆرەیە:

١- دوای شەڕی (کەربەلاء) کە ئاشکرایە لەلای هەمووان لەسەردەمی (یەزید) دا شەڕی کەربەلا و ڕوودەدات و، حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێیان ڕازی بێ، لەگەڵ کۆمەڵێك لە خزمانی، بە زوڵم دەکوژرێن.

٢- دوای ئەوە شیعە دەست دەکەن بە جنێو پێدان و لەعنەت لێکردنی یەزیدی کوڕی موعاویە.

٣- ئنجا بەشێك لە کوڕو کچ و نەوەکانی یەزیدو خزمەکانیان بە تایبەت و، ئومەوییەکان بە گشتیی، لە کاردانەوەی شیعەدا کە قسان بە یەزید دەڵێن، دێنن زۆر تەقدیس و ستایشی یەزید دەکەن.

٤- دوایی نکووڵیی دەکەن لە نەفرین لێکردنی یەزیدو، دێن نکووڵیی دەکەن لە نەفرین لێکردن لە هەر شتێك.

٥- پاشان تەماشا دەکەن خوا لە قورئاندا لەعنەتی لە ئیبلیس کردوە، چی بکەن؟ دەڵێن: خوا لەعنەتی لە ئیبلیس نەکردوە کە ئەوان ناڵێن: ئیبلیس، دەڵێن: {مەلەك تاووس} بەڵکو ئەوە مسوڵمانان بۆخۆیان ئەوەیان خستۆتە نێو قورئانەوە، ئەگەرنا ئەو زاتێکی زۆر گەورەیەو، هی ئەوە نیە نەفرینی لێ بکرێ، پێشتر دیارە بڕوایان بە قورئان بووە.

٦- دوایی بۆ پاساودانەوەی ئەوە کە نابێ لەعنەت لە ئیبلیس بکرێ، دەڵێن: ئیبلیس ئەو زاتە بووە کە ئامادە نەبوو سەجدە بۆ غەیری خوا بەرێ[1].

من جارو بار کە قسەم لەگەڵ یەزیدییەکاندا کردوە، گوتوومە: ئەو برادەرەی ئێوە ئەوەندە خوای لەلا گەورە بووە، بەقسەی خواشی نەکردوە! چونکە ئەوان دەڵێن: مەلەك طاووس سەجدەی بۆ ئادەم نەبردوە، چونکە گوتوویەتی: سەجدە بۆ غەیری خوا نابەم!

---

(١) الموسوعة الميسرة، ج١ ص٣٧١-٣٧٦.

بەڵام ئەو سەجدە بردنە - وەك زۆر جاری دیکەش باسمان کردوە - بریتیی بووە لە سڵاو لێکردن و ڕێز لێگرتن، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (یوسف) و (النحل)دا بەدرێژیی لەو بارەوە دواوم، بەڵام ئەوان ئەوە بە فەزیڵەت بۆ ئیبلیس لەقەڵەم دەدەن!

## ٨)- الحَشّاشون (الصَّباحية):

لە پێنج کورتە خاڵدا باسی ئەم گرووپی (الحشّاشون) دەکەین:

**یەکەم:** {الحَشّاشون: أتباع الحسن بن الصباح، طائفة إسماعيلية فاطمية نزارية مشرقية، انشقت عن الفاطميين، أسّسها الحسن بن الصباح الذي اتخذ من قلعة (آلموت) في فارس مركزاً لنشر دعوته وترسيخ أركان دولته}[(١)].

واتە: ئەوانە شوێنکەوتووانی (الحسن بن الصباح)ن، کۆمەڵێکن لە ئیسماعیلییەکان جیا بوونەوەو، حەسەنی کوڕی صەباح قەڵای (آلموت)ی کردوە بە مەڵبەندی خۆی لە وڵاتی فارس و، کردوویەتی بە شوێنی بڵاو کردنەوەی بانگەوازەکەی و، چەسپاندنی دەوڵەتەکەی لە ئێران.

ئەو حەسەنی کوڕی صەباحە لە (الرّي) لەدایك بووە لە ساڵی (٤٣٠)ك، شیعە بووە، دوایی لەتەمەنی (١٧) ساڵییدا دەبێتە شیعەی ئیسماعیلیی فاتیمیی و، لە ساڵی (٥٢٨)ك مردوە، بەبێ ئەوەی هیچ نەوەی لەدوا بێن، چونکە دوو کوڕی هەبوون بەڵام هەردووکیانی کوشتوون، پێش ئەوەی بۆخۆی بمرێ.

**دووەم:** ئەم کۆمەڵە (الحشاشون) زۆر ناودار بوون بەوەی زۆر دەستڕەش بوون، پیاوی زۆر ناوداریان کوشتوون، لە زانایان، دوو جار ویستوویانە صەلاحەددینی ئەییوبیی بکوژن، بەڵام دەرباز بووە، پیاوی گەورە گەورەو زانایانیان زۆر کوشتوون، ئەو حەسەنی کوڕی صەباحە، توانیویەتی شوێنکەوتووانی خۆی وا

---

(١) الموسوعة الميسّرة في الأديان.... ج١ ص ٤٠٣.

قەناعەت پێ بێنێ، کە خۆیان پەنهان و نەناس بکەن و، هەر بەرپرس و زانای گەورە مەبەستیان بێ، بیکوژن، وەك فیدایی، کە دوایی بابای بکوژ بەزۆریی خۆیشی دەربازی نەبووەو کوژراوە.

**سێیەم:** ڕیشەی فیکریی و عەقیدەیی (الحشّاشون) دەچێتەوە سەر:

**أ-** شیعە بەگشتی، پاشان شیعەی ئیسماعیلیی بەتایبەت.

**ب-** بەوە بەناوبانگ بوون پەنایان بردۆتە بەر پەنهان کوشتن (إغتیال).

**ج-** بڕوایان بە فیکرەی تەناسوخ هەبووە، واتە: ئینسان کە دەمرێ ڕووحەکەی دەچێتە بەر کەسێك یان ژیانداریکی دیکە، بەپێی کردەوەکەی، ئەگەر باش بێ، ڕووحەکەی دەچێتە بەر کەسێك یان ژیانداریکی باش و، ئەگەر خراپ بێ، دەچێتە بەر ژیانداریکی خراپ.

**چوارەم:** هەندێ لە بیرو بۆچوونەکانیان:

**أ-** پێشەوایەکەیان لە وڵاتی شام، ناوی (رشیدالدین سنان بن سلیمان) بووە، بیرۆکەی تەناسوخی هەبووەو خۆی دایهێناوە.

**ب-** (الحسن الثاني بن محمد): گوتوویەتی قیامەت هاتوەو، شەریعەتی ڕەت کردۆتەوەو گوتوویەتی: هیچ کەسێ هیچ ئەرکێکی شەرعیی لەسەر نەماوە.

**ج-** پێیان وابووە حەج کردن ئەوە نیە بچی بۆ (بیت الحرام)، بەڵکو ئەوەیە کە ئیمامی زەمان واتە: پێشەوای گرووپەکەیان لەکوێ بێ، بچی بۆ ئەوێ، ئەوە حەجکردنە.

**د-** دروشمیان لەهەندێ قۆناغدا ئەوە بووە، کە هیچ کە هەقیقەتێك لە بووندا لەئارادا نیەو، هەموو شتێك ڕەوایە.

**پێنجەم:** ئەو شوێنانەی کە ئێستا شوێنکەوتووانی ئەم تەوژمەی تێدا هەن:

ئەو فیکرەیە ئێستاش شوێنکەووتووی هەن، لە ئێران و سووریاو لوبنان و یەمەنداو، لە نەجران و هیندیش بەکەمیی هەن، هەروەها لە هەندێك لەو کۆمارانەی کە کاتی خۆی لە یەکێتی سۆڤیەت جیا بوونەوە، لەوێش هەن[1].

٩)- فاتیمییەکان (الفاطمیون):

خوا یاربێ لە حەوت کورتە خاڵاندا، باسی گرووپی فاتیمییەکان دەکەین:

**یەکەم:** (فاطمية)کان کە گرووپی نۆیەمن لە (باطنية)کان - بەپێی سەرژمێریی ئێمە-، گەورەترین گرووپ بوون و لە هەمووشیان زیاتر ماونەتەوەو، لە هەموویان ناودارتربوون لە گرووپە باتینییەکان، دەوڵەتێکیشیان لەسەر بناغەی بیرۆکەی ئیسماعیلیی (باطني) دروست کردوە، کە نەیارەکانیان پێیان گوتوون: (الدولة العُبَيدية)، ئنجا ئەوانە بانگەشەی خیلافەتیشیان کردوەو ڕاستەوخۆ خۆیانیان بە {خیلافەت} داناوە، چونکە دانیان نەناوە بە دەوڵەتی عەباسیی لە بەغداو، ئومەوییەکان لە ئەندەلوسدا و، گوتوویانە: خۆمان خەلیفەین!

**دووەم:** یەکەم حوکمڕانیان بەناوی (المهدي أبو محمد عبيدالله) بووە، کە لە ساڵی (٢٩٧ك تاکو ٣٢٢ك) حوکمی کردوە، نازناوی (المهدي) بۆ خۆی هەڵبژاردوە، لە وڵاتی تونس دەوڵەتەکەی دامەزراندوە، لە شاری (المهدية)یە، ئنجا شارەکەش خۆی بنیاتی ناوە، یاخود دواتر ئەو ناوەی لێناوە.

**سێیەم:** لەسەردەمی خەلیفەی چوارەمیاندا (المعز لدين الله) (أبو تميم مَعْد) کە لە (٣٤١ تاکو ٣٦٥)ك لە حوکمدا بووە، (جوهر الصقلي) کە لە ساڵی (٣٨١ك)دا وەفاتی کردوەو یەکێ بووە لە فەرماندەکانیان، لە ساڵی (٣٥٨ك)دا

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان ....ج١ ص٤٠٣-٤٠٧.

میصر دەگرێ و شاری قاهیرە دروست دەکات و، دەیکات بە پایتەختی دەوڵەتی فاتیمیی، لەساڵی (٣٦٣ك)دا.

**چوارەم:** ناودارترین حوکمڕانی فاتیمییەکان (الحاكم بأمر الله) بووە، کە لە ساڵانی (٣٨٦-٤١١ك)دا حوکمڕان بووەو خۆی بە پەرستراو (إله) زانیوەو دارو دەستەو شوێنکەوتووانی (تألیە)یان کردوە، یەکێ لە شاعیرەکان کە پێیدا هەڵدەڵێ، دەڵێ:

**فاحكم فأنت الواحد القهار** .............

هەڵبەتە شیعە بە گشتیی و بەردەوام، ئەو تەقدیس و بەپیرۆز گرتنەیان بۆ ئیمامەکانیان و بەرپرسەکانیان هەر هەبووە.

**پێنجەم:** ژمارەی حوکمڕانەکانی دەوڵەتی فاتیمیی چوارده (١٤) حوکمڕان بووە.

**شەشەم:** دوا حوکمڕانیان (العاضد) بووە (أبو محمد بن عبدالله)، کە لە: (٥٦٧ك)دا مردووە و، بە مردنی وی دەوڵەتی فاتیمیی کۆتایی پێ هات، لەسەر دەستی باپیرە گەورەمان صەلاحەددین ئەیوبی، کە ئەگەر ئەو نەبووایە، بەڕواڵەت ئێستا ئەفریقیاو میصرو شام، وەك شوێنانی دیکە شیعە دەبوون و، ڕەنگە شیعەی خراپتریش بووایەن، ئەو صەلاحەددینەی چاکەی لە چاوی زۆر لە مسوڵماناندا هەیە، وای کرد گەسکی لێدان لەوێ، چونکە لەسەردەمی فاتیمییەکاندا نەیاندەهێشت مەزهەبەکانی ئەبو حەنیفەو شافیعی و مالیك و ئەحمەد، بوونیان بێ، بەڵام سوڵتان صەلاحەددین بۆ هەر چوار مەزهەبەکان ڕێی کردەوەو زانایەکان سەریان دەرهێنایەوە، دوای ئەوەی پێشتر چەوساوە بوون.

**حەوتەم:** نەیارەکانی دەوڵەتی فاتیمیی پێیان دەڵێن: (الدولة العُبَيدية)، کە لە (٢٩٧ تاکو ٥٦٧)ك دەوامی کردوە، واتە: (٢٧٢) ساڵ، بۆچی پێیان گوتوون دەوڵەتی عوبەیدیی؟ فاتیمییەکان دەڵێن: نەسەبی ئێمە ئاوایە: (عبيدالله) کە

ناوی لەخۆی نابوو مەهدیی ئەوان دەڵێن: (عبیدالله بن الحسین بن أحمد بن عبدالله بن محمد بن إسماعیل بن جعفر الصادق) ئەوە نەسەبی ئیمەیە.

بەڵام (إبن تیمیة) و (الذهبي) و زانایانی دیکەی موعتەبەر دەڵێن: نەخێر ئەوە ئەصڵ و ئەساسی نیە، بەڵکو ئەمە ڕەچەڵەك و نەسەبیانە: (عبیدالله بن الحسین بن أحمد بن محمد بن عبدالله بن میمون القداح)، ئەو (میمون القداح)ەش، پیاوێکی جوولەکە بووە، بۆیە پاڵیان دەدەنە لای ئەو (عبیدالله)یەی یەکەم، کە ئەویش دەچێتەوە سەر (میمون القداح) کە کابرایەکی جوولەکە بووەو پەیوەندیی بە فاتیمەو (أهل البیت)ەوە نەبووە[1].

## ١٠- الشـیـخـیة:

لە دوو کورتە خاڵدا باسی ئەم گرووپە دەکەین:

**یەکەم:** دامەزرێنەری ئەو گرووپە:

کاتی خۆی لە سەدەی دوازدەیەمی کۆچییدا، مەلایەکی شیعە هەبووە بەناوی (شیخ أحمد الإحسائي) کە لەساڵی (١١٦٦ك/١٧٥٣ز)دا مردوە، ئەم مەلایە شیعەی دوازدە ئیمامیی بووە، دوایی هەندێ شتی لە شیعەی دوازدە ئیمامییدا داهێناوەو، بووە بە گرووپێکی سەربەخۆو پێیان گوتراوە: (الشیخیة).

**دووەم:** پوختەی بیرۆکەکانیان:

دەڵێن: {إن الحقیقة المحمدیة تجلّت في الأنبیاء قبل محمد تجلیاً ضعیفاً، ثمّ تجلّت تجلیاً أقوی في محمد والأئمة الإثني عشر، ثم اختفت زهاء ألف سنة، وتجلّت في الشیخ أحمد الإحسائي والسید کاظم الرشتي، والإحسائي من الشیعة الحلولیة الذین یعبدون علیاً..... أمّا اعتقادهم في القیامة فهو اعتقاد باطل...... إذ أنهم لا یعتقدون بقیامة

---

(١) إزالة الشبهات ص ٤٤٣-٤٤٤، و (دائرة المعارف الإسلامیة) ج٢٥ ص ٧٧٣٤.

الجسد، ويؤوِّلون علامات الساعة تأويلات باطنية، تتفق مع مسلكهم في إنكار البعث والقيامة}[١].

واتە: هەقیقەتی موحەممەدیی لەهەموو پێغەمبەراندا درەوشاوەتەوە، پێش موحەممەد، بەڵام بەشێوەیەکی بێهێز درەوشاوەتەوە، دوایی لە موحەممەددا زیاتر ئەو هەقیقەتە درەوشاوەتەوە، دوایی لە دوازدە ئیمامەکانی شیعەدا بەتۆخیی درەوشاوەتەوە {یانی لە هی پێغەمبەرانیش بەهێزتر!} دوایی بۆ ماوەی هەزار ساڵ ئەو هەقیقەتە موحەممەدییە پەنهان بووە، دوایی جارێکی دیکە بەهێزەوە درەوشاوەتەوە لە شێخ ئەحمەدی ئیحسائیی و سەید کازمی ڕەشتییدا، .. ئنجا ئیحسائیی لە شیعەی حلوولیی بووە، کە عەلییان پەرستوە، بیرو باوەڕیان وا بووە کە بەڵێ قیامەت هەیە، بەڵام جەستەکان زیندوو نابنەوە، هەر ڕووحەکانن، ئنجا هەموو نیشانەکانی قیامەت بە تەئویلێکی (باطني) تەئویل دەکەن، کە بگونجێ لەگەڵ نکووڵیی کردنیاندا لەوەی جەستەکان زیندوو ببنەوە.

## ١١- الحركة الكشفية[٢]:

ئەو گرووپەش ئەو کەسەی دایمەزراندوە ناوی: (كاظم الرشتي)یە، لە ناوچەیەك بەناوی (رشت) لە وڵاتی ئێران لە ساڵی (١٢٠٥ك-١٧٩٠ز)دا لەدایك بووە، لەتەمەنی (٢٦) ساڵییدا دەچێ بۆ تاران و، شێخ ئەحمەدی ئیحسائیی دەبینێ و دەبێتە قوتابی ئەوو، لەگەڵیشی دەچێ بۆ کەربەلاء.

یەکێ لە قسەکانی (كاظم الرشتي) ئەوەیە:

---

(١) موسوعة الأديان في العالم، الفرق الإسلامية ص ١٥٧-١٦١، و (مطالع الأنوار) للشيخ أحمد الإحسائي ص ٣٣-٣٤، و (حقيقة البابية والبهائية) د. محسن عبدالحميد ص ٤٠-٤١.

(٢) بۆ زانیارییتان! ئەمانە ئێستاش هەن، لە ئێران و لە هەندێ شوێن.

{إن الشريعة وأصول الآداب هي غذاء الروح، لذلك يجب أن تكون الشرائع متنوعة وعلى ذلك يجب نسخ الشرائع العتيقة}[١].

گوتوویەتی: شەریعەت و بنچینەکانی ئەدەبەکان، خۆراکن بۆ ڕووح، بۆیە دەبێ شەریعەتەکان جۆراو جۆربن، هەر بۆیە ئەو شەریعەتانەی کە پێشتر هاتوون، دەبێ نەسخ بکرێنەوە بەهی دیکە، کە لە شوێنیان دادەنرێن.

ئنجا بۆ زانیارییتان! هەم گرووپی {شەیخیة} هەم {کەشفییە} بوونە زەمینە خۆشکەر بۆ هەردووك گرووپی: (البابية والبهائية)، کە دواتر باسیان دەکەین.

## ١٢- البـــابية:

خوا پشتیوان بێ لە پێنج کورتە خاڵدا، باسی ئەم گرووپە دەکەین:

**یەکەم:** ئەم گرووپە دامەزرێنەرەکەی کابرایەك بوو بەناوی (الميرزا علي محمد) کە نازناوی دەرگا (الباب)ی بۆخۆی دانا.

(د. محسن عبدالحميد) لە پێناسەیاندا گوتوویەتی: {مُؤَسِّسُها (علي محمد رضا الشيرازي) الذي ادَّعى أنه يَنتَسِبُ إلى أهل البيت، ولد في شيراز (١٢٣٥هـ/١٨١٩م)، تتلمذ على السيد كاظم الرشتي، وأفهمه بأنه هو الذي سيدَّعي المهدية والظهور، فأعلن عن دعوته سنة (١٢٦٠هـ/١٨٤٤م) في شيراز من عمر (٢٥) سنة، وأُعدم سنة (١٨٥٠)م في عمر ثلاثين سنة}[٢].

واتە: دامەزرێنەرەکەی: (علي محمد رضا الشيرازي)ە، کە بانگەشەی کردوە بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر ئەهل و لبەیت، لە شیراز لەدایك بووە لەساڵی (١٢٣٥ك)دا، دوایی بۆتە قوتابی {کازمی ڕەشتیی}، {کازمی ڕەشتیی}

---

(١) مطالع الأنوار ص ٥٣، ومحمد زرندي، عن: (حقيقة البابية)، ص٤٦.

(٢) حقيقة البابية والبهائية، ص ٩٦، ٩٧.

تێیدەگەیەنێ و پێی دەڵێ: دوایی تۆ دەبی بە مەهدیی، ئەویش خۆی ئاشکرا دەکات و بانگەشەی مەهدیی بوون دەکات، لە ساڵی (١٢٦٠ك-١٨٤٤ز)دا، لە شیراز، ئەو کاتە تەمەنی (٢٥) ساڵ بووە، بەڵام لە ساڵی (١٨٥٠ز)دا لە تەمەنی سی (٣٠) ساڵییدا لە سێدارە دەدرێ.

**دووەم:** بۆچی ناوی لەخۆی ناوە دەرگا (الباب)؟

شیعە شتێك دەگێڕنەوە کە ئەصڵ و ئەساسی نیە، گوایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {أنا مدينة العلم وعلي بابها}، واتە: من شاری زانیارییم و عەلییش دەرگایەکەیەتی! ئەم دەقە لەڕووی سەنەدەوە، هیچ نیەو، لەڕووی مەتنیشەوە بەهەمان شێوە، چونکە هەموو هاوەڵان هەر کەسەو بە ئەندازەی خۆی، دەرگای چوونە نێو زانست و مەعریفەتی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بوون.

بۆیە (علي محمد رضا) کە گوتوویەتی: من (دەرگام) یانی: دەرگام بۆ لای (مهدي المنتظر)و هەرکەسێ بڕوا بەو بێنێ، دەبێ پێشێ بڕوا بەمن بێنێ و لەلای من ڕا بچێ بۆ لای وی! بۆیە گرووپەکەشی ناو ناوە (البابية) یانی دەرگاییەکان!.

سێیەم: ئەو کابرایە (علي محمد رضا الشيرازي)، قسەی کافرانەو نابەجێی زۆرن، بۆ نموونە:

دەڵێ: {إني أفضل من محمد، كما أن قرآني أفضل من قرآن محمد...}.

واتە: من لە موحەممەد گەورەترم، قورئانەکەشم لە قورئانەکەی موحەممەد گەورەترە[1].

هەروەها ئەو کابرایە کتێبێکی دانا بەناوی (البيان) لە کتێبەکەیدا یەکێ لە قسەکانی ئەوەیە:

---

(١) مفتاح باب الأبواب، ص ٢٠، کە کتێبێکی خۆیەتی، ئەو قسە پووچەی هێناوە.

{ألم يأن لكم أيها العلماء! أن تنبذوا الهوى وتَتَّبِعوا الهدى، وتتركوا الضلال وتسمعوا أقوالي وتُذْعِنوا لأوامري، إن نبيكم لم يُخلِف بعدهُ غير القرآن فهاكم كتابي (البيان) فاتلوه واقرؤوه، تجدوه أفصح عبارةً من القرآن، وأحكامه ناسخة لأحكام القرآن }[1].

واتە: ئەی زانایان! ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە واز لە ئارەزووو بهێنن و بەدوای ڕێنمایی بکەون، واز لە گومڕایی بێنن و گوێ لە قسەکانی من بگرن و، مل بۆ فەرمانەکانی من کەچبکەن! پێغەمبەرەکەی ئێوە لەدوای خۆی تەنیا قورئانی بەجێ هێشتوە، ها ئەوە کتێبی (البيان)ی من بیخوێننەوەو، سەرنجی بدەن، لە قورئان فەسیح ترەو یاساکانیشی یاساکانی قورئان هەڵدەوەشێننەوە.

**چوارەم:** دوای ئەوە ئەو کابرایە زیاتر پێی لێ ڕاکێشاوەو، ئەوەی ڕاگەیاندوە کە: خوا لەودا بەرجەستە بووە، وەك چۆن لەپێش ویشدا، خوا چۆتە نێو جەستەی پێغەمبەرانی دیکەوە[2].

بێگومان ئەو کابرایە زمانی عەرەبیی چاك نەزانیوە، بۆیە تەماشا بکەن چ فێڵێکی کردوە! لە کتێبەکەی خۆی (البيان)دا دەڵێ: {إن الحروف والكلمات كانت قد عصت واقترفَتْ خطيئة في الزمان الأول، فعوقبت على خطيئتها بأن قيِّدت بسلاسل الإعراب، وحيث بُعِثْنا، جاءت رحمةٌ للعالمين، فقد حصل العفو عن جميع المذنبين والمخطئين حتى الحروف والكلمات، فأُطْلِقَتْ من قيدها تذهب إلى حيث تشاء، من وجوه اللحن والغلط}[3].

واتە: پیتەکان و وشەکان کاتی خۆی لەسەردەمی زوودا سەرپێچییان کردوەو گوناحێکیان کردوە، خواش سزای داون لەسەر ئەو گوناهەیان کە بە زنجیری ئیعراب ببەسترێنەوە {بە زنجیری ئیعراب بەسترانەوە} بەڵام دوای ئەوەی ئێمە هاتین، بەزەیی بۆ هەموو جیهانییان هات و، لێخۆشبوون دەرچوو بۆ هەموو

---

(١) هەمان سەرچاوە ص ١٣٧، عن (البابية) ص ٥٥.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ص١٠٠.

(٣) هەمان سەرچاوە، د. محمد مهدي خان ص ٩٩.

گوناهباران، هەتا بۆ پیتەکان و وشەکانیش، بۆیە ئەوانیش لەو قەیدو بەندەی ئیعراب دەرباز کران و، ڕێگایان درا، بە چ ڕێیەکی لادان و هەڵەدا دەچن، بچن!

یانی: لەبەر ئەوەی عەرەبیی نەزانیوە، گوتوویەتی: ئەگەر جارێك بکەر (فاعل)م (منصوب) کرد، ئەوەش کە (منصوب)ە (مرفوع) یان (مجرور)م کرد، ئەوە لەبەر ئەوەیە من ڕەحمەتم بۆ هەموو دنیاو، ئەو پیتانە با چیدیکە نەبەسترێنەوە بە ئیعرابەوە!

ئایا خەڵکێك ئەو قسانە ڕەواجیان هەبێ لەنێویاندا، دەبێ چی بن!

**پێنجەم:** ئنجا ئەو گرووپە ئافرەتێك زۆر دەوری تێدا بینی، کە ناوی (فاطمة) بوو، سێ چوار نازناوی هەبوون، (زرين تاج) (قرة العين) (فرح الفؤاد)، ئافرەتێکی زۆر خراپەکار بووەو، گوتوویەتی: دەبێ هەموو ئافرەتێك چوار مێردی هەبن! دوایی حکوومەتی ئێران حوکمی ئەو ئافرەتەی داوە، کە دەبێ بسووتێنرێ، سزایان داوەو سووتاندوویانە، پێشێ پێیان گوتوە: یان تۆبە بکە، یان دەتکوژین! گوتوویەتی: نەخێر، بۆیە سوتاندوویانە، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێ: کوشتوویانە.

### ١٣- البهـائيـة:

گرووپی {بەهائییە}ش لە پێنج کورتە خاڵدا، دەتوێژینەوە:

**یەکەم:** دامەزرێنەرەکەی: (مير علي حسين المازندراني)یە، نازناوی: (بهاء)ی هەبووە، لەساڵانی: (١٢٣٣-١٣٠٩ك)دا ژیاوە، واتە: لە (١٨٩٢ز)دا مردووەو خۆی بە خاوەنی دەرگا (صاحب الباب) زانیوە.

کتێبێکی داناوە بەناوی (الأقدس)، یانی هەرە پیرۆز، بانگەشەی کردوە: کە هەرچی حوکم هەن و خوا لە کتێبە پێشویەکاندا ناردوونیە خوار، بەو کتێبی

(الأقدس)ە، هەموویان نەسخ بوونەوە، لەبەر ئەوەی ئەو حوکمە پێشووانە لەگەڵ ئەم ڕۆژگارەی ئێستادا ناگونجێن!!(١).

**دووەم:** هەندێ لە وتەکانی لە کتێبی (الأقدس)دا:

أ)- دەڵێ: {ئێمە نەچووینەتە هیچ قوتابخانەیەك و، هیچ کتێبێکمان تەماشا نەکردوە، ئەوەی ئەم نەخوێندەوارە پێتان دەڵێ: لێی وەربگرن، ئەوە چاکترە لەو خەزێنانە کە لەزەویدا شاردووتاننەوە، ئەگەر بزانن}، (الأقدس)، ص١٢١.

ب)- {هیچ کەس بۆی نیە ڕەخنە بگرێ لەوانەی حوکمڕانیی دەکەن بەسەر خەڵکدا، لێیان گەڕێن چۆن حوکمڕانیی دەکەن، ئێوەش خەریکی دڵ و دەروون بن}، الأقدس، ص١٢١.

کە بێگومان دیارە دەستی حوکمڕانانی خۆسەپێن لەپشت ئەو جۆرە بیرۆکانە بوون.

ج)- {هەر کەسێك ئایەتێك لە ئایەتەکانی کتێبەکەی من بخوێنێتەوە، چاکترە لەوەی هەرچی کتێبی سەرەتاو کۆتایە بخوێنێتەوە}، الأقدس، ص١٢٥.

**سێیەم:** ئەو قسانەی ئەوان کە ئێستا بۆمان دەرکەوتوون، پێشتر ئاوا نەبووە، چونکە ئەوان خۆیان بە مسوڵمان داناوە، بەڵام ئەمە دوایی دەرکەوتوە، بۆیە دەبینین کۆمەڵێك زانا پێیان هەڵخەڵەتاون، وەك:

أ)- الشيخ محمد عبده، تأريخ الأستاذ الإمام ج١/ ٩٣٤.

ب)- الأمير شكيب أرسلان، حاضر العالم الإسلامي ج١/ ٣٥٨- ٣٦٣.

ج)- محمد إقبال، تجديد الفكر الديني، ص ١٧٥.

بۆیە مەدحی ئەو گرووپە (باطنية)یان کردوە، دیارە دەبێ لەسەرەتاوە نەیانناسیبن و، بەر لەوە بووە ڕووی ڕاستەقینەیان دەربکەوێ.

---

(١) حقيقة البابية والبهائية ، ص ١٣٩.

**چوارەم:** ئێستا بەهائییەکان لەزۆر وڵاتانی ئەورووپاو لە ئەمریکاشدا هەن، جگە لە ئێران و چەند شوێنێکی دیکە، ئنجا پەیوەندییان بەجوولەکەو نەصرانییەکان و بە ئینگلیزەوە هەیە، بەتایبەت[1]، کەناڵی ئاسمانییان هەیەو، لە بابییەکان شەیتانییانەتر کاردەکەن.

**پێنجەم:** گرنگترین ئەو شتانەی کە (بهاء) بانگەشەی بۆ دەکردن:

١- هەرچی حوکم لە ئیسلامدا هەیەو لەگەڵ کتێبەکەی ئەودا تێك دەگیرێ، هەمووی بە لابراو (منسوخ) لەقەڵەم دەدرێ.

٢- مرۆڤەکان هەموویان وەك یەکن، نەك هەر لە ڕووە ئینسانییەکەوە، بەڵکو بەرەهایی، واتە: مسوڵمان و نامسوڵمان و چاکەکارو خراپەکار ....هتد وەك یەکن.

٣- لە بواری باری کەسێتییدا، هەرچی یاساکانی ئیسلام هەن، بەلەغووی داناون، یەکێك لەوانە مەسەلەی چەند ژنیی، هەروەها گوتوویەتی: نابێ تەڵاق هەبێ، وەك لەدینی نەصرانییدا وایە.

٤- نوێژی بەکۆمەڵی نەسخ کردۆتەوە، مەگەر نوێژی جەنازە.

٥- گوتوویەتی: قیبلە ئەو کەعبەیە نیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هاوەڵانی فەرمووە: ڕووی تێ بکەن، بەڵکو قیبلە هەر شوێنێکە کە (بهاء) لەوێ بێ.

٦- هەرچی باسی حەڵاڵ و حەرام هەیە، لەکڕین و فرۆشتن و خواردن ....هتد، هەمووی {بە خەیاڵی خۆی} نەسخ کردۆتەوە[2].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٩٤-٢١٠.

(٢) محمد أبو زهرة، تأريخ المذاهب الإسلامية، ص ٢١٥-٢١٧.

## ١٤- القـاديانية (الأحمدية):

ئەم گرووپە کە دوا گرووپی (باطنية)کانە، بیتویژینەوە، لە چوار کورتە خاڵدا دەیخەینە ڕوو:

**یەکەم:** دامەزرێنەری ئەم گرووپە (میرزا غلام أحمد قادياني)یە، لەنێوان ساڵانی: (١٨٣٩- ١٩٠٨ز)دا، ژیاوە.

گرووپی: {قادیانیی} یاخود {ئەحمەدیی} بڕوایان بە جەستاندن (تجسيد) هەیە، واتە: ئەوە کە خوا بێتە نێو جەستەی مرۆڤەوە، ئنجا پێیان وایە هەرکام لە پێغەمبەرمان: موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و، عیسای مەسیح سەلامی خوای لێبێ، چوونەتە نێو جەستەی میرزا ئەحمەدی قادیانیی.

قادیانیش ناوی شارێکە، شەست (٦٠)میل لە شاری {لاهوور} دوورەو، ئەم گرووپە لە پاکستان و هیندو ئیندۆنیسیاو ئەفریقیاو ئەمریکای باکوورو باشووریش، هەن[1].

**دووەم:** تایبەتمەندییە فیکرییەکانی ئەم گرووپە:

١- میرزا غوڵام ئەحمەدی قادیانیی، بانگەشەی ئەوەی کردوە، کە گۆڕی مەسیحم دۆزیوەتەوە {بەنسبەت ئێمەی مسوڵمانەوە، کە دیارە هەر ئەوەش ڕاستە، مەسیح سەلامی خوای لێبێ گۆڕی هەر نیە، خوای باڵادەست بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان}، هەروەها گوتوویەتی: ڕووحی مەسیح هاتۆتە نێو جەستەی من، دوایی بانگەشەی ئەوەی کردوە: کە ئەو مەهدی چاوەڕوانکراوە، پاشان بانگەشەی ئەوەی کردوە کە ئەو بەناوی خواوە قسە دەکات، واتە: هەرچی کە دەیڵێ، ئەوە خوای زانا وەك وەحییەك فێری دەکات.

---

(١) الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي، د. كميل الحاج، ص ١٥-١٦.

٢- بانگەشەی ئەوەی کردوە کە: لاهووت، {واتە: خوا} هاتۆتە نێو جەستەی ئەوەوە.

٣- بانگەشەی ئەوەی کردوە: زۆر موعجیزە لەسەر دەستی ئەو دەرکەوتوون، ئیسپاتی ئەوە دەکەن کە ڕاست دەکات، (بە حیساب) یەکێ لە موعجیزەکانی ئەوە بووە کە: مانگ و خۆر گیراون لە ڕەمەزانی ساڵی (١٣١٢ك/ ١٨٩٤ز) دا، ئنجا گوتوویەتی: ئەو خۆر گیران و مانگ گیرانە کە بەیەکەوە بوون، لەم ساڵدا، هەردووکیان بۆیە گیراون، تاکو بزانن کە من ڕاست دەکەم.

٤- گوتوویەتی: من لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوم و، پەیامەکەی من لەگەڵ هی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)دا، تێك ناگیرێ، چونکە گوتوویەتی: هەر پێغەمبەرێك لەدوای موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دێ، دەبێ خەتمی وی پێوە بێ، منیش موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بۆی مۆر کردووم، کە منیش لەدوای وی پێغەمبەرم، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب

خوێندراوەتەوەش: (وخاتِم النبيين)، بە هەردووکیان هاتوە، ئنجا گوتوویەتی: موحەممەد بۆی مۆر (ختم) کردووم، کە منیش لەدوای وی پێغەمبەرم و، دینەکەی وی زیندوو دەکەمەوە.

٥- گوتوویەتی: جەنگ و جیهاد کۆتایی پێ هاتوە، ئێستا باوی نەماوە {گوتمان: ئەو کابرایە سەر بە ئینگلیز بووە}.

٦- گوتوویەتی: هەر کەسێ من بەدرۆ نەزانێ بەکافری دانانێم، بەڵام هەر کەسێك من بەدرۆ دابنێ، ئەوە کافرە.

٧- گوتوویەتی: دروست نیە ئافرەتانی قادیانیی شوو بکەن بە غەیری خۆیان، مادام بڕوا نەهێنن بە پێغەمبەرایەتیی ئەحمەدی قادیانیی، بەڵام بۆ پیاوانی قادیانیی هەیە ژن لە غەیری خۆیان بێنن، با بڕواشیان بە پێغەمبەرایەتیی ئەو نەبێ.

**سێیەم:** لە پەیڕەوانی ئەویشدا کۆمەڵە خەڵکێك هەبوونە، گوتوویانە: غولام ئەحمەد پێغەمبەر نەبووەو موعجیزەشی نەبوون، بەڵام کابرایەك بووە ئیلهامی بۆ کراوەو خوای پەنهانزان بەشێوەیەکی تایبەت، فێری کردوە[1].

**چوارەم:** (أبو الحسن الندوي) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: {وقد أمدت هذه الحرَكَةُ الحكومَةَ الإنجليزية، بِخَيْرِ جَواسيسَ لمصالحها، ... وخَدَموها في الهند وخارج الهند، وضحُّوا بأنفسهم في سبيلها...}[2].

واتە: ئەم گرووپە خزمەتێکی گەورەیان کرد بە حکوومەتی ئینگلیزو، زۆر سیخوڕی باشیان بۆ پەیدا کردن لەنێو خۆیانداو، لە هیندو لە دەرەوەی هیندیش، خزمەتێکی زۆر گەورەیان بە حکوومەتی ئینگلیز کردو لەپێناویدا قوربانییان دا.

بەڕێزان! ئەمە کورتەیەك بوو لەباسی ئەو چواردە (١٤) گرووپە باتینییانەی کە وەك گوتم: هەموویان لە بازنەی (باطنية)دا کۆ دەبنەوە.



---

(١) تأريخ المذاهب الإسلامية، شيخ محمد أبو زهرة، ص ٢٢١-٢٢٨.

(٢) محاضرات إسلامية في الفكر والدعوة ج١ ص ٣٥٠، (أبو الحسن النَّدَوي) بۆ خۆی خەڵکی ئەو شوێنەیەو زۆر چاك شارەزایە، بابیشی هاوچەرخی ئەو غولام ئەحمەدە بووە.




# کورتە هەڵسەنگاندنێکی گرووپە باطینییەکان

لە کۆتاییدا دەمەوێ پێتان بڵێم: ئەو گرووپە باتینییانە، ئەگەر وەك حەقیقەتی خۆیان تەماشایان بکەی، هەموویان لەدەرەوەی بازنەی ئۆممەت دادەنرێن، چونکە هەموویان بۆچوونی وایان هەن کە کوفر دەگەیەنن، بەڵام ئایا مەرجە هەرچی لەنێویاندا بوو، هەمووی کافر بێ؟ نەخێر، چونکە هەیە لەگەڵیانەو شوێنیان کەوتوە، بەڵام نەیزانیوە ئەوانە چۆنن؟ بۆ وێنە: شێخ موحەممەد ئەبو زەهرە دەڵێ: هەندێ لە شوێنکەوتووانی قادیانیی دەڵێن: نەپێغەمبەر بووەو نە موعجیزەشی هەبووە، بەڵکو پیاوێکی خورپە بۆ کراو (مُلْهَم) بووەو، هەڵبەتە بەوەندە قسەیەش مرۆڤ کافر نابێ، ئنجا کەسێك ئەگەر قەناعەتەکەی هەر ئەوەندە بێ، کە قادیانیی ئیلهامی بۆ دەکرێ، کافر نابێ، بەڵام ئەگەر بڵێ: وەحیی بۆ دێ، ئەوە پێی کافر دەبێ، گرووپەکانی دیکەش، کەم و زۆر خەڵکی مسوڵمانی سادەیان ڕەگەڵ کەوتوون، ئنجا ئەو گرووپانەش مەرج نیە هەقیقەتی خۆیان بۆ هەموو کەس کەشف کردبێ، چونکە هەر ناوی خۆیان بەخۆیانەوەیە (باطني)!!

چەند کەسێك پرسیاری گرووپی {کاکەیی} دەکەن؟ لە ڕاستییدا بۆیە لە نێو گرووپە (باطنیة)کاندا نەمهێناون، چونکە خەڵکی کاکەیی هاتوون بۆ لام گوتوویانە: ئێمە پێنج فەرزە نوێژ دەکەین، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەگرین، هەموو شتێکمان وەك ئێوەیە، بەڵام خۆمان بە ئەهلی تەصەووف دەزانین و لایەنی ڕووحیی زیاتر گرنگیی پێ دەدەین، ئەگەرنا ئیمان و عەقیدەمان وەك ئێوەیە، دوو سێ ساڵ لەمەو پێش لە هەولێر هاتن بۆ لام[1]، گوتم: با کەناڵی پەیام چاوپێکەوتنێکتان لەگەڵ بکەن و، هەقیقەتی خۆتان دەربخەن، کە ئێوە ئاوان، چونکە لەلای هەڵەبجەش خەڵکێکی دیکە هەیە، بەناوی {کاکەیی} و {هاواریی} بڕوایان بە قورئان و سوننەت و شەریعەت نیە! ئنجا بۆیە باسم نەکردوون، چونکە دوو حاڵەتی پێچەوانەیان هەن! بەڵام ئەوانی دیکە: {یەزیدیی}، {قادیانیی}، {بەهائیی}، ئەوانە دیارن، بەڵام {کاکەیی} هەندێ لێڵیی بەسەریانەوە هەیە، بۆیە بەچاکم نەزانی لە ڕیزی ئەو گرووپە لادەرانەدا سەرژمێریان بکەم، کە من پێم وایە ئەوانە هەموویان لەدەرەوەی بازنەی ئیسلامن، بەڵام ڕەنگە خەڵکێکی سادەو هەڵخەڵەتاو هەبێ، لەگەڵیاندا کە مسوڵمانیش بێ، بەڵام وەك خۆیان نەیانناسێ.

بۆیە زانایان دەڵێن: کەسێك مادام بە ڕواڵەت مسوڵمان بێ، بۆ حوکم بەسەر دادانی، بەوەی کە لەدەرەوەی بازنەی ئیسلامە، ناتوانی بە گرووپ و تائیفەکە بەگشتی بڵێی: ئەهلی کوفرن، مەگەر کوفری خۆیانیان ئاشکرا کردبێ و خۆیانیان لە ئیسلام و مسوڵمانان بەریی کردبێ، بۆ وێنە: قادیانیی، دورزیی، نوصەیریی، بەڵام بۆ تاك تاکیان دەبێ ئەو بنچینەیە جێبەجێ بکرێ: (ثبوت الشروط، وانتفاء الموانع)، چەسپاندنی مەرجەکان و، لاچوونی پەرچەکان، کە لە دەرسەکانی سەرەتادا، هەم باسی مەرجەکان و هەم باسی پەرچەکانیشمان کردوە.

---

(١) ئەوانە گوتیان: لەلای کەرکووك و دەورو بەری نیشتەجێین.




# فەلسەفە و فەیلەسووفەکان
# ( الفلسفة والفلاسفة )

١- پێناسە.

٢- کێ یەکەمجار وشەی فەلسەفەی بەکارهێنا؟

٣- بۆچی زانایانی ئیسلام ڕوویان نەکردۆتە فەلسەفە؟

٤- مێژووی فەلسەفە.

٥- گرنگیی و پێویستیی فەلسەفە.

٦- ڕێبازی فەلسەفە.

٧- چەند فەیلەسووفێکی مسوڵمان.

٨- هەڵوێستمان لەبەرامبەر فەلسەفەدا.




## پێناسە

بەمەبەستی باشتر ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای {فەلسەفە}، پێنج جۆرە پێناسە لەو بارەوە دەخەینە ڕوو:

**١)- أ- لە ڕووی زمانەوانییەوە:**

{(فلسفة) یان فیلوسوفیا (philosophy)وشەیەکی یۆنانییە لە ئەصڵدا لە دووبەش پێك هاتوە: (فیلو) کە بەمانای مەحەببەت دێ و (سۆفیا) بەمانای حیکمەت دێ، (فیلوسوفیا) یانی: (محبة الحكمة)، کەواتە: وشەی فەلسەفە لەڕووی زمانەوانییەوە یانی: خۆشویستن یان هەڵبژاردنی حیکمەت.

**ب- لەڕووی زاراوەییەوە:**

فەلسەفە بریتیە لەو زانیارییەی کە لە هەقیقەتی شتەکان و لەسەرەتای شتەکان دەکۆڵێتەوە، بەو شێوەیە کە شتەکان لەسەرینی، بە ئەندازەی توانای بەشەرو، کار کردن بەوە کە باشترە}.[1]

---

(١) الموسوعة العربية ج١٤ ص ٦٦٢، و (الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي) د. كميل الحاج، ص ٤٠٧-٤٠٨، و (مفاتيح العلوم) للخوارزمي: ص ٧٩.

**٢)**- هەر کام لە ئەفلاتوون و ئەرِستۆ، وشەی فەلسەفەیان بەکار هێناوە بەمانای زانست:

**یەك:** ئەفلاتون دەربارەی پێناسەی فەلسەفە بەزمانی خۆی، کە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە گوتوویەتی: {الفلسفة: علم الواقع الكلي، أو العلم بأعم علل الأشياء ومبادئها}.

واتە: فەلسەفە بریتیە لە زانیارییەکی گشتی دەربارەی واقیع، یاخود زانیاریی بە هۆکاری شتەکان و سەرەتای شتەکان.

**دوو:** ئەرستۆ گوتوویەتی: {الفلسفة: المعرفة العقلية والعلم بالمبادىء الأعم}.

واتە: فەلسەفە: زانستی عەقڵییەو، زانیاریی هەبوونە بە سەرەتاو دروست بوونی شتەکان و هەقیقەتیان[١].

**٣)**- (دیکارت) دەربارەی فەلسەفە گوتوویەتی: {إن الفلسفة أشبه بشجرة جذورها الميتافيزيقا، وجذعها الفيزياء، وفروعها: الطب و الميكانيكا والأخلاق}.

واتە: فەلسەفە وەك درەختێك وایە، رەگ و ریشەکانی بریتین لە میتافیزیقاو، قەدەکەی بریتییە لە فیزیاو، لق و پۆپەکانیشی بریتین لە: پزیشکیی و، میکانیکاو، رەوشت.

**٤)**- باوترین پێناسەی فەلسەفەش ئەوەیە کە:

فەلسەفە بریتیە لە شێوەیەك لە شێوەکانی تێگەیشتن و {فەلسەفە} پەیدا بوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی مرۆڤ دەربارەی خۆی و، بوونەوەرو دەورو بەر،

---

(١) تاکو سەدەی حەڤدەیەمیش زانستەکان لەگەڵ فەلسەفەدا، بەیەکەوە ئاوێتە بوون، بۆیە کەسێك فەیلەسوف بوویێ و ناویان نابێ حەکیم یان فەیلەسوف، مەگەر چۆن دەنا زانیارییەکی مەوسووعیی هەبووە: گەردووناس بووە، لە پزیشکییدا شارەزا بووەو، جوگرافیاو کیمیاو مێژوو ...هتدی زانیوەو، زانیارییەکی فراوانی هەبووە، ئنجا ئەو کاتە فەلسەفەو زانستەکان بەیەکەوە بوون، بەڵام بە فەلسەفەیان گوتوە: دایکی زانستەکان، یاخود کۆکەرەوەی زانستەکان، کە بە گشتی لە بوون {وجود}ی کۆڵیوەتەوە.

هەروەها تێگەیشتن لەوەی من چیم و بۆچی هاتووم بۆ ئێرە؟ ئەم بوونەوەرە چییەو بەرەو کوێ دەچێ؟ فەلسەفە وەڵامێکە بۆ ئەو پرسیارانەو بۆ ئەوە پەیدا بووە.

دیارە فەلسەفە بە شتەکاندا قووڵ دەبێتەوەو لە شتەکان ورد دەبێتەوە، هەر بۆیەش دەگونجێ بڵێین: فەلسەفە جۆرێکە لە بەرچاو ڕوونیی و بەکار هێنانی عەقڵ بۆ تێگەیشتن لە خودو، لە بوونەوەرو، لەدەوروبەرو، تێگەیشتن لە جەوهەرو چییەتی شتەکان[1].

٥)- دەگونجێ بە شێوەیەکی دیکەش پێناسەی فەلسەفە بکەین، وەك (د. محمد یوسف موسی) هێناویەتی دەڵێ: {الفلسفة هي المعرفة الحقة لله والكون السماوي والأرض والإنسان، أو هي نظر العقل في تفكيره الذي أراد به معرفة حقائق الوجود في العالم الأكبر، المحيط بالإنسان، والعالم الأصغر الذي هو الإنسان، والمبدأالأول لذلك كله}[2].

واتە: فەلسەفە بریتیە لە زانیاریی ڕاست دەربارەی خواو، دەربارەی گەردوون، بە سەرو خوارەوەو، دەربارەی مرۆڤ.

یاخود: بریتیە لە سەرنجدانی عەقڵ لە بیرکردنەوەیدا، بۆ ئەوەی ڕاستییەکانی بوون بزانێ، چ لە جیهانی گەورەدا، کە دەوری مرۆڤی داوە، چ لە جیهانی گچکەدا کە مرۆڤ خۆیەتی و، چ لەو سەرچاوەیە کە جیهانی گەورەو جیهانی بچووکی لێوە هاتوون {کە خوای پەروەردگارە}.

---

(١) الموسوعة العربية، ج١٤، ص٦٦٣-٦٦٤.

(٢) القرآن والفلسفة، ص١١.




## كێ یەكەمجار وشەی فەلسەفەی بەكارهێنا؟!

دەربارەی یەكەمین كەسێك كە ئەو وشەیەی بەكار هێنا، دوو ڕا هەن:

١- (سقرات) یەكەم كەس بووە ئەو وشەیەی بەكار هێناوە، لەكاتی وتووێژەكانی لەگەڵ ئەفلاتوندا، كە هەردووكیان لە سەدەی پێنج و شەشی پێش زاییندا بوون.

٢- (هرقلتس) كە یەكێكە لە فەیلەسووفەكانی یۆنان و شیشرۆنیش پشتگیریی ڕایەكەی كردوە، دەڵێ: یەكەمین كەسێك كە وشەی فەلسەفەی بەكار هێناوە، بریتیی بووە لە (فیساگۆرس) چونكە ئەو گوتوویەتی: {سیفەتی حیكمەت لە هیچ كام لە دروستكراوەكاندا نایەتە دی، بەڵكو ئەوە تەنیا تایبەتە بەخواوە.

{كە بەبۆچوونی من قسەكەی زۆر بەجێیە، هەقیقەتی شتەكان تەنیا خوا دەیزانێ، ئێمە ڕواڵەتی شتەكان دەزانین، وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ٧ ﴾ الروم}.

بۆیە فیساغۆرس بەخۆی نەگوتوە: حەكیم، بەڵكو گوتوویەتی: من حیكمەتم خۆش دەوێ، بەڵام حەكیم نیم، واتە: ئەو حیكمەتەم نیە كە هەقیقەتی شتەكانی پێ بزانم}.[1]

---

(١) تأريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم، ص٣٥، ط٢٠١٥م، آفاق للنشر والتوزيع.




## بۆچی زانایانی ئیسلام ڕوویان نەکردۆتە فەلسەفە؟

هەڵبەتە هێندێ زانای فەیلەسووفمان هەن، دوایی باسیان دەکەین، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی، بۆچی زانایانی ئیسلام ڕوویان نەکردۆتە فەلسەفەو پێیان هەڵنەگوتوە، مسوڵمانانیان بۆ هان نەداوە؟

(د. محمد یوسف موسی) ئەو پرسیارە وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: {لأن القرآن قد بيّن الحق في مشاكل الألوهية والطبيعة، نرى المسلمين في فجر الإسلام، لم تكن الغاية في تفكيرهم النظري: البحث عن الحقيقة في هذه النواحي، كما كان ذلك غاية تفكير غيرهم، من المتفلسفين من أبناء الأمم الأخرى، وذلك لأنهم: لم يحسّوا الحاجة لشيء من هذا، ما داموا قد عرفوا حاجتهم من هذه الحقائق بواسطة الوحي الإلهي، الذي كانوا قريبي عهدٍ به}[1].

واتە: لەبەر ئەوە مسوڵمانان زۆر ڕوویان نەکردوەتە فەلسەفە، چونکە قورئان کە وەحیی خوایە، حەقی خستۆتە ڕوو لەو گرفتانەدا کە پەیوەندییان بە خوای پەروەردگارو سروشتەوە هەیە، {قورئان هەقی تەواوی خستۆتە بەر دەستی مسوڵمانان} بۆیە مسوڵمانان لەسەرەتای ئیسلامەوە، ئامانجیان ئەوە نەبووە کە

---

(١) القرآن والفلسفة، ص ١١،١٢.

بیر بکەنەوە لە هەڵهێنانی ئەو مەتەڵانەی کە پەیوەندییان هەیە، بە مرۆڤ و بوونەوەرو دەورو بەرەوە، وەك غەیری خۆیان زۆر مەبەستیان بووە، لە میللەتانی دیکە، بۆیەش زۆر بە پێویستیان نەزانیوە، چونکە وەحیی خوای زانا، وەڵامی ئەو پرسیارانەی {کە: من کێم؟ کێ هێناومی؟ ئەم بوونە چییە؟ بۆچی هێناویەتی؟ بۆ کوێ دەچێ؟} خستوونە بەردەست {لە دوو توێی قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)} ئنجا وەك گوتراوە: (پێویستیی سەرچاوەی داهێنانە)، وەختێك کە مسوڵمانان پێویستییەکیان نەبووەو هاندەرێکیان نەبووە کە بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا بگەڕێن {دواییش باسی ئەوە دەکەم ئەوانەی بەدوایدا گەڕاون، داخۆ چییان دەستگیر بووە؟} بۆیە پێویستییان بە فەلسەفە نەبووە.

یەکێ لە زانایانی ڕۆژئاوا کە زانایەکی بە ئینصافە، بەناوی: (البارون کارّادي فر) ڕۆژهەڵاتناسێکی فەڕەنسیی هاوچەرخە، دان پێداهێنانێکی جوان دەکات، دەڵێ:

{إنّ محمداً وإن لم يكن فيلسوفاً بالمعنى الكامل، قد واجه كثيراً من المسائل الفلسفية، بحلولٍ كوّنت العقيدة الإسلامية، وإذن: فلم تكن الحقيقة المطلقة هي المشكلة التي كان العرب (المسلمون) يحاولون حَلّها، لأنهم عرفوا هذه الحقيقة في نواحيها الجوهرية بواسطة الوحي الإلهي، وإنّما كانت غايتهم شرح هذه الحقيقة والإنتصار لها، ووضع هذه الحقيقة التي جاء بها الوحي، في أسلوب أدبي في القالب الفني}.

دوایی (د. محمد یوسف موسی) دەڵێ: {وهكذا لم يتجه المسلمون الأوائل إلى التفلسف كما أثر من اليونان، إذ وجدوا في القرآن ما يجب أن يعرفوه عن الله والكون والإنسان، وما أتعب الفلاسفة القدماء من اليونان وغير يونان أنفسهم فيه، فلم يصلوا إلى الحق إلاّ في القليل منه}[1].

واتە: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هەرچەندە فەیلەسووفیش نەبوو بەمانای تەواوی وشە، بەڵام لەگەڵ زۆرێك لە پرسەکانی فەلسەفەدا، بەچەندان چارەسەر ڕوو بەڕوو بۆوە، کە دواتر ئەو چارەسەرانە {عەقیدەی ئیسلامیی}یان پێکهێنا.

---

(١) المصدر نفسه، ص ١١-١٢.

هەر بۆیەش مسوڵمانان زانینی وەڵامی ئەو پرسانە، ئامانجێکی ڕەها نەبوو بەلایانەوەو، گرفتێك نەبووو بەپێویستیان نەدەزانی چارەسەری بکەن، چونکە ئەو حەقیقەتانەیان لە جەوهەرو نێوەڕۆکیدا بەهۆی وەحییەوە، دەزانی، بەڵکو مەبەستیان ئەوەبوو ئەو حەقیقەتە شەرح بکەن و ڕوونی بکەنەوەو، بیخەنە قاڵب و شێوەیەکی هونەرییەوە {کە مەبەستی پێ کتێبەکانی: زانستی کەلام}ە.

دوایی (د. محمد یوسف موسی) دەڵێ: بۆیە مسوڵمانان ڕوویان لە فەلسەفە نەکرد، وەك کاتی خۆی یۆنانییەکان ڕوویان تێ کردبوو، چونکە وەڵامی هەموو پرسیارەکانیان کە پەیوەندییان هەیە، بە خواو، بوونەوەو، مرۆڤەوە، چنگ دەکەوت، ئەوەی کە فەیلەسووفەکانی یۆنان و غەیری یۆنانیش، خۆیان زۆر تێدا ماندوو کرد، بەڵام شتێکی کەم نەبێ دەستیان نەکەوت {ئەوان بە حازریی لە قورئاندا چنگیان کەوت}.

شایانی باسە: بابەتی: (بووناسیی ئیسلامیی) من کتێبی یەکەمی مەوسووعە عەرەبییەکەمم بۆ تەرخان کردوە، {الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله}، لەوێدا باسم کردوە کە هێڵە گشتییەکانی {بووناسیی ئیسلامیی} چیین؟ ئەو لێرە گوتوویەتی {عەقیدە} بەڵام پێم وایە {بووناسیی ئیسلامیی}یە کە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە.(١)

ئنجا ڕاستە قورئان ئێمەی بێ نیاز کردوەو خوای پەروەردگار وەڵامی هەموو ئەو پرسیارە فەلسەفییانە لە دووتوێی یەك ئایەتدا دەداتەوە کە بریتیە لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سووڕەتی (هود)، کە دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ هود

ئەم ئایەتە من لە کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی خاڵە هاوبەش و جیاوازییەکانیان)دا شیم کردۆتەوە، شەش هێڵی گشتیی {بووناسیی ئیسلامیی}

---

(١) شایانی باسە لە بەشی یەکەمی تەوەری چوارەم: (پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی..)دا پوختەی [بووناسیی ئیسلامیی]مان لەبەر ڕۆشنایی کتێبی ناوبراودا خستۆتە ڕوو.

لێ وەردەگیرێن، کە ئەوانەت لە هەموو کتێبەکانی فەلسەفەدا چنگ ناکەوێ، ئەوەش بۆیە وایە، چونکە ئێمە خوا سبحانە و تعالی ئەو عەقڵەی نەداوینێ کە حەقیقەتی پێ بزانین: حەقیقەتی خۆمانی پێ بزانین، حەقیقەتی ماددەی پێ بزانین، حەقیقەتی بوون و گەردوونی پێ بزانین، عەقڵەکەمان بەشی ئەوە ناکا، بۆیە هەموو ئەوانەی ئیعتیمادیان لەسەر عەقڵ بووە بۆ ئەوەی ئەو حەقیقەتانەی پێ بزانن، یان بزانن: خوا کێیەو چۆنە؟ تووشی هەڵەی سەیرو سەمەرە بوون! تۆ تەماشای کەلەپووری یۆنان بکە، دەربارەی تەصەووڕیان بۆ خوا، وەك تەصەووری منداڵان دێتە بەرچاو، یەکێ دەڵێ: خوا ژمارەیە، یەکێ دەڵێ هەوایە، یەکێ دەڵێ: ئاگرە، یەکێ دەڵێ: چوار توخمەکانە، یەکێ دەڵێ: خوا هەموو بوونە! چونکە خوا لەوە مەزنترە عەقڵی بچووکی مرۆڤ بتوانێ دەرکی بکات، نەك هەر ئەوە، بگرە عەقڵ ناتوانێ دەرکی چییەتی ماددەش بکات، کاتی خۆی ناویان لە گەردیلە ناوە ئەتۆم، ئەتۆم وشەیەکی یۆنانییە، یانی: ئەو بەشەی کە بەش ناکرێتەوە، بەڵام ئێستا بۆیان دەرکەوتوە، کە ئەو بەشەش، بەش دەکرێتەوە، بەڵکو ئێستا شتی بچووکتریشیان لەنێو گەردیلەدا دۆزیوەتەوە، ئنجا ئایا کەس گەردیلەی بینیوە؟ نەخێر! ئەدی کەس پێکهاتەکانی گەردیلەی بینیون؟ نەخێر، بەڵکو زانایان دەڵێن: بە شوێنەوارەکانی دەزانین گەردیلە وایەو وایە.

خوای بەرزو بێ وێنە بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الضحى، واتە: تۆ سەرگەردان بووی، خوا ڕێنمایی کردی.

هەروەها پێی دەفەرمووێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى

واتە: بەو شێوەیە (کە سروشمان بۆ پێغەمبەران کردوە) لەلایەن خۆمانەوە ڕووحێکمان بۆ سروش کردی، نەتدەزانی نە کتێب چییەو نە ئیمان چییە.

ئنجا ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وا بووبێ، بەتەئکید خەڵکی دیکە لەپێشترن کە وابن.




## مێژووی فەلسەفە

لە ڕاستییدا ئێمە ناتوانین سەرەتایەك دابنێین بڵێین: فەلسەفە لێرەوە دەستی پێ کردوە، بەڵام مەسەلەیەك هەیە ئاگاتان لێبێ! ئەو ڕۆژئاواییانە، باسی دیموکڕاسی بکە دەڵێن: لە لای ئێمەوە لەدایك بووە! باسی فەلسەفە بکە، دەڵێن: لەلای ئێمەوە هاتوە، باسی هەر شتێ بکە، دەڵێن: لەلای ئێمەوە هاتوە! کە بێگومان ئەوە درۆیەکی زۆر گەورەیە، وەك من لە دیبەیتەکەی لەگەڵ (کاك مەلا بەختیار)دا - کە ئێستا کراوە بە کتێبیش - باسم کردو بەبەڵگەی مێژوویی ئیسپاتم کرد کە نێوەڕۆکی دیموکڕاسیی {هەقی وشەکەم نیە} ئەوە کە خەڵك بەشدار بکرێ لە بڕیارداو ڕاوێژی پێ بکرێ، شتێکی زۆر لەمێژینەیە، لە هیند هەبووە، لە چین هەبووە، لە میزۆپۆتامیا هەبووە، لە میصر هەبووە، لە لای هیندییە سوورەکان هەبووە، لەزۆر شوێنی دنیا هەبووە.

ئنجا فەلسەفەش بەهەمان شێوە، بەڵام ئەوەندە گوتراوە: فەلسەفەی یۆنانیی، وا دەزانرێ بەس لە یۆناندا فەلسەفە هەبووە! بەڵام بەدڵنیایی پێش یۆنانیش خەڵك هەر عەقڵی هەبووە، فەلسەفە یانی: هەوڵ دانی مرۆڤ بۆ تێگەیشتنی خۆی و بوونەوەرو دەوروبەر، ئنجا مرۆڤ لەوەتەی خوا لەسەر زەوی دایناوە، ئەو

هەوڵەی هەر هەبووە، بەڵام ڕۆژئاوا دەیەوێ ئەوە زیاتر بەرجەستە بکات، کە ئەگەر زانستە، ئەگەر فەلسەفەیە، ئازادییە، دیموکراسییە، مافی مرۆڤە، هەمووی سەرچاوەکەی تەنیا لەوێوەدیە! نەخێر کاتی خۆی: هەر کام لە هیندو چین، لانکەی شارستانییەت بوونە، هەروەها ئێران و میصرو عێراق، بەهەمان شێوە، بەڵام ئەوان ئێستا دەستەڵاتیان هەیەو، دەیانەوێ هەرچی چاکەیە بیگێڕنەوە بۆ خۆیان، باسی هەر شتێکی چاك بکە، یەکسەر دەگوترێ: ئەوەش لە ئەورووپاوە هاتوە!

بۆیە فەلسەفە سەرەتایەکی دیاریکراویی نیە بڵێی: لە فڵان شوێنەو فڵان شوێنە، بەڵکو لەوەتەی مرۆڤ لەسەر زەوی بووە، ویستوویەتی (بوون) بناسێ.

بەڵام مێژوونووسان دەڵێن: فەلسەفەی ڕۆژئاوا، دابەش دەبێ بۆ هەشت قۆناغ:

١- چاخی ئیغریقیی {گریکیی} لە سەدەی شەشەمی پێش زایین، تاکو مردنی ئەڕەستۆ، ئەو ماوەیە پێی دەگوترێ: چاخی گریك.

٢- چاخی هیلنیستی ڕۆمانیی، کە لە مردنی ئەرستۆوە، هەتا کۆتایی ئەفلۆتۆنیی تازە، کە ئەویش لە (٣٢٢)پ.ز، تاکو (٥٠٠)ز خایاندوویەتی.

٣- چاخی نێوەڕاست، کە لە (ڕۆژگاری ئۆگستین)ەوە (٣٥٤-٤٣٠)ز، بەردەوام بووە، تاکو کۆتایی سەدەی پازدەیەمی زاینیی.

٤- چاخی ڕێنساس {Renaissance}: ڕاپەڕینی زانستیی کە لە سەرەتای سەدەی پازدە (١٥) تاکو سەرەتای سەدەی حەڤدە (١٧) خایاندوویەتی.

٥- چاخی ڕۆشنگەریی {Enlighetenment} ئەویش لە (جۆن لۆك)ەوە، تا کۆتایی سەدەی حەڤدە (١٧)ی زایینی خایاندوویەتی.

٦- چاخی فەلسەفەی تازەی ئەڵمانیی لە سەدەی حەڤدە (١٧) تاکو هەژدە (١٨)ی زایینی پێچووە.

٧- چاخی سەدەی نۆزدە (١٩).

٨- چاخی سەدەی بیست (٢٠).




## گرنگیی و پێویستیی فەلسەفە

ئەوانەی کە سەرقاڵ بوون بە فەلسەفەوە، فەلسەفەیان لە کەوڵی خۆی بردۆتە دەرێ و، زۆریان بە شان و باڵدا هەڵداوە! بۆ وێنە: پیاوێکی وەك (عبدالرحمن بدوي) دەڵێ: هەر کەسێ فەلسەفە نەزانێ و سەرو کاری لەگەڵی نەبێ، متمانە بە عەقڵی ناکرێ و لە دنیا تێ ناگات! هەرچەندە زانایەکی مسوڵمانیشە! ئنجا لەبارەی گرنگیی فەلسەفەو بەشەکانیەوە گوتوویەتی: {إنه على الرغم من تطور العلوم واستقلالها بأنفسها عن الفلسفة، بعد أن كانت كلُّها أجزاء وفروعاً لها، فإن الفلسفة لا تزال لها موضوعاتها الخاصة، التي لا تتناولها العلوم الأخرى، والتي تستقل هي بعبء البحث فيها، وهي:

١- القيَم.

٢- النظرة العامة في العالم وفي الحياة.

٣- الوجود الإنساني بما هو كذلك.

٤- نقد المعرفة.

٥- وجود الله، أو المطلق بوجه عام.

٦- المبادىء العامة التي تستند إليها العلوم، سواء منها: العلوم الطبيعية، أو الفيزيائية، أو الرياضية، أو الحيوية، أو الإنسانية}[1].

واتە: هەرچەندە زانستەکان زۆر گەشەیان کردووە سەربەخۆ بوون و جیابوونەوە {وەك پێشتر گوتمان کاتی خۆی زانستەکان هەمووی بەیەکەوە ئاوێتە بوون}، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێستاش فەلسەفە هەندێ بابەتی تایبەتیی خۆی هەن، کە زانیارییەکانی دیکە قسەیان لەبارەوە ناکەن، بۆیە ئێستاش پێویستییمان بە فەلسەفە هەیە، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك زانست هەن، هەر ئەو لێیان دەکۆڵێتەوە، وەك:

١- بەهایەکان.

٢- سەرنجدانی گشتی بۆ دنیاو بۆ ژیان.

٣- بوونی مرۆڤ وەك حەقیقەتی خۆی.

٤- ڕەخنە گرتن لە زانست.

٥- بوونی خوا، یاخود بوون بە گشتی.

٦- سەرەتا گشتییەکان، کەهەموو زانیارییەکان پشت بەو سەرەتایانە دەبەستن، چ زانستە سروشتییەکان، یان فیزیاییەکان، یان بیرکارییەکان، یان مرۆییەکان {ئەمانە هەموویان بابەتی فەلسەفەن}.

بەڵام من دەڵێم: ئێمە وەك مسوڵمان کە {بوونناسیی ئیسلامیی}مان بەهۆی قورئانەوە دەست دەکەوێ و، ئیمان و عەقیدەمان لەبەر دەستدایە، ئەوانە بێ نیازمان دەکەن لە گەڕان و سووڕان و پشکنینی بێ بەرهەمی عەقڵی ڕووت، ئنجا ئەگەر تەماشای مێژووی فەلسەفەی یۆنان و فارس و هیندو چین و میصرو میزۆپۆتامیا بکەین، دەبینین: زۆر جار بەدەستی خاڵی گەڕاوەتەوە، چونکە ویستوویەتی شتێك بزانێ کە لەتوانایدا نەبووە.

---

(١) مدخل جديد إلى الفلسفة، ص ٤٠-٤٣.

نموونەیەك لەسەر ئەوە كە عەقڵ سنووردارە، كە جاری دیكەش هێناومەتەوە: دەگێڕنەوە پادشایەك كە كوڕەكەی گیرا بوو، داوای كرد كەسێك هەبێ یارییەكی بۆ دروست بكات، بۆ سەرگەرمیی و بۆ ئەوەی تۆزێ لەبیری بچێتەوە، زانایەكیش هەڵسا یاریی شەترەنجی بۆ دروست كرد، كە شەترەنج لە شەست و چوار (٦٤) خانە پێك دێ، پادشا پێی گوت: ئەوە یارییەكی زۆر گرنگەو لەپادشایانیش دەوەشێتەوە، بەكابرای گوت: تۆش داوای شتێكم لێ بكە، با من پاداشتی دروست كردنی ئەو یارییەت بدەمەوە! ئەویش گوتی: من بەبێ بەرامبەر كردوومە، پادشا گوتی: نابێ، دەبێ هەر داوای پاداشتێك بكەی، گوتی: باشە مادام هەر ئیلحاحم لێ دەكەی: لە خانەی یەكەمی یارییەكەدا، دەنكە گەنمێك و، لە هی دووەمدا، بیكە دوو دەنك و، لە هی سێیەمدا بیكە چوارو، لە چوارەمدا بیكە هەشت، ئنجا شازدەو، سی و دوو و، شەست و چوارو .......هتد ئاوا، تاكو شەست و چوار (٦٤) خانەكە تەواو دەبن!

پادشا گوتی: ئنجا شەرم ناكەی داوای وا بچووك لەمن دەكەی؟ گوتی: بۆچی؟ پادشا گوتی: ئەوە چەند دەكا؟ ئەوە دوو مستە گەنمی كرد! كابرا گوتی: وەرە هەموو گەنمی سەرزەوی حیساب بكە، بەش ناكات! ئنجا لەوانەیە ئێوەش پێتان سەیر بێ، بەڵام وەرن قەڵەم و كاغەز دەست بدەنێ داخۆ دەكات چەند؟ تریلیۆنان دەنكە گەنم دەكات و ملیۆنان تەن دەكات.

وێنەیەكی دیكە:

دووریی نێوان زەوی و مانگ، ئەوپەڕی نزیكییەكەی: (٣٦٠،٠٠٠كم) و زۆرییەكەشی: (٣٨٠،٠٠٠كم)، ئنجا ئەگەر كاغەزێك بێنی، ئەستووریی (سمك)ەكەی (٥،٠ملم) بێ و (٤٨) جار بینووشتێنیەوە، بەرزییەكەی دەكاتە چەند؟ بەڵام بەمەرجێك هەموو جارێ ببێتەوە دوو هێندەی خۆی، ئەوە دەكاتە زیاتر لەدووریی نێوان زەوی و مانگ!

كەواتە: عەقڵ تەنانەت شتێك كە لەبەر دەستی خۆشیەتی، باش بۆی هەزم ناكرێ! ئنجا پێنج هەستەكان (الحواس الخمس)ی ئینسانیش هەر وان، بۆیە

ئەوانەی کە قورئانیان لەبەر دەستدا نەبووە، چی بکەن؟ عەقڵی خۆیان بەکار هێناوەو ویستوویانە: ئەو پرسیارانەی کە لە فیترەت و عەقڵ و خوا ڕسکیاندا هەن، وەڵامیان بدەنەوە، بەڵام بەتەئکید سەرکەوتوو نەبوون، چونکە وەڵامی ئەو پرسیارانە تەنها لەلای وەحیی خوای پەروەردگارە، بۆیە ئەگەر ئینسان فەلسەفە بخوێنێتەوە، شتێکی خراپ نیە، تاکو بزانێ داخۆ مرۆڤ چەندو تاکو دەزانێ؟ بەڵام بەتەئکید ئەوەی کە لە دوو توێی ئایەتێکدا دەستمان دەکەوێ، لە هەموو کتێبی فەلسەفەدا دەستمان ناکەوێ، بۆ گەیشتنە حەق، لەوەدا کە ئەم بوونە چییەو چۆنەو ...هتد؟

هەڵبەتە ئەوقسەیەش لە گۆترە ناکەم و بەرهەمی موتاڵا و ئەزموونی زۆر و جۆراوجۆرە.[١]



---

(١) شایانی باسە لە زنجیرە باسی: [درەوشاوەیی ئیمان و پوچەڵیی ئیلحاد لەبەر ڕۆشنایی: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا] بەدرێژیی لە بارەی فەلسەفە و فەیلەسووفەکانەوە لە بواری ئیمان و ئیلحاد دا دواوین، کە ئێستا ستایش بۆ خوا وێڕای [وێنە و دەنگ - الصورة والصوت] بەشێوەی کتێبیش لە ژێر چاپە.




## ڕێبازی فەلسەفە

(عبدالرحمن بدوي) دەڵێ: {فەلسەفە ڕێبازو بەرنامەكەی ئەوەیە: كە لە هەموو لێكۆڵینەوەكانیدا، پشت بە عەقڵ دەبەستێ و، پشت بەبەڵگە عەقڵییەكان دەبەستێ، بەشێوەیەك كە هەموو كەس بتوانێ بەهۆیانەوە دڵنیا بێ، بۆیە حیكمەت و فەلسەفە، بەبێ بەڵگەی عەقڵیی هەنگاو نانێ (ئەوەش وردەكاریی زۆری هەیە) بۆیە مەنتیق بە لقی فەلسەفە دانراوە (كە ئێستا بۆخۆی زانستێكی سەربەخۆیە)}[1].

بەكورتیی و بە كوردیی:

میتۆد (منهج) و ڕێباز (طریقة)ی فەلسەفە بریتییە لە بەكارهێنانی عەقڵ و هۆش و، ئەو بەڵگانەی لە عەقڵەوە هەڵدەقوڵێن.

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕی پێشوو.




## چەند فەیلەسووفێکی مسوڵمان

١- (الكنـدي): یەکەمین فەیلەسووفی مسولْمان بووە، ناوی تەواوی: (أبو یوسف یعقوب بن إسحاق الكندي) بووە، نازناوی (فیلسوف العرب)ە، لە ساڵانی (١٨٥-٢٥٢ك/ ٨٠١-٨٦٦ز)دا ژیاوە.

گوتوویەتی: پێوەر بۆ هەموو عەقڵ مەندان بریتیە لە وەحیی خوا، ئەوەی کە وەحیی خوا دەیفەرموێ، ئەوە زانیاریی بێ خڵتەیەو، ئەوەی کە مرۆڤ بە عەقڵی خۆی دەیڵێ، خڵتەی پێوەیەو دەگونجێ ڕاستیی نەپێکابێ، {هەندێ لە نووسین و کتێبەکانیم بینیون، بە بۆچوونی من پیاوێکی زۆر هاوسەنگ بووە} دیارە هاوچەرخیش بووە لەگەڵ مەهدیی عەبباسییدا کە لە (١٥٩-١٦٩ك)دا، حوکمی کردوە، هەروەها هاوچەرخ بووە لەگەڵ هاڕوونە ڕەشیددا کە لە (١٧٠-١٩٤ك)دا حوکمی کردوە، لە دەوڵەتی عەبباسییدا، هەروەها پەیوەندیی کردوە بە مەئموونەوە، کە لە (١٩٨-٢١٨ك)دا، حوکمی کردوە، هەروەها (معتصم)ی برای کە لە (٢١٨-٢٢٨ك)دا، حوکمی کردوە، بەڵام لەسەردەمی (متوكل)دا کە لە (٢٣٣-٢٤٧ك)دا، حوکمی کردوە، ئەو لێی تووڕە بووەو دەری کردوە،

مێژونووسەکان دەڵێن: {کندي} زیاتر لە دووسەد (٢٠٠) کتێبی هەبووە، لە هەموو لق و پۆپەکانی زانست و فەلسەفەدا[1].

٢- (الفارابي): فاڕابیی، بە پێچەوانەی کیندییەوە، کیندیی گوتوویەتی: پێوەر بۆ ئێمە قوڕئانە، بەڵام فاڕابیی گوتوویەتی: ئەگەر ئێمە فەلسەفەو حیکمەت بزانین، پێویستییمان بە قوڕئان و شەریعەت ناکا! وەك یۆنانییەکان بیری کردۆتەوەو، ناوی تەواوی: (أبو نصر محمد بن محمد بن أوزلغ بن طرخان الفارابي) (دیارە دەبێ تورك بووبێ) لە ساڵانی: (٢٦٠-٣٣٩ك)دا ژیاوە، لە (فاڕاب) پێگەیشتوەو لە بەغدا نیشتەجێ بووە، دوایی هاتوە بۆ لای (سیف الدولة الحمداني) لە شام، لەژێر سایەی ئەودا ژیاوە، هەندێ کتێبی هەبوون، بۆ نموونە:

١- إحصاء العلوم.

٢- عيون المسائل.

٣- المدينه الفاضلة.

٤- مقالة في العقل.

٥- الجمع بين رأي الحكيمين: أفلاطون وأرسطوطاليس[2].

٣- (إبن سينا): بە (الشيخ الرئيس) ناسراوە، ناوی تەواوی: (أبو علي حسين بن سينا)یە، فارسە، لە ساڵانی: (٣٧٠-٤٢٨ك)دا، ژیاوە، کتێبی زۆرن، گرنگترینیان:

١- القانون في الطب.

٢- أقسام العلوم العقلية.

٣- الشفاء.

---

(١) فلاسفة مسلمون، جعفر آل ياسين، ص١١-١٣.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٢٩-٣٣.

٤- النجاة.

٥- قصيدة في النفس[١].

{ئیبن و سینا}ش هەرچەندە وەك فاڕابی نەبووە، بەڵام زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی فەیلەسووفەکانی یۆنانەوە، سبحان الله! وەك چۆن هەندێ لە ڕۆشنبیرەکانی خۆمان، کاتێ لە حیزبە عەلمانییەکان نزیك دەبنەوە، پاش ماوەیەك ئیسلامەتییەکەیان کاڵ دەبێتەوە، یان یەکێکیان: لەبەر ئەوەی شارەزای بنچینەکانی ئیسلام نیە، تۆزێك هەوای لیبراڵیی دەکەوێتە مێشك، لەخۆی دەگۆڕێ، بەزۆریی ئەو فەیلەسووفانەشم ئاوا دێنە بەرچاو!

٤- (أبو حـامد الغزالـي): هەرچەندە بە فەیلەسووف ناسراو نەبووە، بەڵام لە زۆربەی فەیلەسووفەکان باشتر لە فەلسەفە تێگەیشتوە، ناوی تەواویی: (محمد بن محمد بن محمد)ە، لە نێوان ساڵانی: (٤٥٠-٥٠٥ك)دا ژیاوە، لە گوندی (غەزالە) لە (طوس) لە یەکێك لە شارەکانی خۆراسان لەئێران، لە دایك بووە، ئێستاش گۆڕەکەی لەوێیە.

کۆمەڵێك کتێبی ناوداری هەن:

١- إحياء علوم الدين.

٢- مقاصد الفلاسفة.

٣- تهافت الفلاسفة.

٤- الإقتصاد في الإعتقاد.

٥- إلجام العوام من علم الكلام.

٦- المستصفى في علم الأصول.

٧- المنقذ من الضلال.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٧٧، ٩٢-٩٤.

٨- کیمیای سعادت (بەفارسی).

٩- التبر المسبوك في نصيحة الملوك.

پێشتریش باسمان کرد: کە لە سەردەمی ئەبو حامیدی غەززالییدا {واتە: لە سەدەی پێنجی کۆچیی}دا، باو باوی فەلسەفەی یۆنانیی بوو، وەك چۆن ئێستا زۆر باسی (لیبرالیزم و سیکۆلاریزم و ...هتد) دەکرێ، لەسەردەمی ئەبو حامیدی غەززالیدا، مسوڵمانان زۆر کەوتبوونە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانیی، ئنجا ئەبو حامید هەڵسا دیراسەیەکی قووڵی فەلسەفەی کردو کتێبێکی نووسی بەناوی: (مقاصد الفلاسفة) {ئامانجەکانی فەیلەسووفەکان}، فەیلەسووفەکان گوتیان: وەك غەززالیی لە فەلسەفە تێگەیشتوە، بۆخۆمان لە هەندێ مەسەلە وا لێی حاڵی نەبووین، لەو کتێبەدا هیچ ڕەددی فەلسەفەی نەداوەتەوە، تەنیا باسی فەلسەفەو فەیلەسووفەکانی کردوە، ئنجا دوای ئەوەی زانی فەیلەسووفەکان لێ دەسەلمێنن، کە باش لە فەلسەفە تێگەیشتوە، لەهەندێ مەسەلەدا لەخۆیان باشتر لێیان حاڵی بووە، ئنجا کتێبێکی نووسی بەناوی: (تهافت الفلاسفة) {پووچەڵیی فەیلەسووفەکان}، ڕەخنەی گرت لە فەلسەی یۆنانیی، گوتراوە: لەدوای ئەو کتێبەی ئەبو حامید، جارێکی دیکە فەلسەفەی یۆنانیی لە جیهانی ئیسلامدا لەسەر پێی خۆی نەوەستایەوە، هەرچەندە (إبن رشد) کتێبێکی نووسی بەناوی: (تهافت التهافت) {پووچەڵ کردنەوەی، پوچەڵ کەرەوەی فەیلەسووفەکان}، بەڵام بە هەقیقەت کتێبەکەی غەززالیی کاری خۆی کردو، کتێبەکەی (إبن رشد) بایی ئەوە نەبوو، کە بەرپەرچی کتێبەکەی غەزالیی بداتەوە.

٥- (إبـن رشـد): ناوی تەواویی: (أبو الوليد محمد بن أحمد بن محمد بن رشد) لە ساڵانی: (٥٣٠- ٥٩٥ك)دا، ژیاوە، لە شاری قورتوبە لەدایك بووەو چەند کتێبێکی هەن:

١- بداية المجتهد ونهاية المقتصد.

٢- فصل المقال في ما بين الحكمة والشريعة من الإتصال.

٣- الكشف عن مناهج الأدلة في عقائد الملة.

٤- تهافت التهافت.

شایانی باسە کە (إبن رشد)یش بابایەکی زاناو مسوڵمان بووە، بەڵام زۆر لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانیی بە گشتیی و فەلسەفەی ئەرستۆدا بەتایبەت بووەو، ڕۆژئاواییەکانیش زۆریان گرنگیی پێداوە.

٦- **(إبـن خلـدون)**: ناوی تەواوی: (عبدالرحمن بن محمد بن خلدون)، لە (٧٣٢-٨٠٨ك)دا ژیاوەو لە عەرەبی (حضرموت)ەو، کۆمەڵێك کتێبی هەن، بۆ نموونە:

١- المقدمة، کە لەهەموویان زیاتر بەو کتێبەی ناسراوەو، ئەو کتێبەی (إبن خلدون) بەسەرەتای دامەزراندنی فەلسەفەی کۆمەڵناسیی دادەنرێ.

٢- كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر، في أيام العرب والعجم والبربر، ومن عاصرهم من ذوي السلطان الأكبر.

(إبن خلدون)یش دەگونجێ وەك فەیلەسووفێکی کۆمەڵناسی زەبر دەست دابنرێ.

٧- **(إبن باجة الأندلسي)**: لە ساڵی (١٢٣٨)ز وەفاتی کردووە، گرنگترین بەرهەمەکانی، ئەمانەن:

١- كتاب (تدبير المتوحد).

٢- كتاب (رسالة الإتصال).

٣- كتاب (رسالة النفس).

٨- **(إبن حزم الأندلسي)**: لە ساڵانی (٩٩٤- ١٠٦٤ز)دا، ژیاوە، زیاتر بە فەقیهـ ناوی دەرکردوە، بەڵام بە دڵنیایی پیاوێکی زۆر شارەزای فەلسەفە بووە.

هەندێك لە بەرهەمەکانی:

١- الفِصَل في الملل والأهواء والنِّحَل.

٢- المحلّى.

٣- الإحكام في أصول الأحكام.

٤- طوق الحمامة.

٩- (**إبن طفيل**): لە ساڵی (١١٨٥ز)دا وەفاتی کردوە.

گرنگترین کتێبی، کتێبی (حي بن يقظان)ە.

١٠- (**إبن مسكويه**): لە ساڵی (١٠٣٠ز)دا، وەفاتی کردوە.

کتێبێکی زۆر ناوداری هەیە بەناوی: (الأخلاق، تجارب الأمم وتعاقب الهِمم).

١١- (**محمد إقبال**) لەنێوان ساڵانی: (١٨٧٨-١٩٣٨ز)دا ژیاوە، گرنگترین بەرهەمەکانی:

١- تجديد الفكر الديني.

٢- أسرار الأنا.

٣- رسالة المشرق.

٤- ما الذي يجب أن نفعله الآن؟!

هەڵبەتە ئەمانەمان وەك نموونەی زەق و دیار باسکردن ئەگەرنا فەیلەسووفی دیکەش زۆرن.




## هەڵوێستمان لەبەرامبەر فەلسەفەدا

خوشك و برا بەڕێزەکان! ئەوەی کە بە کورتیی و پوختیی پێتان دەڵێم، بەرهەمی تەمەنێك لە خوێندنەوەو ڕامان و لێوردبوونەوەیە، لەهی هەموو فەلسەفەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو ئیسلامیی و غەیری ئیسلامیی:

فەلسەفە بەرهەمی بیر کردنەوەو تێوەڕامانی عەقڵی بەشەرە، هەم لەخۆی، هەم لە بوون و گەردوون و دەورو بەر، هەم لە خوا سبحانە وتعالی، بۆیە هەم پێکانی تێدایە، هەم هەڵەی تێدایە، ئنجا بەردەوام فەلسەفە لە گۆڕاندایە، وەك هەموو زانستێکی دیکە، دەگونجێ شتی چاکی تێدا زیاد بێ و، دەشگونجێ شتی هەڵەی تێدا پەیدا بێ، بەڵێ: فەلسەفە هەوڵی مرۆڤ بووە لە بواری {بوونناسیی- ontology}دا، بۆیە ئێمە کاتێ کتێبێکی فەلسەفە دەخوێنینەوە، دەبێ بەو چاوە تەماشای بکەین: کە هەوڵی بەشەرە بۆ زانینی ڕاستیی شتەکان، ئنجا باسیشمان کرد کە: عەقڵی مرۆڤ چەند سنووردارە، هەستەکانی بەهەمان شێوە! هەڵبەتە ئەگەر مرۆڤ توانیبای ڕاستییەکان بزانێ:

١- چ ئەو ڕاستییانەی پەیوەنییان بە بوون و گەردوون و مرۆڤەوە هەیە.

٢- چ ئەو ڕاستییانەی پەیوەندییان بە لایەنی مەعنەوییەوە هەیە.

٣- چ ئەو ڕاستییانەی پەیوەندییان بە ژیانی دنیاوە هەیە.

بەڵێ ئەگەر خوا زانیبای: مرۆڤ بۆخۆی دەتوانێ ئەو شتانە بزانێ، بێگومان ئەو هەموو پێغەمبەرانەی سەلامی خوایان لێبێ نەدەناردن و ئەزیەت نەدەدان و، ئەو هەموو کتێبانەی دانەدەبەزاندن، ئنجا کە دەفەرموێ:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء

واتە: پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن، تاکو دوای هاتنی پێغەمبەران، هیچکەس بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە بەبێ وەحیی، مرۆڤ ناتوانێ نەخۆی، نە خوا، نەبوونەوەر، وەك پێویست بناسێ و، نەدەشزانێ لەکوێ هاتوەو بۆ کوێ دەچێ؟

ئەوە کورتەی قسەی منە لە بارەی فەلسەفەوە، بەڵام وا چاکە مسوڵمان شارەزا بێ و بخوێنێتەوە.

ئنجا (أبو حامد الغزالي) لە کتێبی: (تهافت الفلاسفة)دا، لە سێ مەسەلاندا فەیلەسووفە مسوڵمانەکانی بە کافر داناون، کە بەڕای بەندە باشتر وایە بگوترێ: سێ قسەیانی بە کوفر داناون:

١- ئەوانەی گوتوویانە: خوای زانا وردەکارییەکان (جزئيات) نازانێ.

٢- ئەوانەی کە نکوڵییان کردوە لە زیندوو بوونەوەی جەستەیی.

٣- ئەوانەش کە گوتوویانە: ئەم بوونە سەرەتای نیە[1].

گوتوویەتی: هەر کام لەو سێ بیرۆکەیە (کوفر)ە، بەڵام ئایا هەر کەس وایگوتبێ، بە کافر لەقەڵەم دەدرێ؟ دیارە ئەگەر تەئویلێکیان بووبێ و

---

(١) كتاب الرد على المنطقيين، إبن تيمية، ص ٥٢٣.

بەجۆرێك لێی حاڵی بووبن، كە تێك نەگیرێ لەگەڵ سیفەتە بەرزەكانی خوای پەروەردگاردا، بەكوفر دانانرێ، یاخود ئەگەر بۆچوونەكان بە كوفریش دابنرێن، مەرج نیە ئەوان بەكافر دابنرێن، بەهەرحاڵ ئینسان دەبێ لە بەكافر دانانی خەڵكیدا دووربین و وریابێ.

ئێمە لە تەوەری پێنجەمدا باسێكمان هەیە دەربارەی پەیوەندیی نێوان عەقڵ و وەحیی، خوا پشتیوان بێ لەوێدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم بابەتە.




# تەصەووف و صۆفییەکان

# ( التصوُّف والصوفية )

١- وشەی تەصەووف لە چییەوە هاتوەو کەی پەیدا بووە؟

٢- سەرەتای سەرهەڵدانی تەصەووف.

٣- ناوەکانی تەصەووف.

٤- پێناسەی تەصەووف و نێوەڕۆکەکەی.

٥- گەشە کردنی تەصەووف.

٦- سەرهەڵدانی ڕێبازەکانی تەصەووف و گرنگترین ڕێبازەکانی.

٧- هەڵسەنگاندنێکی کورت بۆ تەصەووف و تەزکیەی نەفس.

بەڕێــزان!

خوا یاربێ بە کورتیی لەو حەوت (باس)ەدا، کە ناوونیشانەکانیانمان خستنە ڕوو، لەبارەی تەوژمی تەصەووفەوە دەدوێین، کە ئەو ناوە (التصوف) باوترە، ئەگەرنا من زیاتر وشەی (تزكية) بەکار دەهێنم، کە وشەیەکی قورئانییە، بەڵام زیاتر وشەی تەصەووف وەك ناوو نیشانێك بۆ بابەتی مەعنەویی و ڕووحیی، برەوی هەیەو ناسراوەو زانراوە.




## وشەی تەصەووف لە چییەوە هاتووەو کەی پەیدا بووە؟

### یەکەم: وشەی (تصوف) لە چییەوە هاتوە؟

{لەو بارەوە کە وشەی (تصوف) لە چییەوە هاتوە؟ چەند ڕایەك هەن، کە بەکورتیی ئەمانەن:

١- (تصوَّف: أي لبِسَ الصُّوفَ فهو صوفِي)، واتە: (تَصَوَّفَ) یانی: بەرگی خوریی لەبەر کردو ئەو خورییی پۆشە.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە (أهل الصُّفَّة)وە، هاتوە، سوففە شوێنێکی بەرزایی، سەکۆیەك بووە بەتەنیشت مزگەوتی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) سەقفێکیشی هەبووە، ئەوانەی کە بێ ژن و ماڵ بوون، لەوێدا پشوویان داوە.

٣- هەندێ گوتوویانە لە (الصفُّ الأول)ەوە هاتوە، ئەوانەی هەمیشە ویستوویانە لە ڕیزی یەکەمی نوێژ، یان جەنگ لە دژی دوژمناندا بن.

٤-هەندێکی دیکە گوتوویانە: وشەی (صوفة) (قبیلة بدویة) هۆزێکی بیابانشین بوون، دیارە زۆربەی ئەو کەسانەش لەو هۆزە بوون، بۆیە ئەو ناوەیان بەدوا کەوتوە.

٥-هەندێکی دیکە گوتوویانە: (الصوفانة) یانی: (بقلة)، کە دانەوێڵەیەکە دەخورێ، ئنجا زیاتر وەك دنیا بەکەمگرتن (زهد)، ئەوانە ئەو جۆرە خواردنەیان خواردوە.

٦- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە (صوفة القفا)ەوە هاتوە یانی: (الشعرات النابتة على القَفا)، واتە: ئەو مووانەی کە لە پشتی سەر دێن، یانی: زۆر خزمەتی خۆیانیان نەکردوەو دەستیان بەخۆیاندا نەهێناوە.

٧- هەندێکی دیکە گوتوویانە: (صوفي) لە (صفا)ەوە هاتوە، واتە: خۆی صاف کردەوە.

٨- هەندێکی دیکە گوتوویانە: وشەیەکی یۆنانییە (سوفوس) یان (تیوسوفیا)، لەوێوە هاتوە}[1].

بەڵام ئەوەی کە زۆربەی زانایان لەسەرنی، وەك (إبن تیمیة)و غەیری ئەویش پشتگیرییان کردوە، ئەوەیە کە بۆچوونی یەکەمیان ڕاستە کە دەڵێ: لە (صوف)ەوە هاتوە، لەڕووی زمانی عەرەبییشەوە، هیچ کام لەوانی دیکە ناگونجێ (صوفي) لەوانەوە هاتبێ، ئەوەش لەبەر ئەوە بووە، هەرچەندە ئەو کات جگە لە بەرگی خوریی {صوف} بەرگی دیکەش هەبووە، وەك ئاوریشم و کەتان و لۆکەو تووك (وَبَر)و موو، بەڵام وا پێدەچێ ئەو کاتە بەرگی خوریی لە هەمووان هەرزانتر بووبێ، ئەوانیش ئەو بەرگەیان لەبەر کردوە، وەك دنیا بەکەمگرتن، ئەوە وەك ئەصڵی وشەی (صوفي).

## دووەم: وشەی (صوفي) و (صوفية) کەی سەری هەڵداوە؟

وشەی (صوفي) کە بۆ (تاك) بەکار دێ، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زایینیدا، دەرکەوتوە، بەپێی ڕای هەندێ لە زانایان: یەکەم کەس کە ئەو وشەیەی بۆ بەکار هێنراوە: (جابر بن حیان)ە، کە زانایەکی ناوداری شیعە

---

(١) دائرة المعارف الإسلامية، ج٧ص ٢٢١٤-٢٢١٨.

بووەو، خەڵکی شاری (کووفە) بووەو لەساڵی (٢٥٣ك)دا، کۆچی دوایی کردوە، ئەمە ئەگەر وەك (تاك) بەکار بێ.

بەڵام ئەگەر وەك (کۆ) بەکار بێ: (الصوفية) بۆیەکەم جار، وەك سەرچاوە مێژوویەکان دەڵێن: لەساڵی (١٩٩ك)دا، ئەو وشەیە بەکار هاتوە لە باسی فیتنەو ئاشووبێکدا، کە لە ئەسکەندەرییە ڕووی داوە، بۆ یەکەم جار ئەو وشەیە لەوێ بەکار هێنراوە، وەك کۆ[1].



---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕی پێشوو.




## سەرەتای سەرهەڵدانی تەصەووف

هەندێ لە سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: سۆفییگەریی (تصوف) لە ساڵی (٢٥٠ك)دا، دەستی پێکردوە، {بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە وەك ناوەکەی، نا، بەڵام وەك نێوەڕۆکەکەی، لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بووە، چونکە پێشەوای هەموو کەس، لە تەزکیەی نەفس و لەهەر کارێکی چاکەدا، پێغەمبەری خاتەم بووە (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها پێغەمبەرانی پێشووش، خاوەنی ئەو پەڕی نەفسی تەزکیە کراو بوون.

ئنجا کە دەڵێن: سەرەتای تەصەووف لە ساڵی (٢٥٠)ك دەستی پێ کردوە واتە: وەك کۆمەڵێك خەڵك، کە کۆببنەوەو وەك کۆمەڵێك خەڵکی پسپۆڕو شارەزا، کاری تایبەتیی بکەن لەسەر تەزکیەی نەفس و لایەنی مەعنەویی، مەبەستیان پێ ئەوەیە، ئەگەرنا وەك لایەنی تەزکیەی نەفس، هەر لەسەرەتاوە هاوەڵان لە هەموو کەس زیاتر پشك و بەشیان هەبووە لە تەزکیەی نەفسدا}[1].

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

لە ساڵی (٢٥٠ك)دا، دەست کرا بە هەندێ کۆبوونەوەو هەندێ بازنە لە مزگەوتەکاندا دەبوون و، دەرس دەربارەی تەزکیەی نەفس لە مزگەوتەکاندا دەگوترایەوەو، ئامۆژگاریی خەڵك دەکرا، ئنجا لە سەدەی سێی کۆچییدا بۆ یەکەمجار کێشە و مشت و مڕ کەوتە نێوان شەرعزانان و ئەهلی تەصەووفەوە، لەسەر هەندێ باس و بابەت، کە مەرجیش نیە هیچ کامیان هەقی ڕەهای پێ بووبێ، بەڵام شەرعزانەکان زیاتر ڕواڵەتی شەریعەتیان بینیوەو، ئەوانی دیکەش زیاتر تەماشای دیوی پەنهانی شەریعەتیان کردوە، هەروەك بەسەرهاتەکەی مووسا سەلامی خوای لێبێ لەگەڵ بەندە صاڵحەکەدا، مووسا سێ جار ڕەخنەی لێ دەگرێ، بەڵام دیارە ئەو بەندە چاکە دیوی پەنهانی شتەکانی دەبینێ، دواییش بۆ مووسای ڕوون دەکاتەوە: بۆچی ئەو کارانەی کردن! بەڵام مووسا سەلامی خوای لێبێ کە بە پێی ڕواڵەتی شەرع حوکمی کردوە، ڕەخنەی لێ گرتوە، دیارە هەم مووساش و هەم ئەو پیاوەش، هەردووکیان لەسەر هەق بوونە {هەریەکەی لە ڕوویێکەوەو بە ئیعتیبارێك}.

هەر لەو سەردەمەشدا کۆمەڵێك لە ئەهلی تەصەووف، لەلایەن شەرعزانەکانەوە، بران بۆ لای قازیی، بۆ دادگایی کران: لەوانە (ذوالنون المصري، أبو حمزة، الحلاّج) کە دیارە دوایی حەللاج لە سێدارە دراوە[1].



---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.




## ناوەکانی تەصەووف

ئەم بابەتەی: پسپۆڕیی لەڕوویی مەعنەویی و سەرنجدانی دیوی پەنهانی کردەوەکانەوە، ناوونیشانی زۆری بۆ بەکار هێنراون، کە دە (١٠)یانمان وەك گوڵبژێر هێناون:

١- علم القلب - زانیاریی دڵ.

٢- علم الأسرار - زانیاریی نهێنییەکان.

٣- علم المعارف - زانیاریی زانستەکان.

٤- علم الباطن - زانیاریی دەروون و پەنهان.

٥- علم الأحوال والمقامات - زانیاریی حاڵ و مەقامەکان.

٦- علم السلوك - زانیاریی ئاکار.

٧- علم الطريق - زانیاریی ڕێبازی بەرەو خوا چوون.

٨- علم المكاشفة - زانیاریی دەرکەوتنی ڕاستییەکان.

٩- علم التزكية - زانیاریی پاك و چاك بوون.

١٠- التربيه الروحية - پەروەردەی ڕووحیی[١].

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٨ ص٢٢٤٢.




## پێناسەی تەصەووف و نێوەڕۆکەکەی

کۆمەڵێك پێناسەم هێناون، کە سەرجەم دوازدە (١٢)ن، هەندێکیان بە گشتیی ڕوونی دەکەنەوە، چونکە زانیاریی تەصەووف تایبەت نەبووە بە ئەهلی ئیسلامەوە، جاریٚ وەك (تزكية) هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لیٚ بیٚ، هاتوون خەڵك تەزکیە بکەن، ڕەوشت و ئاکاریان جوان بکەن، بۆیە ئەم ڕەوتە، تایبەت نیە بە ئەهلی ئیسلامەوە:

١- {التصوف نشاط معرفي وسلوكي، يَتَّخِذُهُ الإنسانُ لتحقيق كماله الأخلاقي، والإتصال بمبدأ أسمى وعرفانه بالحقيقة، وتحقيق سعادته الروحية، والتصوف مشترك بين ديانات وفلسفات وحضارات متباينة، في عصور مختلفة}[1].

واتە: تەصەووف {بەگشتیی} چالاکییەکی مەعریفیی و ئاکارییە، کە مرۆڤ دەیگرێتە بەر، بۆ تەواو کردنی ڕەوشت و ئاکاری خۆی {مامەڵە لەگەڵ خواو لەگەڵ خەڵکی خوادا} بۆ پەیوەست بوون بە خوای پەروەردگارەوەو ناسینی بەشێوەیەکی ڕاستەقینەو، بۆ هێنانەدی بەختەوەریی ڕووحیی و مەعنەویی و،

---

(١) الموسوعة العربية ج٦ ص٥١٣.

تەصەووف حاڵەتێکی هاوبەشە لەنێوان چەندان ئایین و فەلسەفەو شارستانیی جۆراو جۆر، لە چاخە جیاوازەکاندا.

٢- {التصوّف: طريق من طرق العبادة، يتناول الأحكام الشرعية، من ناحية معانيها الروحية، وآثارها في القلوب، فهو يقابل: علم الفقه الذي يتناول ظواهر تلك العبادات ورسومها، ثم انتقل التصوف فأصبح طريقاً للمعرفة، يقابل طريق أرباب النظر من المتكلّمين}[١].

واتە: تەصەووف ڕێیەکە لە ڕێیەکانی خوا پەرستیی، کە باسی یاسا شەرعییەکان دەکات لەڕووی نێوەڕۆکیانەوەو، لەڕووی شوێنەوارە پەنهان و نادیارەکانیانەوە، لەسەر دڵ و دەروون، بۆیە تەصەووف و تەزکیە لەم ڕووەوە کە باسمان کرد: لەبەرامبەر زانیاریی فیقە دایە، کە زانیاریی فیقە باسی ڕواڵەتی کردەوەکان و یاسا شەرعییەکان دەکات و باسی دیوی دەرێیان دەکات، بەڵام دوایی تەصەووف بوو بە ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی خواناسیی لەبەرامبەر ڕێبازی ئەهلی کەلامدا {ئەو زانایانەی کە لە ڕووی عەقڵیی و زانستییەوە، باسی خواناسیی دەکەن}، بەڵام تەصەووف لەڕووی ڕووحیی و دەروونییەوە، باسی دەکات {هەردووکیشیان هەر ڕێن و ئینسان بە خوای پەروەردگار دەگەیەنن، بەڵام بەتەئکید وەك پێشتریش باسمان کرد: ئەگەر هەردووکیان بەیەکەوە کۆ بکەیەوە، ئەوە ڕاست و دروستە}.

٣- {التصوف: حركة دينية انتشرت في العالم الإسلامي في القرن الثالث الهجري، كنزعاتٍ فردية تدعو إلى الزهد وشدة العبادة، كرد فعل مضاد للإنغماس في الترف الحضاري، ثم تطورت تلك النزعات بعد ذلك حتى صارت طرق مميزة معروفة باسم الصوفية، ويتوخّى المتصوفة تربية النفس والسمو بها بغية الوصول إلى معرفة الله تعالى بالكشف والمشاهدة، لا عن طريق إتباع الوسائل الشرعية، ولذا جنحوا في المسار حتى تداخلت طريقتهم مع الفلسفات: الوثنية الهندية والفارسية واليونانية المختلفة}[٢].

واتە: تەصەووف بزووتنەوەیەکی ئاینییە لە سەدەی سێیەمی کۆچییدا، لە جیهانی ئیسلامییدا بڵاو بۆوە وەك داخوازییەکی تاکیی، بانگەشەی بۆ دنیا

---

(١) دائرة المعارف الإسلامية ج٨ ص ٢٢٤٢.

(٢) الموسوعة الميسَّرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، د. مانع بن عباد الجهني، ج١ ص٢٤٩.

بەکەمگرتن و بە خەستیی خوا پەرستن دەکرد، وەك کاردانەوەیەکی دژ بۆ خۆشگوزەرانیی شارستانیی، دوایی ئەو حاڵەتە تاکییە گەشەی کرد تاکو بوو بەچەند ڕێبازێکی جیاوازی ناسراو بۆ سۆفیگەریی.

سۆفیگەریی مەبەستی پەروەردە کردنی دەروون و بەرزکردنەوەی بەمەبەستی ناسینی خوا بەشێوەی دەرکەوتن (گشف) و بەچاوی دڵ بینینی، نەك لە ڕێی ئامرازە شەرعییەکانەوە، هەر بۆیەش لە ڕێ لایاندا، تاکو ڕێبازەکەیان لەگەڵ فەلسەفە بتپەرستییەکانی هیندیی و فارسیی و یۆنانییە جۆراو جۆرەکاندا، تێکەڵ بوو.

(الجرجاني)یش بەچەند شێوەیەك پێناسەی تەصەووف دەکات[1]:

٤- {مذهب كلُّهُ جِدٌّ، فلا يخلطونه بشيء من الهَزْل}.

واتە: تەصەووف ڕێبازێکە هەمووی جیددییەتە، هیچ گاڵتەو سوعبەتی تێکەڵ ناکەن.

٥- {وقيل: تصفية القلب عن موافقة البرية، ومفارقة الأخلاق الطبيعية، وإخماد صفات البشرية، ومجانبة الدعاوى النفسانية، ومنازلة الصفات الروحانية}.

واتە: گوتراوە: پاك کردنەوەی دڵ و دەروونە لەوە کە ئینسان وەك خەڵك بکات {خەڵك چی کردوە تۆش وا بکەی، بەبێ ئەوەی تەماشا بکەی: داخۆ ڕاستە، یان ناڕاستە؟} و خۆ دوورگرتنە لەڕەوشتە سروشتیی و غەریزەییەکان و، کپ کردنەوەی سیفەتە (خراپە)کانی مرۆڤەو، خۆ دوور گرتنە لە بانگەشەی نەفسانیی {ئەو شتانەی کە لە دەروونی شەیتانییەوە، سەرچاوە دەگرن} و خۆ بردنە پێشە لەو سیفەتە ڕووحانییانەی کە شەریعەت بە پەسەندی داناون.

٦- {الوفاء لله تعالى على الحقيقة، واتباع رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في الشريعة}.

واتە: وەفاداریی بۆ خوا بە شێوەیەکی ڕاستەقینەو، شوێنکەوتنی نێردراوی خوا لەو شەریعەتەدا کە خوا پێیدا ناردوە.

---

(١) بڕوانە: التعريفات، ص٦٥، ٦٦.

٧- {بَذْلُ المجهود والأُنْسُ بالمعبود}.

واتە: ئەوەی لەتواناتدا هەیە بەکاری بێنی لەڕووی ماددیی و مەعنەوییەوە، بۆ ڕەزامەندیی خواو، دڵخۆش بوون و هۆگر بوون بە پەرستراوەوە.

٨- {الصبر تحت الأمر والنهي}.

واتە: خۆڕاگرتن لەژێر ئەمرو نەهی شەریعەتدا.

٩- {صفاء المعاملة مع الله تعالى، وأصله التفرُّغ عن الدنيا}.

واتە: ئەوەیە ئینسان لە هەڵس و کەوتی لەگەڵ خوادا، صاف بێ و خڵتەی ڕەگەڵ نەخات، بناغەکەشی ئەوەیە ئینسان دەست بەتاڵ بێ لە دنیاو خۆی بۆ خوا یەکلا بکاتەوە.

١٠- {الأخذ بالحقائق، والكلام بالدقائق، والإياس ممّا في أيدي الخلائق}.

واتە: وەرگرتنی حەقیقەتە شەرعییەکان و، قسە کردنی ورد دەربارەی کردەوەکانی دڵ و دەروون و، نائومێد بوون لەوەی کە لە دەستی خەڵك دایە[١].

١١- (إبن القيم) دەڵێ: {التصوف هو الخُلُق}[٢].

واتە: تەصەووف هەمووی بریتیە لە ڕەوشت و ئاکاری بەرز.

١٢- منیش دەڵێم: تەزکیەی نەفس: بریتیە لەوە کە ئینسان خۆی پاك بکات و چاك بکات.

هەندێ لە ئەهلی تەصەووف گوتوویانە: (التخلية من الرذائل والتحلية من الفضائل) واتە: خۆ بژار کردن لە سیفەتە نزم و پەستەکان و، خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەکان.

---

(١) مەرج نیە من لەگەڵ هەموو ئەو پێناسانە دابم.

(٢) مدارج السالكين، ج٢، ص٣٠٧.




## گەشە کردنی تەصەووف

سەرەتا بزانن! زانستی تەزکیەو خۆ پاك و چاك کردن، وەك هەموو زانستەکانی دیکە، پێشێ بە شێوەیەکی سادە دەستی پێ کرد، بۆ وێنە: زانستی (نحو) دەڵێن: عەلی خوا لێی ڕازی بێ، چەند بنەمایەکی بە (أبو الأسود الدوئلي) گوتوە، پاشان ئەو هەموو لق و پۆپەی لێ بوونەوە، هەروەها زانستەکانی دیکەش بەهەمان شێوە، پێشێ بە سادەیی دەست پێ دەکەن، دوایی ئاڵۆز دەبن.

سەرەتا تەصەووف وەك دنیا بەکەمگرتن (زهد) دەستی پێ کرد، هەروەها خۆ یەکلا کردنەوە بۆعیبادەت و تاعەت، لەسەرەتاوە هیچ کەس وشەکانی: (صوفي) و (عابد) و (زاهد) و ئەوانەی بەکار نەدەهێنان، چونکە هیچ ناوێك لەناوی هاوەڵ (صحابي) گەورە تر نەبوو، هەتا وشەی (صحابي) هەبێ، بۆ ناساندنی ئەو جیلەی کە لەگەڵ پێغەمبەر دابوون (صلى الله عليه وسلم)، کە گوتت: (صحابي) یانی: دەبێ: عابیدو زاهیدو عالیم و موجاهیدیش بێ، لەدوای وانیش وشەی (تابعين) بەکار دەهێنرا، بۆ وێنە حەسەنی بەصرایی (سيد التابعين) ە، دوای ئەوانیش پێیان دەگوتن: (تابعي التابعين)، یانی هەتا ئەو نازناوانە

هەبوون، وشەی دیکەیان بەکار نەدەهێنا، پێشێ زیاتر وشەکانی: (عُبّاد، زُهّاد، نُسّاك) بەکار دەهێنران، ئنجا دوایی وشەی (صوفي) بەکارهات.

تەصەووف زیاتر لە سەدەکانی (سێ و چوار)ی کۆچییدا گەشەی کرد، زانستەکانی دیکەش هەتا کۆتایی سەدەی چوار هاتوون و گەشەیان کردوە، (تەفسیر، فیقه، فەرموودە، قیرائات، مێژوو، عیلمی کەلام) ئەو کاتە بەڕاستیی مسوڵمانان خەریکی پێشکەوتن و داهێنان (إبداع) بوون لە دنیاداو، خەریکی شوێن کەوتن (إتباع) بوون لە خواپەرستییدا، نەك لاسایی کردنەوەی کوێرانە، بۆیە لەو کاتەدا مسوڵمانان توانیان گەشە بکەن و، بەرەو پێش بچن لە هەموو ڕووێکەوەو، هەموو زانستەکان لەوێوە گەشەیان کرد، دوایی کە دەرگای ئیجتیهادیان داخست لە هەموو ڕووەکانەوە، ئەو شتانە شکڵیان گرت و شکڵێکی قاڵب بەستوویان گرت، ئیدی لەوێوە لەڕووی فیکریی و سیاسیی و ...هتدەوە، بەرەو سەرەو لێژ بوونەوە چوون.

دەتوانین ئەهلی تەصەووف لەو دوو سەدەی سێ و چواردا، دابەش بکەین بۆ سێ چین:

**چینی یەکەم:** ئەو تەوژمە بوون کە زیاتر بەم شتانە ناسرا بوون: دنیا بەکەمگرتن و خۆ دوور گرتن لە دنیاو، زێدەڕۆیی کردن لە عیبادەتی شەخصییدا، بەشێوەیەك کە تۆزێك جیاواز بوو لە هی پێشینی یەکەم، لەهی چینی یەکەمی هاوەڵان و شوێنکەوتووان.

ئەوانەی کە لەم چینی یەکەمەدا، زیاتر دیار بوون، ئەمانە بوون:

١- الحارث المحاسبي: (٢٤٣)ك.

٢- الشیخ جنید البغدادي، (أبو القاسم الخرّاز) (٢٩٨)ك، نازناوی (سید الطائفة)ی هەبووە.

٣- أبو سلیمان الداراني: (٢١٥)ك.

٤- السري السقطي: (٢٥٣)ك.

٥- سهل بن عبدالله التستري: (٢٧٣)ك.

٦- هەر لەو سەردەمەدا جووڵانەوەیەك سەری هەڵدا بەناوی: (الحركة الملامَتيّة) كە (حمدون بن أحمد القصّار النيسابوري) (٢٧١)ك، سەرپەرشتیی دەكرد (الملامتية) واتە: ئەوانەی هەمیشە خەریكی لۆمەو سەرزەنشتی خۆیان بوون.

جارێ لەم چینی یەكەمەدا شتی فیكرییان تێكەڵ نەكردبوو، تەنیا گرنگیی دان بوو بە عیبادەتی شەخصیی و پاك كردنەوەی ناخ و دڵ و دەروون.

چینی دووەم: لەم چینەدا، عیبادەتە شەخصییەكان تێكەڵ كران، لەگەڵ هەندێ زاراوەو وشەی (باطينيی)، بەڵام نەك بەمانا شیعییەكەی، بەڵكو بەمانای ئەوە كە دیوی پەنهانی شتەكانیان باس دەكرد، هەندێ تەعبیریان بەكار دەهێنان، خۆیان زیاتر لێی تێ دەگەیشتن، عیبادەت كردنی شەخصیی لە مومارەسەی كردەوەییەوە، گواستیەوە بۆ ئاستی تیۆرامانێكی تەجریدیی تیۆریی و، هەندێ زاراوە پەیدا بوون وەك: (الوحدة، الفناء، الصحو، الكشف، البقاء، الأحوال، المقامات، ...)، ئەوانە كۆمەڵێك زاراوە بوون، ئەهلی ئەو بازارە بەكاریان دەهێنان، مەرجیش نیە بە مەبەستی خراپ بووبێ:

١- (الوحدة): مەبەستیان خوا بەیەكگرتن و تەنیا خوا دیتن و، تەنیا خوا بە هەمەكارە زانین، بوو.

٢- (الفناء في الله): ئەمە واتای ڕاست و هەڵەشی هەیە: مانا ڕاستەكەی یانی: وات لێبێ لەبەرامبەر شەرعی خوادا، دەمارێكت نەمێنێ بجووڵێ پێچەوانەی شەرعی خواو تەواو تەسلیمی خوابی.

بەڵام بەمانای (وحدة الوجود) - كە دوایی باسی دەكەین - كە ئینسان لەخوادا بتوێتەوەو بوونی نەمێنێ، یاخود خوا لە ئینساندا بەرجەستە ببێ، وەك دەڵێن: حەللاج وای گوتوە، ئەوە واتایەكی هەڵەیە.

٣- (الصَّحو): واتە: ئینسان هەمیشە هۆشیارو بێدار بێ، لەبەرامبەریدا (مَحو) هەبووە، واتە: ئینسان مەحو بێتەوەو نەمێنێ لەبەرانبەر خوادا.

٤- (الكشف): واتە: دەركەوتن.

٥- (البقاء): ئەوەیە كە تۆ بمێنیەوە، بەڵام بەخواوە بمێنیەوە.

٦و٧- (الأحوال والمقامات): كۆی حاڵ و مەقامن، حاڵ ئەوەیە كە دەوام ناكات و، مەقام ئەوەیە كە دەوام دەكاو دەمێنێتەوە، ئەو حاڵەتانەی كە ئینسان پێیاندا دەڕوات، لە كاتێكدا كە خەریكی تەزكیەی نەفسی خۆی دەبێ.

ئەوانەی لەم چینی دووەمەدا زیاتر دیار بوون:

١- (أبو یزید البسطامي)، ناوی (طیفور) بووە، لە (٢٦٣ك)دا وەفاتی كردوە، لەڕووی كاتەوە لەگەڵ تەبەقەی یەكەم تێكەڵ بووە، بەڵام {ئەبوویەزید} هەندێ وشەی بەكار هێناون كە ئەوانەی پێشێ بەكاریان نەهێناون، ئەگەرنا لەڕووی كاتەوە هەندێ تێكەڵن.

٢- ذو النون المصري: (٢٤٥)ك.

٣- الحلاج (أبو منصور): (٣٠٩)ك.

٤- أبو سعید الخراز: (٢٧٧)ك.

٥- الحكیم الترمذي: (٣٢٠)ك.

٦- أبو بكر الشبلي: (٣٣٤)ك.

چینی سێیەم: لەم چینەدا تەصەووف وردە وردە لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانییدا ئاوێتە بوو، هەندێ بیرۆكەش پەیدا بوون، وەك: (حلول) كە ئەوەیە خوا بێتە نێو جەستەی مرۆڤەوەو، (إتحاد)یش ئەوەیە مرۆڤ لەگەڵ خوادا یەك بگرێ، (وحدة الوجود) ئەوەیە كە بوون (وجود) هەمووی بەیەك تەماشا بكەی، واتە: بوون هەمووی یەك شتەو، خواش ڕووحی ئەو بوونەیە، كە ئەوە كوفرو شیركە، ئەگەر ئینسان لەحاڵەتی ئاساییدا بیڵێ، بەڵام هەندێ حاڵەتی ڕووحیی كە

بەسەر مرۆڤدا دێ، زۆر لە زانایان دەڵێن: لەو کاتەدا کە ئینسان هۆشی لەخۆی نەبێ، بۆی بە کوفر لەقەڵەم نادرێ، ئینسان هەندێ حاڵەتی ڕووحیی بەسەردادێ، تەنیا خوا دەبینێ و، ئەو دروستکراوانەی دیکە، هەموویان وەك خەیاڵ دێنە بەرچاوی، ئەوە کە غەیری خوا، هەمووی وێنەو دیمەنی بۆش و وەهمە! هەندێ لە فەیلەسووفەکان قسەی وایان کردوەو، ئەو ئەهلی تەصەووفەش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەو فەلسەفەیە.

هەر لەو سەردەمەشدا بیردۆزەی: (فیض) و (إشراق) لەسەر دەستی {ئەبو حامیدی غەززالیی} و {سوهرەوەردیی} پەیدا بوون، هەر چەندە من پێم وایە غەززالیی بەو شێوەیە نەبووە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو سەرچاوەیەی من لێم وەرگرتوە، وا دەڵێ، بەڵام من پشتڕاستی ناکەمەوە، هەرچەندە ئەبو حامیدی غەززالییش باسی دەکا، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە سوهرەوەردیی باسی دەکات، سوهرەوەردیی بە فەرمانی صەلاحەددینی ئەییوبی کوژراوە وەك سزادان، بەڵام ئەبو حامیدی غەززالیی پیاوێکی زۆر پایەند بووە بە شەریعەتەوە.

لە دیارترین کەسایەتییەکانی ئەم چینی سێیەمە:

١- الحلاج: (٢٤٤-٣٠٩)ك.

٢- السهروردي: (٥٤٩-٥٨٧)ك.

٣- إبن عربي: (٥٦٠- ٦٣٨)ك.

٤- إبن الفارض: (٦٣٢)ك.

٥- إبن سبعين: (٦١٣-٦٦٧)ك.

ئەمانە دیارترین کەسایەتییەکانی ئەم چینی سێیەمە بوون، کە لەو چینی سێیەمەوە، تەصەووف و ڕێبازەکانی تەصەووف، بەرەو لادان و دوورکەوتنەوە لە شەریعەت چوون[1].

---

(١) الموسوعة العربية، ج٦، ص٥١٣-٥١٧، و (الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة)، ج١، ص ٢٤٩.




# سەرهەڵدانی ڕێبازەکانی تەصەووف و گرنگترین ڕێبازەکانی

بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان: یەکەمین کەسێك کە پەیکەری ڕێبازی تەصەووفی دانا {کە ئێستا تەریقەتەکان (چ قادریی چ نەقشیی و...هتد) دەڵێن: وەریانگرتوە لە فلان و ئەویش لە فلان و تا کۆتایی} یەکەمین کەس کە داینا، پیاوێك بوو بەناوی (أبو سعید محمد بن أحمد الميهمي الصوفي الإيراني)[1] {وڵاتی ئێران کاتی خۆی هەموویان ئەهلی سوننەت بوون، لەسەردەمی صەفەوییەکانەوە، سوننییەکان پاکتاو کران، ئەگەرنا: (غزالي، رازي، ترمذي، أبو داود، راغب الأصفهاني ...هتد) ئەوانە هەموویان خەڵکی ئێران بوون، ئێران جگە لە کەمێك، شیعەی هەر لێ نەبوون، بەڵام لەسەردەمی صەفەوییەکاندا، سوننەیان قەلاچۆ کردو هەمووی چوو بۆ دەرەوەی ئێران، ئێستا دەورو بەری ئێران هەمووی سوننەیە، تورکمانستان و بلوچستان و کوردستان و خوزستان، هەرچواردەوری سوننەیە، بەڵام نێوەڕاستەکەی، مەگەر چۆن،

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان .... ج١ ص٢٤٩-٣٠٣ ، و (الموسوعة العربية)، ج٦ ص٥١٣-٥١٧.

ئەگەرنا سوننەیان تێدا نەهێشتوە} ئەو کابرایە لەنێوان ساڵانی: (٣٥٧-٤٣٠ك)دا ژیاوەو قوتابی (أبو عبدالرحمن السلمي) بووە، یەکەمین کەس بووە کە پەیکەری تەنزیمیی بۆ ڕێبازەکانی تەصەووف داناوە، بە زنجیرە گوتوویەتی: فلان لە فلان، فلان لە فلان، بەزۆرییش وایە بردوویانەتەوە سەر عەلی کوڕی ئەبو تالیب خوا لێی ڕازی بێ، پێم وایە تەنیا تەریقەتی نەقشیبە دەچێتەوە سەر ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، ئەگەر نا ئەوانی دیکە بەزۆریی دەچنەوە سەر عەلی خوا لێی ڕازی بێ!

ئنجا بۆ زانیارییتان! ئەمە ئەصڵ و ئەساسی نیە، هەرچەندە بەشێك لە ئەهلی تەصەووف، جاروبار هەندێك قسەی ئێمەیان لەسەر دڵ گران بووە، ئەوەشیان زۆر پێ ناخۆشە، بەڵام وەك یەکێ لە زانایان دەڵێ: فلان کەسمان خۆش دەوێ، بەڵام هەقمان لەوی خۆشتر دەوێ! ئەوە کە ئەبو بەکری صیددیق یان عەلی کوڕی ئەبی تالیب دانیشتبێ و بە یەکێکی گوتبێ: ئەوە بەتایبەتیی ئیجازەی تۆم دا، بچۆ تەزکیەی نەفس و تەعلیمی خەڵك بکە! ئەوە هیچ ئەصڵ و بناغەیەکی نیە، ئەو شەجەرانەی هەڵیان دەواسن، وەك ڕیشەی خزمایەتیی کە دەچێتەوە سەر پێغەمبەر، ئەوە جیایە، دەچێتەوە سەری، یان نا؟ لەوەدا گرفتمان نیە، بەڵام ئەوە کە ئەو شێخە لەوەی پێش خۆی وەرگرتبێ و، ئەویش لەوو، ئەویش لەو ...هتد، ئەوە هیچ بنەمایەکی نیە، بەڵێ، دەزانم لەم دواییانەدا ئەوە هەیە، بەڵام ئەوە کە لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانەوە ئەو کارەیان کردبێ، شتی وا نیە.

یەکەمین کەس کە دایناوە، ئەو کابرایەیە، کە صۆفییەکی ئێرانیی بووەو، لەسەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچییدا ژیاوە[1].

یەکەمین کەسیش کە کەلەپوورو زانستەکانی تەصەووفی کۆ کردەوە لە کتێبێکدا، بە شێوەیەکی کۆکەرەوە (أبو حامد الغزالي) بوو، کە لەنێوان ساڵانی:

---

(١) (إبن تیمیة)ش دەڵێ: ئەوە هیچ بەڵگەیەکی نیە لە قورئان و سوننەتداو، دواتر هەندێ لە (مشائخ) پێیان پەسند بووەو دایانهێناوە، بڕوانە: (مجموع الفتاوی) ج١١ (التصوف) ص٢٧٨،٢٧٩.

(٤٥٠-٥٠٥ك)دا ژیاوە، بەڵام بەتەئکید ئەبو حامید لە سفرەوە دەستی پێ نەکردوە، بەڵکو لە کتێبی (قوت القلوب)ی (أبو طالب المكي) و (الرعاية)ی (المحاسبي) و، زانایانی دیکەی پێش خۆی، کە شتیان لەو بارەوە نووسیوە، لە هەموویان سوودی بینیوە، مەوسووعەیەکی داناوە کە پێم وایە هەتا ئێستا هی وەك وی، دانەنراوە، هەڵبەتە مەوسووعەکەشی تەنیا تەزکیەو تەصەووف نیەو، زۆر فراوانە، هەم ناوەکەی و هەم نێوەڕۆکەکەی: (إحياء علوم الدين) {زیندوو کردنەوەی زانستەکانی ئایین}، بەڵام زیاتر بەنەفەسێکی ڕووحیی و تەزکیەیی نووسراوەو، فراوانترین کتێبی تەزکیەو تەصەووفە تا ئێستاش، بەر لەوەش چەندان کتێبی دیکەشی نووسیون، دواتر دانانی کتێبی تەصەووف بەردەوام بوو، لەلایەن پسپۆڕانی ئەو بوارەوە.

### ناودارترین ڕێبازەکانی تەصەووف:

ناودارترین ڕێبازەکانی تەصەووف بەپێی زانیاریی من، کە بەدواداچوونم بۆ کردوە، ئەو پازدەیەن کە ئێستا ناویان دەهێنم، دەشگونجێ زیاتر بووبن، لە هەندێ شوێنی دنیادا هەندێ ڕێباز بووبن، ئێستا نەمابن، شوێنکەوتوویان نەمابن.

ئنجا بەر لەوەی تەریقەتەکان بژمێرم، دەمەوێ لە مەسەلەیەك ئاگادارتان بکەمەوە:

با هیچ کەس وا گومان نەبا: شێخ عەبدولقادری گەیلانیی دانیشتبێ گوتبێتی: وەرن مسوڵمانینە! ڕێبازێکتان بۆ دادەنێم کە ڕێبازی قادرییە، یان شێخ بەهائەددین نەقشبەندیی گوتبی: وەرن مسوڵمانان! بەدوای تەریقەتی نەقشبەندیی بکەون، هەرگیز شتی وا نەبووە، هیچ کام لە ناودارانی تەزکیەو تەصەووف، ئەوانەی کە بۆ خوا صوڵحاوبوون، دانەنیشتوە بەخەڵك بڵێ: وەرن بەدوای من بکەون! چونکە عەبدولقادری گەیلانیی و ئەوانی دیکەش کتێبیان هەیە، گوتوویانە: خەڵکینە! وەرن! ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه

وسلم)، پەیڕەویی لێ بکەن، بەڵام خەڵکەکە لەدوای وان، لەبەر ئەوەی باش بۆیان ئیستیعاب نەکراوە، لەباتی ئەوەی بڵێن: ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە تێگەیشتنی عەبدولقادری گەیلانیی، یەکسەر گوتوویانە: ڕێبازی فلان کەس، ئێستا من دڵنیام شێخ عەبدولقادری گەیلانیی زیندوو بێتەوە، زۆر نارازی دەبێ لەوەی ئەو ڕێبازە بەناوی ئەوەوە، بکەن! چونکە دەبێ هەموو کەس بەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەوێ.

لە یادداشتەکانی[1] خۆمدا نووسیومە: لە ساڵی (١٩٨٠)دا (شیخ ناظم العاصي)م بینی، بە پیاوێکی زۆر چاکم هاتە بەرچاو، هەندێ کەرامەتم لێ بینین، سێ شەو لە خزمەتی مامەوە لە گوندی (سبعة) بوو، لێم پرسی: جەنابت لەسەر چ تەریقەتێکی؟ تەریقەتی نەبهانیی؟ گوتی: لە سەرەتاوە سوودمان لە تەریقەتی نەبهانیی بینیوە (نەبهانیی شێخێك بووە لە سووریا) پێشێ وا بووم، بەڵام ئێستا: {أنا على الطريقة المحمدية} لەسەر ڕێگای موحەممەدییم، قسەکەی زۆر جوان بوو، لەڕاستییدا ئەو پێشەوایانەی تەصەووف، هەر ویستوویانە خەڵك بانگ بکەن بۆ سەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام زۆر جار شوێنکەوتووەکانیان وا نەبوون و وا تێنەگەیشتوون.

## ناودارترین ڕێبازەکانی تەصەووف:

١- تەریقەتی قادریی (الطريقة القادرية)، پاڵ دەدرێتە لای (عبدالقادر الجيلاني): کە لە ساڵی (٥٧١ك)دا کۆچیی دوایی کردوە.

٢- تەریقەتی ڕیفاعیی (الطريقة الرفاعية)، پاڵ دەدرێتە لای (أحمد بن أبي الحسين الرفاعي) کە ناسراوە بە (أبو العباس) و لە ساڵی (٥٤٠ك)دا کۆچیی دوایی کردوە.

---

(١) چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم: ١٩٦١-١٩٩١ز.

٣- تەریقەتی سوهرەوەردیی (السهروردية) پاڵ دەدرێتە لای (شهاب الدين أبي الفتوح محي الدين بن حسن) (٥٤٩-٥٨٧)ك، خاوەنی قوتابخانەی (الإشراق)ە، ئەو قوتابخانەیە گوتوویانە: ئەگەر ئینسان زۆر خۆی پاك بكات و، خۆی تەزكیەو چاك بكات، دڵ و سینەی بەرامبەر بە (اللوح المحفوظ) وەك ئاوێنەیەكی لێدێ، چی لە (اللوح المحفوظ)ی خوادا هەیە، ئەویش بەقەدەر خۆی، ئەو شتانەی لە دڵ و دەروونداعەكس دەبنەوە! هەڵبەتە ئەو قسەیە هەقی تێدایە، بەڵام ناهەقیشی تێدایە، هەقەكەی ئەوەیە كە ڕاستە ئینسان تاكو صاف و ساغتر بێ، چاكتر لە هیدایەتی خواو لە قورئان و سوننەت، بەهرەمەند دەبێ، بەڵام مانا باتیڵەكەی ئەوەیە: ئەوان پێیان وابووە، ئەگەر ئینسان زۆر خۆی صاف و ساغ بكاتەوە، ئەگەر بێت و قورئان و سوننەت و شەریعەتیش نەخوێنێتەوە، هەر بەتەنیا خۆی پاك و چاك بكات، هیدایەتی خوا لە دڵیدا دەدرەوشێتەوە! كە بێگومان ئەوە ڕاست نیە، ئنجا ئەم سوهرەوەردییە بە فەتوای زانایانی حەڵەب، لەكاتی خۆیدا كوژراوەو تۆمەتبار كراوە بە زەندەقە، صەلاحەددینی ئەییوبیی دوای ئەوەی زانایان فەتوایان بۆ داوە، فەرمانی كردوە بە كوشتنی.

٤- (المدرسة الأكبرية أو مدرسة وحدة الوجود): ئەویش پاڵ دەدرێتە (محي الدين ابن عربي) كە بە (الشيخ الأكبر) ناسراوە لە ساڵانی: (٥٦٠- ٦٣٨ك) دا ژیاوە، ئەو پیاوە مشت و مڕو هەرای زۆری لەسەرە، بەتایبەت كتێبەكەی (الفتوحات المكية)، كە قەت ئامۆژگارییتان ناكەم، بیخوێننەوە، بەحرێكە زۆر كەسی تێدا نقووم دەبێ.

كتێبێكی دیكەشی هەیە: (فصوص الحِكم) كە ئەو كتێبە كوفری بە ئاشكرای تێدایە، نازانم چەندی هی خۆیەتی و چەندی ڕەگەڵ خراوە.

شایانی باسە ئەم پیاوە خۆی بە (خاتم الأولياء) داناوە، بەڵام گوتوویەتی: (خاتم الأولياء) مەرج نیە هیچ وەلی دیكەی بەدوادا نەیەت، هی دیكەش دێن، بەڵام هیچیان وەك وی نابن!!

هەندێ لە کتێبەکانیشی، وەك کتێبەکانی زانایانی دیکەی مسوڵمانانن، بۆیە زانایەکی پایەبەرزو لێکۆڵەرەوەی وەك (إبن تيمية) دەڵێ: ئێمە دەڵێین: ئەو قسانە کوفرو شیرکن، بەڵام خاوەنەکەی تەنیا خوا دەزانێ لەسەر چ حاڵێك مردوە، ئنجا ئایا قسەکانی هی خۆینی، یان خراونە نێو قسەکانیەوە؟ ئایا ئەو قسانەی کە کردوونی، لە حاڵەتی ئاسایی دابووە، یان لەحاڵێتێکی وا بووە، کە حاڵ (وَجْد) بەسەریدا زاڵ بێ؟ یان ئایا لەو قسانەی گەڕاوەتەوە، یان لەسەریان مردوە؟ ئێمە نازانین و عاقیبەتەکەی بەس خوا دەزانێ چۆن بووە[1]، چونکە ئینکاریی ناکرێ، زانایەکی زۆر گەورەش بووە، بەڵام قسەشی هەن بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خوا بەیەکگرتندا ناگونجێن، بەتایبەتی لە (فصوص الحكم)دا، کە من بە شەرحەوە خوێندوومەتەوە.

٥- تەڕیقەتی شازلیی (الشاذلية)، کە پاڵ دراوەتە لای (أبو الحسن الشاذلي)، (٥٩٣-٦٥٦)ك، کە یەکێ لە ناسراوترین شوێن کەوتووانی: (أبو العباس المرسي): (٦٨٦)ك، هەروەها یەکی دیکە لە قوتابییە زۆر ناسراوو ناودارەکانی، کە من زۆریشم خۆش دەوێ، ناوی (تاج الدين أحمد بن عطاءالله السكندري)ە، کتێبێکی هەیە بەناوی (الحكم العطائية) تاکو ئێستا لەوانەیە دەیان شەرحی لەسەر کرابن، من لە کتێبەکانی خۆمدا جار قسەکانی دەهێنم.

٦- البدوية، أحمد البدوي: (٥٩٦-٦٣٤)هـ.

٧- المولوية، جلال الدين الرومي: (٦٧٢)هـ.

٨- النقشبندية، محمد بهاءالدين نقشبند: (٧٩١)هـ.

٩- الدسوقية، إبراهيم الدسوقي: (٦٣٣-٦٧٦)هـ.

١٠- السنوسية، محمد بن علي السنوسي: (١٢٦١-١٣١٩هـ/ ١٨٤٤-١٩٠٢م).

١١- الختمية، محمد عثمان بن محمد أبو بكر بن عبدالله الميرغني المحبوب، ويلقب بالختم: (١٢٠٨-١٢٦٨)هـ.

---

(١) لە تەوەری پێنجەمدا ئاماژە بەسەرچاوەکانی ئەو قسانە دەکەین.

١٢- البريلوية، أحمد رضاخان بن تقي علي خان: (١٢٧٢-١٣٤٠هـ/١٨٦٥-١٩٢١م)

١٣- المهدية، محمد أحمد المهدي بن عبدالله: (١٢٦٠-١٣٠٢هـ/ ١٨٤٥-١٨٨٥م)، ئەو ڕێبازە لە وڵاتی سوودانە و مەشهووریشە.

١٤- التيجانية، أبو العباس أحمد بن محمد بن المختار بن أحمد بن محمد سالم التيجاني: (١١٥٠-١٢٣٠هـ/ ١٧٣٧-١٨١٥).

١٥- الطيبية، السلطان المغربي مولاى طيب: (١٢٨٦)هـ[1].



---

(١) الموسوعة العربية، ج٦ ص٥١٣-٥١٧، والموسوعة الميسرة في الأديان ....ج١ ص٢٤٩-٣٠٣.




## هەڵسەنگاندنێكی كورت بۆ تەصەووف و تەزكیەی نەفس

لە حەوت خاڵاندا ئەو هەڵسەنگاندنەتان بۆ دەكەم:

١)- تەزكیەی نەفس و قوتابخانەو ڕێبازەكانی كە كاریان كردوە، بۆ ئەوەی مسوڵمانان دەستیان گیر بێ لە تەزكیەی نەفس و پاك و چاك بوون، ئا ئەو ڕێبازانەو، ئەو كەلەپوورە، وەك سەرجەم بەرهەم و ئەزموونی بەشەر، چ لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، چ لە بواری فیقهدا، چ لە بوارەكانی: ئوصوڵی فیقهو، تەفسیرو، فەرموودەناسیی، لە هەموو بوارەكاندا، ڕاست و چەوت و چاك و خراپی تێدایە، ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە، چونكە بەشەر هیچ كاتێك هەقیقەتی تەواوو ڕەهای لەلا نیە، بۆخۆی ڕێژەیی (نسبي)یەو، ئەو شتانەش كە لەبەشەرەوە دەردەچن، وەك خۆینی، واتە: دەگونجێ ئەندازەیەك ڕاستییان تێدابێ و، هەندێ هەڵەشیان تێ كەوتبێ، هەروەها دەگونجێ بە نسبەت كاتێكەوە: ڕاست بووبن و، بەنسبەت كات و شوێنێكی دیكەوە: هەڵەبن.

بەڵام ئەوەی كە پەیوەست دەبێ بە وەحییەوەو لە وەحییەوە سەرچاوە بگرێ، بە ئەندازەی ئەوە كە لە وەحییەوە سەرچاوەی گرتوە، لە حەقیقەتی ڕەها نزیك

دەکەوێتەوە، بەڵام زانایان بنچینەیەکیان داناوە کە مامۆستا سەعیدی نوورسیی لە کتێبەکانی خۆیدا زۆرجار دەیڵێ: {خُذ ما صَفا دَعْ ما كَدر}، ئەوەی کە صاف و چاکە، وەریبگرە، ئەوەشی کە لێڵە، وازی لێ بێنە، ئێمەش دەبێ ئاوا بەپێی ئەو بنچینەیە مامەڵە بکەین لەگەڵ کەلەپووری بواری تەزکیەی نەفسدا، هەروەك لەگەڵ کەلەپووری بواری فیقە، تەفسیر، فەرمووودەناسیی و ..هتددا.

٢)- وەك چۆن لە بواری فیقهدا، مەزهەبە فیقهییەکان (المذاهب الفقهية)هەن و، لە بواری عەقیدەدا، قوتابخانە کەلامییەکان (المدارس الكلامية) هەن، بەهەمان شێوە، لەبواری ئەخلاق و تەزکیەی نەفسیشدا، قوتابخانەکانی تەزکیە (المدارس التزكوية) مان هەن، کە بێگومان ئەوانەش هەموویان ئەزموونی ڕووحیی و دینداریین، خاوەنەکانیان کەم و زۆر بەشوێن پێی پێغەمبەردا هەنگاویان ناوە، ئەوە نەبووە شتەکە پاڵ بدەنە لای خۆیان، قسەیان لە گیرفانی خۆیان دەرنەهێناوە، بەڵکو ئیجتیهادیان کردوە، دەگونجێ پێکابێتیان، کە بە تەئکید بە ئەندازەی نزیکییان لە وەحییەوەو، بە ئەندازەی پابەندییان بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) پێکانیان زیاتر بووە، دەشگونجێ نەیانپێکابێ، بەئەندازەی ئەوە کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی عەقڵی خۆیان، میزاجی خۆیان، هۆکارە دەرەکییەکان، هەواو نەفس و شەیتان، دیارە جگە لە پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێ، هیچ کەس لە هەڵەو کەم و کوڕیی پارێزراو نیە.

٣)- وەك چۆن جەستە پێویستیی بە مەشق و ڕاهێنان هەیەو، پێویستیی بە پارێزگاریی لێکردن هەیە، وەك خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف

خوای بەرز هەقی جەستە، بەیان دەکات، هەم بەبارە ئەرێنییەکەیدا: (وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟)، هەم بەبارە نەرێنییەکەیدا: (وَلَا تُسْرِفُوٓا۟) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ: {إِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا} أخرجه أحمد برقم: ٦٨٧٨ قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: صحيح, وهذا إسناد حسن.

جەستەت هەقی بەسەرتەوەیە، ئنجا وەك چۆن مرۆڤ جەستەی هەیەو، پێویستیی بەوەیە هەقی بۆ جێ بە جێ بکرێ، ڕووحیشی هەیەو ئەو ڕووحەش پێویستیی بە خزمەت هەیە بە هەردووك باریدا، بە باری ئیجابییدا: خۆراکی بدرێتێ، پاك ڕابگیرێ، بەباری سەلبییشدا: پارێزگاریی لێ بکرێ و دوور بخرێتەوە، لەو شتانەی کە لێیان تووشی زیان دەبێ.

ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە جەستە، مرۆڤ خەمی لێ دەخواو، مشووری لێ دەخواو، خزمەتی دەکات، بەهێز دەبێ و ساغ دەبێ، ڕووحیش بە هەمان شێوە: بەئەندازەی ئەوە کە خەمی لێ دەخۆی: ڕووحەکە صاف دەبێ، ساغ دەبێ، چاك دەبێ و پاك دەبێ.

بۆ وێنە: دوو کەس وەك یەکن، یەکێکیان: کە خواردنی تەندروست بخوات و، ئاوی پاك بخواتەوەو، ئاگای لە جەستەی خۆی بێ و، بیپارێزێ لە خواردنی زیان بەخش و، وەرزشی پێ بکات و پاکی ڕابگرێ و، دووری بخاتەوە لەو شوێنانەی کە زیانی لێ دەدەن، یەکیان ئاوا لەگەڵ جەستەیدا مامەڵە بکات.

ئەوی دیکەش: کە گوێ نەدا بە پاك و خاوێنیی جەستەو وەرزش پێ کردنی و، گوێ نەدا بە خواردنەکەی داخۆ تەندروستە یان نا؟ نەیپارێزێ لەو شتانەی کە زیانی لێ دەدەن، بە دڵنیایی وەك یەك نابن.

بەهەمان شێوە ڕووحێکیش کە خاوەنەکەی خزمەتی دەکات، لەگەڵ ڕووحێکدا کە خاوەنەکەی خزمەتی ناکات، وەك یەك نین، ئەوە گومانی تێدا نیە.

ئامانجی عیلمی تەزکیەش کە وەك گوتم: بە عیلمی تەصەووف ناوی دەرکردوە، بریتیە لە خزمەت کردنی ڕووح، خزمەت کردنی رووح بە هەموو شێوەکان، بۆ ئەوەی پاك بێ، چاك بێ و، گەشە بکات و لەخوا نزیك بێ و پابەند بێ بە شەریعەت، ملکەچ بێ بۆ شەریعەت، بەشوێن پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هەنگاو بنێ و، بێزار کراو بێ لە سیفەتە نزمەکان و، ڕازاوە بێ بە سیفەتە بەرزەکان، عیلمی تەزکیەو تەصەووف، ئامانجەکەی ئەوەیە.

٤)- وەك چۆن بۆ فێر بوونی زانستەکانی دیکە مامۆستا پێویستەو، کەس لەخۆوە فێری: پزیشکیی و زمان و فیزیاو کیمیاو، هەر زانستێکی دیکە نابێ، یان بەبێ مامۆستا زەحمەتە فێر بێ، بەهەمان شێوە لە بواری تەزکیەو بۆ خوا صوڵحاندا، ئەگەر ئینسان مامۆستاو چاو ساغێکی هەبێ، ڕێی بۆ کورت دەکاتەوە، بە پێچەوانەشەوە: ڕێیەکەی زۆر بۆ درێژ دەبێتەوە، هەروەها دەشگونجێ پێی هەڵخلیسکێ و بەم لاو لادا بکەوێ، ئەو قسەیەش کە لە کتێبی: {ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون}دا هێناومەو شیکردنەوەشم لەسەر کردوە: {مَن لم يَكن لَه شَيخ فَشَيخه الشَّيطان}، ئەو قسەیە ئاوا لەو چوار چێوەیەدا، دەبێ تەماشای بکەین و بارە ڕاستەکەی ئەوەیە: ئەگەر کەسێك مامۆستایەکی نەبێ، چاو ساغێکی نەبێ، دەستی بگرێ، ڕێی لێ تێك دەچێ، ئنجا چ شەیتانێکی ئینسیی خۆی لێ دەکات بەشێخ و بە چاو ساغ، چ شەیتانێکی جینیی وەسوەسەو خەیاڵی خراپی بۆ دەکات، ئەوە واقیعێکەو هەیە، ئەوە بارە ڕاستەکەیەتی، بە گشتی وایە، بۆ هەر شتێك ئینسان پێویستیی بە چاوساغێکە، بەڵام من دەمەوێ ئەوەشتان پێ بڵێم:

بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتوە: ئەگەر ئینسان مامۆستایەکی دەست نەکەوت، بەتایبەت بۆ بواری لەخوا نزیك بوونەوەو بەرەو خوا چوون، پەکی ناکەوێ، چونکە قورئان و سوننەت ئەو دوو سەرچاوە ڕوون و بێ چەندوو چوونەن، کە هەموو شتێکیان تێدایە، بۆ لەخوا نزیك بوونەوەی مرۆڤ، بۆ پاك بوون و چاك بوونی مرۆڤ، هیچ گومانی تێدا نیە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە: ئایا هەموو کەس توانای هەیە ڕاستەوخۆ لە قورئان و سوننەت تێ بگا؟ کێشەکە لێرەدا هەر ئەوەیە، ئەگەرنا مامۆستایەکەش کە دەبێتە چاو ساغ، لەدەرەوەی قورئان و سوننەت، شتێکی دیکەت بۆ ناهێنێ، هەموو ڕێگاکان بەرەو لای خوا بەستراون، تەنها ئەو ڕێگایە نەبێ کە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم)، کەواتە: هونەری مامۆستاو شێخ و ئوستاد، ئەوەیە کە دەستت بگرێ و بتخاتە سەر سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی قورئان و سوننەت، کە هەموو کەس ئەو توانایەی نیە.

هاوەڵان (صحابة) ئەوە دیارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مامۆستاو چاو ساغیان بووە، شوێنکەوتووان (تابعین) نەمانبیستوە ڕێبازێکی دیارییکراویان بووبێ، ئەوە حەسەنی بەصرِاییە، ئیبن و سیرینە، لەدوای وان شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان (تابعي التابعين) لەدوای ئەوانیش پێشەوایانی مەزهەبەکان، کە هەشت مەزهەبی نووسراو (مُدَوَّن)مان هەن، ئێستا شوێن کەوتوویان هەن، وەك دوایی باسیان دەکەین، پاشان ئەوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان (صلی الله علیه وسلم) کۆ کردەوە، هەروەها ئەو زانایانەی لەبواری تەفسیر، یان فەرموودەدا شارەزا بوون، نەمانبیستوە نە ڕێبازێکی دیارییکراویان هەبێ، نە شێخێکی دیارییکراویشیان هەبێ، چونکە توانیویانە یەکسەر شتەکان لە قورئان و سوننەت هەڵهێنجن، تۆ مامۆستات بۆ ئەوەیە بتباتە سەر سەرچاوەی قورئان و سوننەت، ئنجا ئەگەر بۆخۆت بتوانی دەست بگەیەنیە وێ! ئەوەی دەستی گەیشتە بەحرێ، پێویستی بە جۆگەلان نامێنێ! کەسێ پێویستی بە جۆگەلە ئاوە، دەستی نەگاتە سەرچاوە، دەستی نەگاتە ئاوی ئەو دەریایە.

٥)- بە گشتی هەندێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف[١] کارتێکراو بوون، بە سێ شتان:

**یـــەك:** فەلسەفەی هیندیی: کە پێی دەگوترێ: (النِّرفانا)، ئەم فەلسەفەیە ئامانجی ئەوەیە ئینسان بەرەو نەمان (فناء) بەرێ، لە میانی برسیی بوون و، دنیا بەکەمگرتن و، واز لە دنیا هێنان و، پشت لە ئارەزووەکان کردندا، ئینسان بەرەو ئەوە بەرێ، کە غەریزەکانی خۆی لەبیر بکات و، کپیان بکات، ئەوە لە فەلسەفەی هیندیی دایە، کە ئەوە مەرج نیە هەمووی بە گشتی ڕەفز بێت، چونکە لە ئیسلامیشدا، خۆ برسیی کردن هەیە، ڕۆژوو گرتن، دنیا بەکەمگرتن، هەیە، بەڵام کاتێك ئەوە بکرێتە ئامانج، یان زێدەڕۆیی تێدا بکرێ، ئەوە خراپە.

---

(١) هەمیشە بە ئینصاف بن بۆ ئەوەی لە دادگەرییەوە نزیك بن، لەنێو صۆفییاندا باش هەن و خراپیش هەن، لەنێو سەلەفییاندا بەهەمان شێوە، لەنێو شەرعزاناندا هەرواو، لەنێو لایەنە ئیسلامییەکانیشدا، چاك هەیەو خراپیش هەیە.

**دوو:** هەندێ لە قوتابخانەو ڕێبازەکانی تەصەووف، کارتێکراو بوون بە گۆشەگیریی نەصرانیی (رهبانية النصاري)، کاتی خۆی گۆشەگیریی و ژن نەهێنان لە نێو نەصرانییەکاندا زۆر باو بووە، ئنجا لە ژیانی ڕاهیبە نەصرانییەکاندا شتی سەیر سەیر هەیە: هی وایان هەبووە گوتوویەتی: حەوت ساڵە ئاو بەجەستەم نەکەوتوە لەبەر خوا! هەیانبووە لە پیاوان و ئافرەتانیان هاوسەرگیریی نەکردوە! هەبووە گوتوویەتی: حەوت ساڵە بەس گیام خواردوە! هەبووە گوتوویەتی: من ئەوە سێ ساڵە، لەنێو بیرێك دام! خوای پەروەردگاریش ئاماژەی پێ دەکات دەفەرموێ:

﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحديد

واتە: ڕەهبانییەتێکیان داهێنا، کە ئێمە لەسەرمان نەنووسیبوون {لەدینی خوادا ئەوە لەسەر ئینسان پێویست نیە، کە گۆشەگیر بێ و دوور بێ لە کۆمەڵگا} بۆخۆیان دایانهێنا، {بۆ ئەوەی زیاتر لەخوا نزیك ببنەوە} بەڵام باشیشیان بۆ ڕەچاو نەکرا {چونکە پێچەوانەی فیترەتە} ئێمە پاداشتی بڕوادارەکانماندایەوەو زۆریشیان لارێن.

ئێستاشی لەگەڵدا بێ، کاهین و ڕاهیبەکانیان تووشی هەڵەو پەڵە دەبن لە کەنیسەکاندا، لەبەر ئەوەی کپ کردنی ئەو غەریزانەی کە خوا بە ئینسانی داون، زۆر قورس و زەحمەتەو پێچەوانەی فیترەتە.

**سێ:** هۆکارێکی دیکە کە کاریگەریی هەبووە لەسەر ڕێبازەکانی تەصەووف، فەلسەفەی یۆنانیی بووە، بەتایبەت بیردۆزەی (فیض)، وەك پێشتریش بەکورتیی ئاماژەیەکمان پێدا، ئەوانە قەناعەتیان وابووە - کە تا ڕادەیەك قەناعەتەکەیان هەقی تێدایە- ئەگەر بێت و ئینسان زۆر خۆی ساف و ساغ بکات و ئەزیەتی جەستەی خۆی بدات، بەو واتایە کە خزمەت بە جەستەی خۆی نەکات، هەر خەریکی ڕووحی بێ، هەر خەریکی تێوەڕامان (تأمُّل) بێ، هەر خەریکی زیکرو فیکرو ویرد بێ و، خۆی دابڕێ لە خەڵکی، ئەوە ڕاستە ڕووح بەهێز دەکات، وەك چۆن کەسێکی کافر، یان مسوڵمان، مەشق بە جەستەکەی بکات،

جەستەکەی بەهێز دەبێ، ڕووحیش هەروایە، کافرێك یان مسوڵمانێك خزمەتی ڕووحەکەی بکات، ڕووحەکەی هەر بەهێز دەبێ، بەڵام گرفتی ئەوانە ئەوە بووە کە بەتەماعی ئەوەی خوا (فیض)یان بۆ بڕێژێتە خوار، خۆیان دوور گرتوە لە شەریعەت، بێگومان لە ئەنجامی صاف بوونەوەو ساغ بوونەوەو لەبێژینگ درانی دەروونی مرۆڤدا، لە سیفەتە خراپەکان، ڕاستە ئینسان ئامادەیی بۆ پەیدا دەبێ، زیاتر سوود ببینێ لە ئیلهامی فریشتەکان، بەڵام ئەوە کافی نیە، چونکە بەبێ وەحیی، ئینسان ناگاتە هەوارو مەنزڵ.

ئنجا فەلسەفەی یۆنانیی، بەتایبەت بیردۆزەی (فیض) و بیردۆزەکانی ئیتتیحادو حلوول، کاریگەریی سەلبییان هەبووە، بۆ سەر هەندێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف.

٦)- هەر کام لە تەوژمی: صۆفییگەریی و سەلەفییگەریی وەك لە کتێبەکانی دیکەشمدا ئاماژەم پێ داوە: تێپەڕاندن و کورتهێنانیان هەبووە، بەتایبەت بەرامبەر یەکدی: تەوژمی سەلەفیی، هەرچی پەیوەندیی بە تەصەووف و ئەهلی تەصەووفەوە هەیە، هەمووی ڕەت دەکاتەوەو، نموونە خراپەکانی صۆفییگەریی زیاتر زەق دەکاتەوە، بۆ وێنە: باسی ئیبن و عەرەبی دەکات، باسی حەللاج دەکات، باسی چەند هەڵەیەکی کتێبی (إحیاء) دەکات، باسی چوار هەڵەی مەولاناو کێ و کێ دەکات! بەڵام باسی چاکەکانیان ناکات.

ئەهلی تەصەووفیش هەرچی کەلەپووری تەوژمی سەلەفییە هەمووی ڕەت دەکاتەوە، ئەویش دیسان هەندێ هەڵەو پەڵەی سەلەفییەکان کە هەن، ئەوە زەق دەکەنەوە، بۆ وێنە: قسەی سەلەفییەك دێنێ کە گوتوویەتی: ئەو گۆچانەی من لە لاشەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاکترە، لەبەر ئەوەی گۆچانەکەم، دەتوانم ئیشانی پێ بکەم، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەدنیادا نەماوە! کە بەدڵنیایی ئەوە بێ ئەدەبییە، یان ئەو قسەیەی (إبن تیمیة) زۆر زەق دەکرێتەوە کە لەبەر تیشکی فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دا گوتوویەتی: بارگەو بنە

بۆ هیچ شوێنێك ناپێچرێتەوە، مەگەر بۆ سێ مزگەوتان: مزگەوتی حەرام و، مزگەوتی پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم)، مزگەوتی قودس.

ئنجا ڕاستە وەك مزگەوتان، دەبێ ئینسان تەنیا بۆ ئەو سێ مزگەوتانە بەنیەتی عیبادەت بچێ، ئیبن و تەیمیەش ڕەحمەتی خوای لێبێ، هەندێ جار لە کاردانەوەی هەندێ خەڵکی صۆفیدا، تووشی تێپەڕاندن بووە بۆ زانیارییتان! هەمیشە کارو کاردانەوە، وا لە ئینسان دەکات.

ئنجا هەندێ لە سەلەفییەکان ئەوەیان زۆر زەق کردۆتەوە، بۆ نموونە: کەسێ بیەوێ بچێ هەرەمەکانی مصر ببینێ، دەڵێن: نا ئەوە نیە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: {لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالمَسْجِدِ الْأَقْصَى} أخرجه أحمد برقم (٧١٩١)، والبخاري برقم (١١٣٢)، ومسلم برقم (١٣٩٧)، وأبو داود برقم (٢٠٣٣)، والنسائي برقم (٧٠٠)، وابن ماجه برقم (١٤٠٩)!!

دەڵێین: ڕاستە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەموویەتی: بە نیەتی تاعەت و عیبادەت، تەنیا سەفەر کردن، بۆ ئەو سێ مزگەوتانە، دروستە، چونکە تەنیا ئەو سێ مزگەوتە، ئیمتیازیان بەسەر مزگەوتەکانی دیکەدا، هەیە، لەو ڕووەوە کە خێرو پاداشتی نوێژ تێیاندا بەچەندان بەرانبەر خێرترو چاکترە، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرمووە: نابێ بچن بۆ دیدەنیی شوێنەوارەکانی کە ئەو گەلانە جێیان هێشتوون، یان بۆ زانست، یان بۆ صیلەی ڕەحم، یان بۆ سەفەرو گەڕان و، دروست نیە سەفەر بکەن!! کەواتە: ئەو دووانە بۆچی لەیەك دەبەستن؟!

صۆفییەکان بە گشتیی - نەك هەموویان - کورت هێنانیان هەیە لە پابەند بوونیان بە قورئان و سوننەتداو، سەلەفییەکانیش بە گشتیی - نەك تاك تاکیان - کورت هێنانیان هەیە لە ئیمانێکی شهوودیی و لە گرنگیی داندا بە لایەنی ڕووحییدا، کە ئەوەش بەرهەمی تاعەت و عیبادەت و خوا بەیەکگرتن (توحید)ە، ئینسان ئەگەر بۆ خوا صوڵحا، هەندێ سیفەتی بەرزو خەسڵەتی پەسندی تێدا دێنە دی.

ئنجا بەڕێزان! هەر بۆیەش بە گشتی ئەهلی تەصەووف سەرکەوتووتر بوون لە مسوڵمانانی دیکە، لە بواری خوا پەرستن و خۆپاراستن لە گوناهان و، خۆڕازاندنەوە بە سیفەتی جوان و، لە هەڵس و کەوتی جوان و چاکدا.

تەماشا دەکەین: شێخێکی تەریقەت، ئەگەر زۆریش چاك نەبووبێ، توانیویەتی سەدان و هەزاران کەس لە گوناهان بگێڕێتەوە!! بەڵام کەسانی دیکە هەبوون و هەن کە لاف لێدان و بانگەشەی گەورە گەورەیان هەبووە، بەڵام نەك خەڵك خۆیشیانیان پێ نەگەڕاوەتەوە لە گوناهان! ئنجا ئێمە دەبێ بە ئینصافەوە قسە بکەین، لە هەردوو لایاندا تێپەڕاندن و بەزایەدانیش هەبووە.

بەداخەوە مسوڵمانان زۆر جار ئەو ئایەتەیان بەسەردا چەسپیوە، کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًۭا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الروم

واتە: لە هاوبەش بۆخوا دانەران مەبن، ئەوانەی ئایینەکەیانیان بەش بەش کرد، هەرکامێکیان بەوەی کە خۆی لەسەریەتی، دڵخۆشە.

ئێستا خەڵکێکی سەلەفیی ناو - مەگەر چۆن و بەدەگمەن - ئەگەرنا بەزۆریی خەریکی ئەوەن: بیسەلمێنن کە هەبوونی:

١- حیزبی ئیسلامیی حەرامە.

٢- لە تەحییاتدا دەبێ پەنجە بجووڵێنرێ.

٣- دەبێ دەلینگی شەرواڵ و پانتۆڵ کورت بێ.

٤- ئافرەت دەبێ نیقاب بێ!.

وەك ئەوەی دین تەنیا ئەوەندە بێ، صۆفییەکانیش هەر خەریکی زیکرو، فیکرو، هەندێ عیبادەتی شەخسیین و، دینەکەیان بەش بەش کردوە! لە حاڵێکدا کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاگای لەوەش بوو، لەوەش بوو،

هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ بەهەمان شێوە، بۆچی باشترین جیل بۆ ئەوەی ئێمە بیانکەینە سەرمەشق، جیلی هاوەڵانە؟ لەبەر ئەوەی دینداریيان زۆر هاوسەنگانە وەرگرتبوو، دینداریيان لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) وەرگرتبوو، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە شەونوێژدا هێندە دەمایەوە، پاژنەی پێی دەقڵیشێ، بەڵام لە جەنگ و شەیبەخوونیشدا، هیچ کەس لەو ئازاتر نەبوو، عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب دەڵێ: کە تەندووری جەنگ گەرم دەبوو، ئێمە خۆمان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەگرت، یانی: ئەو لە هەموو کەس لە دوژمن نزیکتر بوو، لە عیبادەت و تاعەتی شەوێشدا ئاوابوو، ئنجا بۆ عیلم، بۆ زوهد، بۆ هەموو سیفەتێکی بەرز، بۆ سیاسەت، بۆ ئاکارە بەرزو پەسندەکانیش دیارە چۆن بووە!

بەڵام دوایی مسوڵمانان ڕێبازەکەییان بەش بەش کرد: هەندێکی زوهدەکەی وەرگرت و، هەندێکی دیکە زانستەکەی وەرگرت و، هەندێکیان جەنگ و جیهادەکەیان وەرگرت، هەندێکیان لایەنە سیاسییەکەیان وەرگرت، بەش بەشیان کرد، دینەکەیان بەش بەش کردو بوون بە تاقم تاقم! سبحان الله! خوای پەروەردگار زۆر جار ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە، کە وەك کافرو دەغەڵ و موشریکان، نەکەین، بەڵام ئێمە لەزۆر شتدا، وەك ئەوان دەکەین، بۆ وێنە: دەربارەی مونافیقەکان دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ ﴾ الصف

هەروەها دەربارەی جوولەکانیش دەفەرموێ: ﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٤٤ ﴾ البقرة

کەچی چەندان مەلا دەبینی لەسەر مینبەرێ قسەیان چاکە، دواییش کردەوەکانیان پێچەوانەی قسەکانیانن!

هەروەها دەربارەی نەصرانییەکان دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ١٤ ﴾ المائدة

بەڵێ، زۆر لەدەردەکانی: مونافیق و کافرو موشریك و نەصرانیی و جوولەکەکان، لەنێو مسوڵمانانیشدا هەن، لە ئەنجامی دوورییمان لە قورئان و سوننەتدا.

٧)- پوختەی بیروڕام دەربارەی تەزکییە[١]:

لێرەدا بەکورتیی بیرو ڕای خۆمتان لەبارەی (تەزکیة)وە، لە حەوت کورتە سەرنجدا بۆ باس دەکەم:

**یـەك:** وەسیەتتان لێ دەکەم: هەستیار مەبن بەرامبەر بە بەرهەم و ئیجتیهادو کەلەپووری زانایان، لە هەر بوارێکەوە بەرهەمیان هێناوە، بەرامبەر بە هیچی هەستیار مەبن، کە بەڕەهایی ڕەتی بکەنەوەو، بەرامبەر هیچیشی دەمارگیر مەبن، کە بە ڕەهایی قبووڵی بکەن! وەك بەرهەمی فیکری بەشەر تەماشای بکەن، چاکەکەی لێ وەربگرن و، خراپیشی کە تێدایە، ماڵی قەڵپ سەر بە خاوەنیەتی، هیچ کەسیش نەیگوتوە: هەرچی گوتوومە، هەمووی هەقە، بەس فیرعەونم بنیوە لە قورئاندا وابڵێ:

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾ غافر

واتە: فیرعەون گوتی: تەنیا ئەو ڕایەتان پێدەڵێم کە پێم پەسندەو، جگە لە سەرڕاستیی و چاکەشتان پێشان نادەم.

هیچ زانایەکی موعتەبەر نەیگوتوە: هەرچی من دەیڵێم، هەمووی وایە، مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ لەنزیك قەبری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) وەستا بوو، گوتی: {كُلُّ أَحَدٍ يُؤْخَذُ مِنْ قَوْلِهِ وَيُتْرَكُ، إِلَّا صَاحِبَ هَذَا الْقَبْرِ، يَعْنِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ} هەموو کەس قسەشی لێ وەردەگیرێ و بەسەریشی دادەدرێتەوە، جگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە.

---

(١) هەڵبەتە ڕای خۆم لە کتێبی: {صالح بوون و بەرەو خوا چوون}دا بەتەفصیل لەو بارەوە گوتوە، لێرەدا ناتوانم هەمووی بڵێم، هەروەها لە کتێبی: {ژیانی گیان} لەوێشدا ڕای خۆم لە بارەی {تەزکیەی نەفس}ەوە خستۆتە ڕوو، دیسان لە (الكتاب العاشر)ی {موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}شدا، باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

**دوو:** گەورە پیاوانی بواری تەزکیە هەر لە (الحارث المحاسبي)یەوە کە زۆر ناودار بووەو (أبو يزيد البسطامي) و (أبو طالب المكي)یەوە، تاکو دەگاتە (غزالي) و خاوەنانی ئەو تەریقەتانەی کە دیارن: بەهائەددینی نەقشبەندیی، سەیید ئەحمەدی سەرهەندیی، شێخ عەبدولقادری گەیلانیی، کوردەکانی خۆمان: مەولانا خالیدی نەقشبەندیی و، شێخ عوسمانی تەوێڵەیی، کاك ئەحمەدی شێخ و، ئەوانی دیکەی کە بەرێی ئەوانەدا ڕۆیشتوون.

بێگومان ئەوانە هیچ کامیان بێ هەڵە (معصوم) نەبوون، چونکە هیچکەس نیە هەڵەش نەکاو نەشپێکێ، بەدڵنیاییشەوە: ئەو پێشەوایانەی بواری تەزکیە، هیچ کەسیان نەیویستوە بەزم و بازاڕێك بۆخۆی دابنێ و، خەڵك لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە! هەمووی ویستوویەتی: خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، هەمووی ویستوویەتی: خەڵك لەدەوری ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کۆ بکاتەوە، بەڵام ئەوە خەڵکن دوایی ئیستیعابی ئەوەیان نەکردووەو گوتوویانە: ڕێبازی قادریی، ڕێبازی نەقشبەندیی، ڕێبازی فلان و فلان، کە لە هەقیقەتیشدا هەموویان خەڵکیان بۆ ڕێبازی (محمد المصطفى صلى الله عليه وسلم) بانگ کردوە، کە ئەویش وەك ڕێباز ڕێبازی ئەو بووە، ئەگەرنا ئایین و بەرنامەکە تەنیا هی خوایەو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك جێبەجێ کردنی شەریعەتی خوا لەسەر ئەرزی واقیع، ئاوای بۆ بەرجەستە کردووین.

**سێ:** مەرج نیە ئینسان هەر دەستگرتوو بێ بە ڕێبازێکی تەصەووفەوە، بەیەکێك لەو قوتابخانانەوە، ئنجا بکاتە ئامانج، ئەوە مەرج نیە، چونکە ئازایەتیی و ڕۆڵ و هونەری ئەو مامۆستایانەو ئەو ڕێبازانە، هەر ئەوەیە، ئێمە بگەیەنن بە سەرچاوەی قورئان و سوننەت، سەرچاوەی شەریعەت، بەڵام هەموو کەس توانای نەبووە لە قورئان و سوننەت و شەریعەت هەڵهێنجێ، ئەگەرنا لەدوای قورئان و سوننەت، بۆ کوێ دەچی؟ لەدوای قورئان و سوننەت، چی دیکە هەیە بۆ دینداریی؟ هیچی دیکە نیە، تەماشای کتێبەکانیشیان بکەن، هەر ئاماژە دەکەن بە قورئان و سوننەت، بە وەحیی بێ هەڵەو پەڵەی خوا.

**چوار:** مەرج نیە ئەوانەی کە ناویان وەك شێخی مورشیدو ئوستاد نەڕۆیشتوە، پشك و بەشیان نەبوویێ لە تەزکیەی نەفس و تەصەووفدا، بۆ وێنە: پیاوێکی وەك (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ (مجموع الفتاوی)یەکەی سی و پێنج (٣٥) بەرگە، دوو بەرگی کە (١٠و ١١)ن بەناوی (علم السّلوك والتصوف) ەوەن، عاریفێکی گەورە چی دەڵێ، ئەویش هەر ئەو قسانەی کردوون، زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە باسی شێخە کامڵەکان دەکات و دەڵێ: ئەهلی تەصەووف وەك هەر چینێکی دیکە، خەڵکی زۆر چاکیان تێدایەو لادەریشیان تێدایە، بەداخەوە زۆر لە ئەهلی تەصەووف نازانن (إبن تیمیة) وایە، هەر لەخۆوە ڕەفزی دەکەن.

(إبن القیم) کتێبێکی هەیە بەناوی (مدارج السالکین) کە شەرحی (منازل السائرین)ی شێخی (هروي) دەکات، کە شێخێکی ئەهلی تەصەووفە، هەروەها (إبن تیمیة) نامیلکەیەکی شێخ (عبدالقادر)ی گەیلانیی شەرح دەکات بەناوی: (فتوح الغیب) لە یەکێ لەبەرگەکانی (مجموع الفتاوی)داو، هەر جارێ ناوی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی دێ دەڵێ: (قُدِّسَ سِرُّهُ)، کە ئەوە زاراوەیەکە ئەهلی تەصەووف زۆر بەکاری دەهێنن، یانی: خوا ڕووحی پاك بکا!

**پێنج:** زانایانی ڕۆچوو و چاك تێگەیشتوو، ئەو دابەشکارییەی ئێستا هەیە: ئەوە سەلەفییەو پەیوەندیی نیە بە تەصەووفەوەو، ئەوە صۆفییەو پەیوەندیی نیە بە سەلەفییەتەوە! یان ئەوە کاری سیاسی دەکاو، هەقی زانستی شەرعیی نیەو، ئەوە فیقە دەزانێ و هەقی سیاسەتی نیە! ئەو لێکدابڕانە، عادەتی موشریکەکانەو زانایانی ئێمە وانەبوون، بۆ وێنە: (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ، بۆخۆی دەگێڕێتەوە کە: هەر مەسەلەیەکی شەرعیی کە لێی دەوەستاو تێی نەدەگەیشت، دەچووە دەشتێك سەری لەسەر عەرزێ دادەناو دەیگوت: (یا معلّم إبراهیم، علّمني) ئەی مامۆستای ئیبڕاهیم! فێرم بکە! هەروەها (إبن القیم) لێی دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە نوێژی بەیانی دەکرد، هەتا چێشتەنگاو، دادەنیشت و خەریکی زیکرو فیکر دەبوو، دەڵێ: پێم دەگوت: بۆچی پشوویێك نادەی؟ دەیگوت: من بەوەوە ماوم، ئەگەرنا وزەم نامێنێ!

**شـەش:** ئێوە ئەوە بزانن! هیچ پێشەوایەکمان نیە خەڵك سوودی لێ ببینیبێ و، لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحیی و تەزکیەو تەقواوەو، پشکی باشی نەبووبێ، ئیدی وریا بن! وەك کاك ئەحمەدی موفتیزادە {خوا پلەی بەرز بکاتەوە} گوتەنی: خۆتان مەکەنە هەمبانەی مەعلوومات! تەنیا زانیاریی ساردو سڕ کۆ بکەنەوە، پێی ناگەنە هیچ، دەتوانی کتێبان بنووسی و قەڕەباڵغ بی، بەڵام بۆخۆت سوودێك نابینی!

**حـەوت:** کۆتا قسەشم ئەوەیە: ئینسان بۆ ئەوەی بەخۆی بزانێ: ئایا نەفسی تەزکیە بووە، یان نەبووە؟! نیشانەکانی تەزکیە بوونی، چەند شتێکە، من لەو کتێبانەدا کە ئاماژەم پێدان، باسم کردوون:

١- ئینسان لەززەت لە عیبادەت بکات و، عیبادەتی لەسەر شان سووك بێ و بەدڵخۆشییەوە بیکات.

٢- یەکێکی دیکە لە نیشانەکانی ئەوەیە، ئینسان لەگەڵ خەڵدا مامەڵەیەکی جوانی هەبێ، چاوەڕوانیی لە خەڵك نەبێ، مەدحی خەڵك، مەغرووری نەکاو، زەممی خەڵك زۆر نارەحەتی نەکات، کەسێك خۆی بناسێ، ئەگەر یەکێ زۆر بەرزی بکاتەوە، دەڵێ: زۆر ڕۆیشتی و، ئەگەر زۆر نزمی بکاتەوە، دەڵێ: زۆر بەرەو خوار چووی! نەوام و نەواشم، بەندەیەکی خوام!

٣- لە ئەنجامی تەزکیە بوونی نەفسدا، مرۆڤ حاڵەتێکی ئارامیی و دامەزراویی و نەلەخشاویی بۆ دروست دەبێ و، هەمیشە لە هەڵبەزو دابەزو هەڵکشان و داکشاندا نابێ.

٤- بەهۆی تەزکییە بوونی نەفسەوە مرۆڤی مسوڵمان ڕاستییەکانی ئیمان و ئیسلام (حقائق الإیمان والإسلام)ی لە عەقڵ و دڵ چەسپاوو درەوشاوە دەبن و، لەگەڵ ڕەشەباو گەردەلوولی هیچ شوبهەو شەهوەتێکدا، نالەقێ، نەك بە هەر پشوودەبای شوبهەو شەهوەتێك بەملاو لادا بچێ!

ئەوەش بزانن کە قوتابخانەکانی تەصەووف، بۆ پێگەیاندنی لایەنی ڕووحیی مسوڵمانان بوون، وەك چۆن قوتابخانە فیقهییەکان بۆ پێگەیاندنی مسوڵمانان بوون، لەڕووی یاسا ڕواڵەتییەکانی شەریعەتەوە، بەهەمان شێوە هەموو زانستە ئیسلامییەکانی دیکەش، هەر بۆ ئەو ئامانجی بەرزی: باش دینداریی و دنیاداریی کردنی مسوڵمانان، بەرهەم هێنراون.




# مەزهەبە فیقهییەکان

١- سەرژمێریکی مەزهەبە فیقهییەکان و دامەزرێنەرەکانیان.

٢- پێنج کورتە سەرنج دەربارەی مەزهەبە فیقهییەکان.




## سەرژمێرێکی
## مەزهەبە فیقهییەکان و دامەزرێنەرەکانیان

(فقه) واتە: ئەزموونی زانایان لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ دەقە شەرعییەکانداو، هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان لە هەردووك تاکە سەرچاوەی ڕوونی وەحیی (قورئان و سوننەت)، کە بەلای کەمەوە چواردە (١٤) مەزهەبی فیقهیی هەن، کە بەرهەمی چواردە لە پێشەوایانی شەرعزانمانن، هەشتیان ئێستا شوێنکەوتوویان هەن، ئەو هەشت (٨) پێشەوایەی ئێستا شوێنکەوتوویان هەن: (ئەبو حەنیفە، مالیك، جەعفەری صادیق، زەیدی کوڕی عەلی، شافیعیی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، داوودی زاهیریی، عەبدوڵڵای تەمیمیی) ڕەحمەتی خوایان لێبێ، ئەو هەشتە ئێستا شوێنکەوتوویان هەن، شەش پێشەواو زانای دیکەش هەبوون، کە مەزهەبەکانیان شوێنکەوتوویان نین، ئەو پێشەوایانەی ئەو چواردە مەزهەبەش، ئەمانەن:

١- سفيان الثوري: (٩٧-١٦١)هـ.

٢- سعيد بن الجبير: (٤٦-٩٥)هـ.

٣- ليث بن سعيد: (٩٤-١٧٥)هـ.

٤- الأوزاعي: (٨٧-١٥٧)هـ.

٥- سفيان بن عيينة: (١٠٧-١٩٨)هـ.

٦- أبو جعفر الطبري: (٢٢٤-٣١٠)هـ.

٧- أبو حنيفة النعمان بن ثابت: (٨٠-١٥٠)هـ (الحنفية).

٨- مالك بن أنس: (٩٣-١٧٩)هـ (المالكية).

٩- جعفر الصادق: (٨٠-١٤٨)هـ (الجعفرية).

١٠- زيد بن علي (٨٠-١٢٢هـ/ ٦٩٨-٧٤٠م) (الزيدية).

١١- محمد بن إدريس الشافعي (١٥٠-٢٠٤)هـ (الشافعية).

١٢- أحمد بن حنبل: (١٦٤-٢٤١)هـ (الحنبلية).

١٣- داود بن علي بن خلف الأصفهاني، الملقب بالظاهري: (٢٠١-٢٧٠)هـ (الظاهرية).

١٤- عبدالله بن إباض التميمي: (٨٦)هـ (الإباضية).

ئەمانە ئەو زانایانە بوون كە لە هەمووان بەرجەستەتر بوونە، ئەگەرنا بەتەئكید زانای دیكەش زۆر بوون، بەڵام مەزهەبەكانیان نەنووسراونەوەو، شوێنكەوتووانیشیان بەو شێوەیە نەماون.




## پێنج کورتە سەرنج
## دەربارەی مەزهەبە فیقهییەکان

١- وەحیی و شەریعەتی خوا، ئایین (دین)ەو خوا (عز وجل) کە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴿١٩﴾ ﴾ آل عمران

مەبەست پێی وەحییە، ئەو وەحییەی کە لە قورئان و سوننەتدا خۆی دەنوێنێ، بەڵام مەزهەبەکان تێگەیشتنی زانایانن لە دین، لەبواری حوکمە کردەییەکان (الأحكام العملية)دا، هەروەك چۆن ڕێبازەکانی تەصەووف لەبواری تەزکیەی نەفسدا، بریتین لە تێگەیشتنی زانایان لەو ئایەت و فەرمایشتانەی کە باسی تەزکیەو ئەخلاق دەکەن، هەروەها کتێبەکانی ئیمان و عەقیدەو تەوحید، بریتین لە تێگەیشتنی زانایان لەو ئایەت و دەقانەی سوننەت کە باسی ئیمان و عەقیدە دەکەن.

٢- ئەصڵ لە مسوڵمانەتیی و دینداریدا ئەوەیە کە هەرکەس بۆخۆی لە شەریعەت تێبگا، لە قورئان و سوننەت ئاگادار بێ و بیانخوێنێتەوەو تەماشایان بکاو لێیان تێ بگاو، دینداریی بکات، چ وەك ئیمان و عەقیدە، چ وەك ئەخلاق،

چ وەك هەڵس و کەوتی: تاکیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، کاتی خۆی وابووە: هاوەڵان ئاوا قورئانیان لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەرگرتوەو، فەرمایشتەکانی کە فەرمووني و، ئەو کردەوانەی کە کردووني، پێیان دەگوترێ: سوننەت، واتە: ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ تێگەیشتنی قورئان و، چۆنیەتی پراکتیزە کردنی قورئان، هاوەڵان پێغەمبەری خوایان (صلی الله علیه وسلم) لەبەر چاو بووە، هەم کە ئایەتەکانی خوێندوونەوەو، هەم کە بۆشی جێبەجێ کردوون، ڕێك دینیان بەبەرجەستە کراویی لە پێغەمبەری خوادا بینیوە: بە ئیمان و عەقیدەیەوە، بە عیبادەتیەوە، بە ئەخلاق و، بە جەنگ و جیهادو، بە سیاسەت و، بە هەموو شتێکیەوە.

لەدوای وی خەلیفە ڕاشیدەکانیشی بەهەمان شێوە، لەدوای ئەوانیش هەرکەسە بەپێی خۆی، ئەصڵ ئەوەبووە، بەڵام وردە وردە کە ژمارەی مسوڵمانان زۆر بوو، کەسێکی وەك پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) کە بەس ئەو وابوو، لەنێویاندا نەما، کە بەتەواویی بەرجەستە کەری قورئان و سوننەت و ئیسلام بێ، نە ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ بەتەواویی وابوو، بەڵێ جێنشینی یەکەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووو لە هەموو کەس باشتر بوو، بەڵام پارێزراو (معصوم) نەبوو لە هەڵە، هەروەها عومەرو، عوسمان و، عەلی، خوا لەهەموویان ڕازی بێ، ئەو چوار خەلیفە ڕاشیدە، لە هاوەڵان لەهەمووان باشتر بوون، بەپێی تێگەیشتنی ئێمەو، لە هەموانیش دیندارتر بوون و، بە شەریعەتەوە پابەندتر بوون، بەڵام سەرەنجام پارێزراو نەبوون لە هەڵە، بۆیەش قسەی ئەوان بەدین دانەنراوەو، کردەوەی ئەوان بەدین دانەنراوە، مەگەر ئەوەی ڕاستەوخۆ دین بووبێ و جێبەجێیان کردبێ، ئەگەر ڕاستەوخۆ ئایەتێکیان جێبەجێ کردبێ، ڕاست حوکمێکی شەرعییان جێبەجێ کردبێ، ئەوە دین بووە، بەڵام ئەوەی دیکە کە بۆچوون و تێگەیشتنی خۆیان بووە، بە دین دانانرێ، بەڵکو بە تێگەیشتنی ئەوان لەبارەی دینەوە دادەنرێ.

هەر لە خەلیفە ڕاشیدەکانەوە بگرە، هەتا دوایی بەو شێوەیە بوو، ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد: ئێستاش لەبواری پایەکانی ئیماندا، لاسایی کردنەوە

دروست نیە، بەگشتی دروست نیە، واتە: دروست نیە بڵێی: ئیمانم بەخوا هەیە، چونکە فڵان مامۆستا وا دەڵێ، یان: ئیمانم بە فریشتەکان هەیە، چونکە فڵان مامۆستا وایگوتوە، هەروەها... بەڵکو دەبێ ئینسان خۆی بگاتە قەناعەت و یەقین، کە خوا سبحانە و تعالی هەیە، ئنجا ئەو خوایە کتێبی ناردوون بە فریشتاندا، بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، هەروەها ڕۆژی دوایی هەیە، دەبێ ئینسان خۆی بگاتە یەقین و زانستی بەوە هەبێ، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد.

واتە: بزانە کە جگە لەخوا هیچ پەرستراوێك نیە.

زانایان دەڵێن: هەموو ئەو دواندنانەی ڕوویان لە پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر بەڵگەو نیشانەیەك نەبێ تایبەتیان بکات بەوەوە، ئۆممەتەکەشی دەگرنەوە، لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد، واتە: بزانە! کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، ئێمەش دەگرێتەوە، دەبێ بزانی و عیلمت هەبێ بەو ڕاستییە گەورەو مەزنە کە: جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، هەروەها سەرجەم پایەکانی دیکەی ئیمان.

بۆیە زانایان دەڵێن: لە بنچینەکانی ئایین (أصول الدین)دا لاسایی کردنەوە (تقلید) دروست نیە، بەڵام لەبواری وردەکارییەکانی دیکەی دینداریيدا، بەتەئکید هەموو کەس بۆی ناکرێ بۆخۆی لێبکۆڵێتەوەو تێبگات، وەك پێشتریش باسمان کرد: لەبواری یاسا کردەییەکاندا، کە فیقە سەرپەرشتیی ئەو لایەنە دەکات، دروستە ئینسان بەدوای زانایان بکەوێ، ئەگەر بۆخۆی نەزانێ، لەوەشدا شوێنکەوتن (إتِّباع) هەیە، نەك لاسایی کردنەوە، چونکە وەك پێشتر باسمان کردوە[1]: (تقلید) لە (قِلادة)وە هاتوە، کە بە ڕێشمەی وڵاخ دەگوترێ، ئەو وڵاخە نازانێ خاوەنی بۆ کوێی دەبا؟ بەڕاستی تەقلید لە مسوڵمان ناوەشێتەوە، ڕاستە زانایان باسی (تقلید)یان کردوە، بەڵام بەبۆچوونی من ئەو وشەیە جوان

---

(١) لە بەشی یەکەمی تەوەری دووەمدا.

نیە، چونکە ئەو وشەیە حاڵەتی زەم دەگرێتەوەو، مسوڵمان لێی ناوەشێتەوە لە دینداریی و خوا پەرستییدا لاسایی خەڵکی دیکە بکاتەوە، چونکە خوا سبحانە و تعالی ئەوەی لە کافرەکان بەرەخنە گرتوە:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾ البقرة

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: شوێن ئەوە بکەون کە خوا دایبەزاندوە، دەڵێن: بەدوای ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە!

کە ئەوەش لەنێو مسوڵماناندا ئێستا بوونی هەیە، چەند مەجلیس و کۆڕ هەیە دەڵێی: خوا وایفەرمووە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وای فەرمووە، دەڵێن: ئەوەمان نەزانیوەو هەر ئاوا فێر بووین! وەك قسەی موشریکەکان، بۆیە کە پێتان دەڵێم: مسوڵمانان زۆر لە قورئان و سوننەت دوور کەوتوونەتەوە، بۆیە وامان لێهاتوە، ئەوە بەڕاستیی وایەو لە هەموو ڕووێکیشەوەو بەشێوەیەکی گشتیی، هەڵبەتە ناڵێم: مسوڵمانان کافر بوونە! دەڵێم: لە شەریعەت دوور کەوتوونەتەوەو دینداریەکەیان کاڵ بۆتەوە، بەتایبەتی لەڕووی چاك تێگەیشتنی دینەوە، هەرکەسێکیش باش لەدین تێنەگات، باشیش پێوەی پابەند نابێ، هەمیشە کارکردن، لقی تێگەیشتنە، کەسێك چاك تێنەگات، چاکیش کار ناکات.

٣- هەتا سەدەی چوارەمی کۆچیی، هیچ کەس بەرەهایی بە مەزهەبەکانەوە پابەند نەبووە، بەڵکو لە سەرەتاوە هەتا سەدەی چوارەمی کۆچیی:

**یەك**" یان خەڵك شارەزا بووە بۆخۆی، شارەزاییەکەش ڕێژەیی بووە، بەڵام هەرکەس بەشی خۆی شارەزا بووە، چونکە زانیویانە دەبێ لە قورئان و سوننەت تێبگەن.

**دوو**" یان ئەوەی شارەزا نەبووبێ، لەشارەزایانی پرسیوە:

﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل.

واتە: ئەگەر نازانن، لە شارەزایان بپرسن.

لە شارەزایانیان پرسیوە، بەبێ ئەوەی خۆیان ببەستنەوە بە زانایەکی دیاریی کراوەوە.

بەڵام شوێنکەوتنی مەزهەبەکان، لەدوای سەدەی چوارەمەوە پەیدا بوو، ئەوە کە کۆمەڵێك خەڵك خۆیان ببەستنەوە بە زانایەکەوە، ئەگەرنا پێشێ خۆیان بە هەموو زانایانەوە دەبەستەوە، بۆیە شەرعزانان گوتوویانە: (العامي لا مذهب لە) خەڵکی گشتیی مەزهەبی نیە، هەروەها گوتوویانە: (مذهب العامي، مذهَبُ مفتيه)، مەزهەبی خەڵکی گشتیی، مەزهەبی موفتیەکەیەتی، چۆنی فەتوا بۆ بدات، بەوەوە پابەند دەبێ، ئەمما هەر لەڕێوە خۆی لەسەر مەزهەبێك قۆرخ کردبێ، ڕاست نیەو، ئەوە لەسەدەی چوارەمەوە ڕوویدا، کە دەرگای ئیجتیهادو بیر کردنەوەیان داخست، دەرگای تێگەیشتنی تازەیان لە دین، داخست، ئنجا لەو کاتەشەوە مسوڵمانان ئاوا لێژ بوونەوە، بەرەو خوار لە هەموو ڕوویێکەوە!

٤- ئێستاش شەریعەت نە لە چوار مەزهەبەکان و، نە لە هەشت مەزهەبەکان و، نە لە کەمترو زیاتردا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵێ شەریعەت، نە چوار مەزهەبەکەیە بەتەنێ، نە هەشت مەزهەبەکەیەو، نە تەنیا زیاتر لەوانەشە، بەڵکو شەریعەت دەریایەو، ئەوانەش هەموویان جۆگەلەن لێیەوە هەڵبەستراون، هەروەك چۆن قورئان و سوننەت دەریای عیرفان و تەزکیەی نەفس و بۆ خوا صوڵحانەو، ڕێبازەکانی تەسەووف جۆگەلەن لێیەوە هەڵبەستراون و، ئەزموونی بەشەرن! ئنجا ئەمەش زۆر شتی لەسەر هەڵدەچنرێ: ئەگەر شەریعەت کورت هەڵنەهاتبێ لە فڵان مەزهەب و فیسار مەزهەبدا، کەواتە: ئەگەر کەسێ: لە مەسەلەیەك لە مەزهەبەکەی لایداو ڕایەکی دیکەی هێنا، کە لەهیچ کام لە مەزهەبەکاندا نەبوو، بەڵام موافیقی زمان و عەرەبی بووو، پێچەوانەی ئیجماع نەبووو، لەگەڵ ڕووحی قورئان و سووننەتدا دەگونجاو، بەڵگەی بەدەستەوە بوو، ئەوە شتێکی ناشەرعیی و خراپی نەکردوە، بەڵکو شتێکی زۆر باشی کردوە!

ئێستا چەندان مەسەلەی تازەو نوێ هەن، کە زاناو پێشەواکانی پێشووی ئێمە، لەخەونیشدا نەیانبینیون، ئەو شێوازی شەڕو ئاشتیی و، دنیا بەڕێوەبردنەی ئێستا دەکرێ، لە خەونیشدا شتی وایان نەبینیوە، چوونە سەر مانگ و ڕۆکێت هەڵدان

بۆ سەر مەریخ و، دنیا گەڕان و، بن دەریا پشکنین و، ئەنتەرنێت و، ئەو هەموو تەکنۆلۆژیایەی ئێستا پەیدا بووە، لە خەونیشدا نەیانبینیوە، کەواتە: ئەوەی لەبارەی ئیمان و عەقیدەوە، لەبارەی بووناسییەوە، لەبواری ئەخلاق و ڕەوشتدا، لەبواری باری کەسێتییدا، گوتوویانە تەواوە، چونکە ئەو لایەنە لە ژیانی مرۆڤـ نەگۆڕە، بەڵام ئەوەی بۆ بواری هەڵس و کەوتی سیاسیی و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی و گوتوویانە، هەمووی پەیوەستە بە ڕۆژگاری خۆیانەوە، ئەگەر بەکەڵکی ئێستا نەهات،بۆ ئەوان نوقصانیی نیە، بەڵام بۆ مسوڵمانانی ئێستا نوقصانییە، بەدوای فەتواو بۆچوونی زانایەك بکەون، کە هەزارو دووسەد (١٢٠٠) ساڵ کەمتر یان زیاتر پێش خۆیان ژیاوە، لە کۆمەڵگایەك و هەل و مەرجێکدا ژیاوە کە: (١٨٠) پلە جیایە لەوەی ئێستا، دواییش خەڵك وا دەزانێ دین بەجێ ماوە لەژین، نازانێ بۆیە مسولمانان لە ژیاندا بەجێماون، چونکە عەقلی خۆیان داخستوەو گوتوویانە: تازە کەس بۆی نیە لە قورئان و سوننەت تێ بگات!!

٥- دەرگای ئیجتیهاد خوا کردوویەتەوە، بەکەس دانەخراوەو داناخرێ، چونکە ئایا خوا عز وجل دەرگایەك بکاتەوە، بە مرۆڤـ دادەخرێ؟ خوا بفەرموێ: لێبکۆڵنەوەو وردبنەوەو لە قورئان ڕابمێنن و سەرنج بدەن، کەس بۆی هەیە بڵێ: بۆت نیە کاری وا بکەی؟! کێ ئەو هەقەی پێ داوە؟

هەڵبەتە ئەوەش هەل و مەرجی خۆی هەبوو، کە هەندێ لە زانایان کاتی خۆی فەتوایان داوەو گوتوویانە: دەرگای ئیجتیهاد داخراوە، لەبەر ئەوە وایانگوت تەماشایانکرد: هەندێ کەس یاسای شەرعییان هەڵدەهێنجان، بە گوێرەی ئارەزووی حوکمڕانانی لارو ستەمکار، وەك هەندێ لەو مەلایانەی ئێستا کە سەر بە حیزبە عەلمانییەکانن، فەتوای سەیرو عەجایب دەدەن! ئنجا ئەو زانایانەش تەماشایان کرد: دەسەڵاتداران وەك پێویست پابەند نین بە شەریعەتەوە، هەندێ لەو کەسانەش کە زانا (عالم) نین و (متعالم)[1]ن، یان (شیخ) نین و (متشیخ)

---

(١) عالم: زانا، متعالم: خۆ بەزانا پێشاندەری نەزان.

ن، هەندێ قسە دەکەن، بەپێی ئارەزووی دەسەڵاتدارەکان، کە ئیمامەکانی پێشێ نەیانکردوون، پێیان دەگوتن: چۆن ئەو قسانە دەکەن؟ دەیانگوت: ئیجتیهاد دەکەین، (هم رجال ونحن رجال) بۆیە هەندێ لەو زانایانە گوتوویانە: دەرگای ئیجتیهاد داخراوە، وایان داناوە کە ئەگەر گوتیان: دەرگای ئیجتیهادگاڵە دراوە، بەناچاریی هەر قسەی ئەو مەزهەبانە دێننەوەو کەس بۆی نیە قسەیەکی تازە بکات، بە حیساب بۆ ئەوەی رێ بگرن لەو پاشا گەردانیی (إنفلات)ە، کە لە فەتوادا هەبووە! بەڵام بەتەئکید شتێکی باشیان نەکردوە، با ئیجتیهاد هەر کرابایەو ئەو دەرگایە دانەخرابایە، دەکرا ئەو ئیجتیهادو بۆچوونانەی لە خزمەتی حوکمڕاناندان، ڕەخنەیان لێ گیرابایە، ئا ئەوە باشتر بوو لەوەی دەرگای بیرکردنەوەو کۆشش کردن و تێگەیشتنی تازە لە قورئان و سوننەت، دابخەی، چونکە کە ئەوەت کرد، دەبێ کوێرانە بەدوای هەندێ بۆچوون بکەوی، کە بەکەڵکی سەردەمی تۆ نایەن، یان دەبێ لەو بۆچوونانە گەڕێی، دەسەڵاتداران چۆنیان پێ خۆشە، ئاوا بڕیار بدەن!

ئنجا بۆ زانیارییتان! (إبن القیم) کە لە ساڵی حەوسەدو پەنجا (٧٥٠ك)دا وەفاتی کردوە، لەو کاتەوە، کتێبێکی هەیە بەناوی: (إعلام الموقعین عن رب العالمین)، لەوێدا دەڵێ:

{لەبەر ئەوەی زانایان ڕێیان گرت لەوەی ئیجتیهادی تازە بکرێ، بۆ هەڵهێنجانی حوکمی شەرعیی تازە، لە قورئان و سوننەت و، ڕووداوو پێشهاتی تازەش دەهاتنە پێش و، پێویستییان بە حوکمی تازە هەبووە، زانایانیش ڕێیان لەوە گرتبوو تێگەیشتنی تازە لە قورئان و سوننەت دەربێنن، کاتێك دەسەڵاتدارانیش دەگەڕانەوە بۆ زانایان و دەیانگوت: ئەو مەسەلەیە حوکمی چییە؟ دەیانگوت: نازانین و لەمەزهەبەکاندا نەهاتوە، چونکە لەسەردەمی واندا نەبووە، سەرەنجام حوکمڕانەکان دەیانگوت: چی بکەین؟ ئەگەر ئێوە فەتوامان بۆ نەدەن و، حوکممان بۆ هەڵنەهێنجن، بۆخۆمان چۆنمان پێ باشە وا دەکەین! ئنجا یان لە تەتەرو مەغۆلیان وەردەگرت، یان لە ڕۆمیان وەردەگرت، یان لە فارس، یان لە عادەتی خەڵکی عەشایرو بیابانشین، وەریان دەگرت، (إبن القیم) دەڵێ: لەوێوە

بیرۆکەو نەرێنیی و ناشەرعیی هاتنە نێو مسوڵمانانەوەو، ئەو زانایانەی ڕێگای ئیجتیهادیان نەدا، حوکمڕانانیان ناچار کرد: پەنا بەرن بۆ هەندێ یاسای ناشەرعیی کە لە غەیری شەریعەتەوە سەرچاوەیان گرتوە}[1] قسەکەشی زۆر جوانەو لە کتێبی یەکەمی مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی}دا هێناومەو، قسەشم لەبارەوە کردوە[2].

ئێستاش لەکۆتایی ئەم تەوەرەیەدا، چوار تەوژمی دیکەی نێو مسوڵمانان، لە مێژووی هاوچەرخدا دەخەینە ڕوو، مێژووی هاوچەرخ، مەبەستم ئێستا نیە، بەڵکو زیاتر مەبەستم هەردووك سەدەی هەژدەو نۆزدەو، بەشێك لە سەدەی بیستە:



---

(١) چەمك و واتای قسەکەیم هێناوە، نەك دەقەکەی، بڕوانە: ج٤ ص٤٦١.

(٢) بڕوانە: ئیسلام و دەوڵەتداریی، بەرگی ١، لا: ٢٠-٢٤.




# بزووتنەوەی وەهابیی
# ( الحركة الوهابية )

١- پێناسە.

٢- بەرنامەو سەرهەڵدان.

٣- حەوت ڕەخنەو سەرنج لەسەر جووڵانەوەی (وهابية).




## پێناسە

دامەزرێنەری ئەم تەوژمە (محمد بن عبدالوهاب)ە، کە لە ساڵانی: (١١١٥-١٢٠٦ك/ ١٧٠٣-١٧٩٢ز)دا ژیاوە، دیارە موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، وەك هەر زانایەکی دیکە، خۆی بە شوێنکەوتووی پێشینی چاك (السلف الصالح) لەقەڵەم داوە، لە کتێبەکانیدا زۆر باسی بۆچوونەکانی سێ لە زانایان دەکات، کە بریتین لەم سێ پێشەوایە:

١- أحمد بن حنبل: (١٦٤-٢٤١هـ/ ٧٨٠-٨٥٥م).

٢- إبن تيمية: (٦٦١-٧٢٨هـ/ ١٢٦٣-١٣٢٨م)

٣- إبن قيم الجوزية: (٦٩١-٧٥١هـ/ ١٢٩٢-١٣٥٠م).

موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب زیاتر خۆی بە شوێنکەوتووی ئەو سێ زانایە لەقەڵەم دەدات و، قسەکانی ئەوان زیاتر لە کتێبەکانیدا باس دەکات.

هەڵبەتە تەوژمی (وهّابي) ناحەزەکانیان پێیان گوتوون: (وهّابي)، بەڵام خۆیان بەخۆیان گوتوە (الموحِّدون)، خوا بەیەکگران، بەڵام ئەگەر بڵێی: (الموحِّدون) کەس نایانناسێتەوە، هەتا نەڵێی: وەهابیی، لەبەر ئەوە زانایان گوتوویانە: ئەگەر کەسێك بەناوێك بناسرێ و ناوەکەش ناشەرعیی نەبێ، ئاساییە ناوەکەی بۆ بەکار بهێنی.




## بەرنــامە و سەرهەڵدان

ڕەوتی (وهّابي) کاری سەرەکییان بریتی بووە لە گێڕانەوەی خەڵك بۆ خوا بەیەکگرتن و، دژایەتیی کردنی شیرك، بەتایبەت مامەڵەکردنی خەڵك لەگەڵ مردووەکانیاندا، مەزارگەی مردووان و پێشەوایان و صاڵحان هەر بۆیەش نازناوی: (الموحِّدون)یان هەبووە.

(محمد بن عبدالوهاب) لەگەڵ (محمد بن سعود)دا، لە ساڵی: (١١٧٩هـ/١٧٦٥م)دا، ڕێککەوتنێك دەکەن، ئەو کاتە (محمد بن سعود) ئەمیری (دِرْعیة) بووە، کە شارێکە لە حیجاز، کە (محمد بن سعود) وەك سەرۆکی سیاسیی و (محمد بن عبدالوهاب) وەك سەرۆکی ڕووحیی ئەو خەڵك و جووڵانەوەیە بوودو چەند شوێنێکیان گرتوون، بەڵام چواردە (١٤) ساڵ دوای مردنی (محمد بن عبدالوهاب)، لە ساڵی: (١٢٢٠ك/١٨٠٥ز)دا، (محمد بن سعود) (حَرَمین) دەگرێ، واتە: مەککەو مەدینە، دوایی لە نەجدو، تیهامەو، حیجازدا، دەوڵەتێك دادەمەزرێنێ، پێی دەگوترێ: دەوڵەتی (سعوودیی یەکەم)، بەڵام لە ساڵی: (١٢٣٣ك/١٨١٨ز)دا موحەممەد عەلی پاشا، کە والی مصرِ

بووه، لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە ڕاسپێرردراو هێرشی کردە سەر دەوڵەتەکەی (محمد بن سعود)و کۆتایی بە دەوڵەتەکەی هێناو، شاری (درعیة)ی گرت و دەوڵەتەکەی ڕووخا.

خوا پشتیوان بێ ئێمە دوایی لە تەوەری پێنجەمدا، لەباسی جموجۆڵەکاندا، باسی تەوژمی (سەلەفیی) دەکەین و مێژوویەکی جووڵانەوەی {وەهابیی} باس دەکەین.




## حەوت ڕەخنە و سەرنج
## لەسەر جووڵانەوەی (وهابية)

١- سەختگیریی و تێپەڕاندن، لە عیبادەت و عەقیدەو عادەتدا، یەکێك لەوانە: بەکافر دانانی مسوڵمانانێك کە هەڵەیەکیان لێ دەرکەوتوە، کە (محمد بن عبدالوهاب) پێی وابووە شیرکە، کە ڕەنگە شیرك نەبووبێ، لە حاڵێکدا کە ئەگەر شیرك و کوفریش بێ، هەر بە قسەی پێشەوایەکەی خۆی: (إبن تيمية) لەچەند شوێنێك لە (مجموع الفتاوى)کەیدا دەڵێ: {جاری وایە قسەی مرۆڤێك، یان کردەوەکەی شیرك دەبێ، یان کوفر دەبێ، بەڵام خۆی بە موشریك و کافر لەقەڵەم نادرێ} بەڵام بە هەقیقەت موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب زۆر تێی پەڕاندوە، هەر کەسێ شیرك یان کوفری لێ دەرکەوتبێ، یان ئەوەی ئەو بەشیرك یان کوفری زانیوە! یەکسەر خاوەنەکەشی بە کافرو موشریك لەقەڵەمدا داوە، مامەڵەی کافرو موشریکانیشی لەگەڵ کردوە، بۆ وێنە: دەوڵەتی عوسمانیی بەو پان و پۆڕییەی کە زۆربە جیهانی ئیسلامیی لەبەردەست دابووە، ئەو دەوڵەتەی هەموو کافر کردوە! بە سوڵتان و (شيخ الإسلام)ەوە، هەرچی لەگەڵیان بووە، هەرچی پێیان ڕازی بووە!

هەندێ جار (محمد بن عبدالوهاب) زۆر مەدح دەکرێ و لە کەوڵی خۆی زۆر دەبردرێتە دەرێ، لەلایەن هەندێ لە دەوڵەتانی حوکمی بنەماڵەیی و میراتییەوە، ئەگەر نا پێم وایە لە ڕووی زانستەوە - وەك لە کتێبەکانیەوە دیارە - ئاستێکی بەرزی نەبووەو زۆر لە خوار ئاستی نەك هەر (إبن تيمية)و (إبن القيم) بگرە (الشوكاني) و (الصنعاني)یشەوە بووە، پیاوێکی باش بووەو زۆریش خۆی ماندوو کردوە، بەڵام ئەوە یەکێکە لە تێبینییەکان لەسەری، کە زۆر سەخت گیر بووە لە عەقیدەدا، لە عیبادەتدا، لە عادەتداو، ئاستێکی زانستی بەرزیشی نەبووە.

٢- (إبن عبدالوهاب) هەر کەسێك لەگەڵی ناکۆك بووبێ، جەنگ کردنی لەدژی بەڕەوا داناوەو، پەنای بردۆتە بەر هێزو چەك و، خوێنیشی بە حەلاڵ زانیوەو، سەروماڵیشی بە غەنیمەت زانیوە! بۆیە خوێنێکی زۆری ڕشتوە، کە پێم وایە زۆری بە ناهەق بووە، ئەگەر نەڵێین: هەمووی!

٣- کۆمەڵەکەی زۆر خەریکی ئەوە بووە گۆڕستانان بڕووخێنێ! بە سوپایەکەوە هاتوە بۆ (كربلاء)و تەختی کردوەو ژمارەیەکی زۆر خەڵکی لێ کوشتوەو، هەرچی پارەو سامان کە لەسەر گۆڕی (حسين) خوا لێی ڕازی بێ، کۆکراوەتەوە، هی شیعەکان، هەمووی بردوە، ئنجا بەهەرحاڵ پارەکەی عافێت بێ، بەڵام خەڵکەکەی بۆچی دەکوشت و قەبرەکانی بۆچی دەڕووخاندن؟ دەگونجا گومەزو شتە زیادەکان لابەرێ.

ئنجا نەك هەر لەوێ، لە گۆڕستانی (بقيع) یەك قەبری هاوەڵانی نەهێشت، ئێستا تۆ دەچیە گۆڕستانی (بقيع) نازانی کامە گۆڕی کامەیە؟ بۆ وێنە: ئەگەر بمانزانیبایە، ئەوە قەبری عائیشەیە دایکی ئیمانداران و، ئەوە هی فلان هاوەڵەو، ئەوە هی فلانە، قەیدی چی دەکرد! زۆر زێدەڕۆیی لەوەشدا کردوە.

٤- لەمەسەلەی بە حەڕام داناندا، بازنەی قەدەغەکان (محرّمات)ی زۆر فراوان کردوە، دژی داهێنان بووەو، دژی ئەو شتانە بووە کە پەیوەندییان بە دەوڵەت و مەدەنییەت و شارستانییەتەوە، هەیە، دوایی لەدەوڵەتی دووەم و سێیەمی سعوودییشدا، هەر شتێك برداوە بۆ حیجاز گوتوویانە: ئەوە بیدعەتە، سەیارە،

تەیارە، هێڵی شەمەندەفەر، وێنە، قاوە خواردنەوە، پەردەکردن بۆ ڕەوزەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، گوتوویانە: ئەوانە هەموویان بیدعەتن! بۆیە مامۆستای گەورەی کۆیە لە تەفسیرەکەی خۆیدا لەبارەی ئەو دەوڵەتەوە دەڵێ: هەندێ شتی باش باشیان هەیە {چونکە مەلای گەورە زۆر دژی شێخی ساختەو هەڵەو پەڵەکانیان بووە، لەو ڕووەوە زۆر کەیفی بەو وەهھابییانە هاتوە} دەڵێ: بەڵام ئەوانیش بێ قەزا بن، هەر خۆت بجووڵێنیەوە دەڵێن: بیدعەتە، هەموو شتێکیان قەدەغە کردوەو، کەس ناوێرێ لە کەوڵی خۆیدا بجووڵێ.

٥- مانای بیدعەتیان زۆر فراوان کردوە، زۆر شت هەیە هیچ پەیوەندیی بە مەسەلەی بیدعەتەوە نیە، بۆ وێنە: ئێستاشی لەگەڵدا بێ لە سعوودیە خۆپێشاندان بیدعەتە! خۆپێشاندان مامەڵەی خەڵکە لەنێو خۆیاندا، مامەڵە لەگەڵ خوادا، بیدعەتی دەکەوێتێ، چ مامەڵەی فیکریی، وەك ئیمان و عەقیدە، چ مامەڵەی کردەیی، وەك عیبادەتەکان و دروشمەکان، ئەمما مامەڵەی خۆمان لەنێوان خۆماندا: خۆپێشاندان دەکەین، ڕەخنە لەیەکدی دەگرین، ئەوە هیچی بیدعەتی نایەتە نێو، ئنجا عەجایب ئەوەیە: (إبن عثیمین) و (إبن باز) ڕەحمەتی خوایان لێبێ، وەك لە کتێبی: {جەژن و یادو بۆنەکان}دا هێناومە -زانایانی دیکەش هەروا دەڵێن- دەڵێن: بیدعەت لە دوو بازنەدایە، بازنەی عەقیدەو، بازنەی عیبادەت، ئنجا وەرە پێم بڵێ: یاد کردنەوەی لەدایك بوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، یادی کۆچکردن، جەنگی بەدر، شەوڕۆیی، ڕۆژی درەخت، ڕۆژی منداڵ، ڕۆژی دایك، ڕۆژی ڕۆژنامەنووسان، ئەو یادو بۆنانەی دیکە کە هەن، لە خودی خۆیاندا، چ پەیوەندییان بە بیدعەتەوە هەیە؟ هەمووی مامەڵەی خەڵکە لەبەینی خۆیاندا، بۆیە هەرکامیان تەماشای نێوەڕۆکەکەی دەکەین: ئەگەر نێوەڕۆکەکەی شەرعیی بوو، شەرعییەو، ئەگەر ناشەرعییش بوو، ناشەرعییە، هەروەها تەماشای شێوازەکەیان دەکەین: چۆن دەکرێن؟ ئەگەر شێوازەکەی ناشەرعیی بوو دەڵێین: لەبەر ئەوەی ناشەرعییە، ڕەخنەمان لێی هەیە، ئەگەرنا ئەگەر ڕۆژێك تایبەت بکرێ بە یادی دایك، چ کێشەی هەیە؟ ڕۆژێك تەرخان بکەین باسی ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خوا

بکەین، ناشەرعییەکەی لەکوێدایە؟ هەروەها هەر بۆنەو یادێکی دیکە لەو بۆنەو یادانە، مادام لەخودی خۆیان ناشەرعیی نەبن، بیدعەتیان نایەتە سەرێ، بەڵکو شەرعیی و نا شەرعییان دێتە سەرێ، چونکە بیدعەت پەیوەندیی بە عەقیدەو عیبادەتەوە هەیە.

٦- زۆر دەمارگیر بوون بۆ بۆچوونە فیقهییەکانی خۆیان، کە هی خۆیان هەمیشە پێ ڕاست بووەو، هی بەرامبەریشیان هەمیشە پێ هەڵە بووە، جاری واش هەیە هەر بەهەڵەدانان ئیکتیفایان نەکردوەو، شیرك و کوفریشیان داوەتە پاڵ ئەو کەسانەی کە بۆچوونی پێچەوانەی ئەوانیان هەبووە، ناڵێم: موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ئاوا بووە، بەڵام شوێنکەوتووانی ئەوەیان زۆر بووە، ئنجا ڕەوتەکەی ئەوانیش کە ئێستا پێی دەگوترێ: قوتابخانەی سەلەفیی و وەهابیی، هەر ڕەوت و مەزهەبی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە، ئەوەی ئێستا لە بواری دروشمەکاندا، لە سعوودیە پیادە دەکرێ، مەزهەبی حەنبەلییە! بەڵام بێگومان شوێنکەوتووانی مەزهەبەکانی دیکەش، هەر بەدوای قورئان و سوننەت کەوتوون و، لە جیهانی ئیسلامییدا بەشێکی کەمی خەڵکی، لەسەر مەزهەبی ئەحمەدن، زۆربەی هەرە زۆری لەسەر مەزهەبەکانی دیکەن، بەڵام زۆر جار سوڵتەی سیاسیی و توانای ماددیی، هەندێ شتان دەگۆڕێ و، بانگەشە بۆ هەندێ شت دەکات، کە مەرج نیە لە واقیعدا وابێ.

٧- ئەو کۆمەڵە هەستیارییەکی زۆریان هەبووە بەرامبەر بە بەرەو پێشچوون و شارستانییەت و داهێنان و شتی تازە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ کردو، زۆر داخراوو گۆشەگیر بوون وەك دینداریی، بەڵام سیاسییەکانیان سنوور نەبووە بۆ کرانەوەیان، بە تایبەت لەگەڵ زلهێزان و ڕژێمە وابەستەکانیاندا!!




# سەنووسییەکان
# (السنوسية)

١- پێناسە.

٢- تایبەتمەندییەکانی جووڵانەوەی سەنووسییەکان.

٣- بەرنامەی پەروەردەیی سەنووسییەکان.




## پێناسە

دامەزرێنەری ئەم جموجۆڵە، ناوی: (محمد بن علي السنوسي)یە، كە لە ساڵانی (١٢٠٢-١٢٧٦هـ/١٧٨٧-١٨٥٩م)دا ژیاوە، پێنج ساڵ پێش كۆچی دوایی موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهاب لەدایك بووە، لە وڵاتی جەزائیر، لە هۆزی (مجاهر)ە، ئەم پیاوە خزمەتێكی زۆر گەورەی كردوە لە ئەفریقیادا بە گشتی، بۆ وێنە: (١٨٨) قوتابخانەی كردۆتەوە: (٢٥)یان لە جەزیرەی عەرەبییدا بوون و، (١٦٣)یان لە ئەفریقیا بوون: (٩٧)یان لە لیبیاو، (٤٧)یان لە میصرو، (١٧)یان لە سوودان و، (٢)یان لە توونس، كە بەم قوتابخانانە گوتراوە گۆشە (زاویة)و (زاویة)ش مزگەوت بووەو قوتابخانەشی لەگەڵدا بووەو، كێڵگەی لەگەڵدا بووەو، شوێنی حەوانەی موریدان و قوتابییانی تێدابووەو، كۆگای تێدا بووەو، شوێنی ڕاهێنان و مەشقی سەربازییشی تێدا بووە!

بەكورتیی سەنووسییەكان وەك یەكێ لە زانایەكان دەڵێ:

{السنوسيون: كتيبة الصِّدام الإسلامية، في شمال أفريقيا وقلبها للزحف الإستعماري الجديد}[1]، واتە: سەنووسییەكان بریتی بوون: لە هێزی بەرگریی ئیسلامیی، لە باكووری ئەفریقیاو، لەنێو دڵی ئەفریقیادا، لەبەرامبەر هێرشی ئیستیعماری تازەدا.

---

(١) تيارات الفكر الإسلامي، د. محمد عمارة، ص ٢٦٢-٢٧١.




# تایبەتمەندییەکانی جوڵانەوەی سەنووسییەکان

ئەم جوڵانەوەیە پێنج تایبەتمەندیی گرنگ و بەرچاوی هەبوون:

١- سەلەفییەتێکی[1] هاوسەنگ لە عەقیدەدا.

٢- تەصەووفێکی شەرعیی پابەند بە قورئان و سوننەتەوە.

٣- لەڕووی فیقهییەوە، دەرگای ئیجتیهادیان کردۆتەوە.

٤- پەروەردە کردنی موریدەکان بۆ جەنگ و جیهاد کردن.

٥- بانگەواز کردن و بڵاو کردنەوەی ئیسلام[2].

---

(١) ئەو سەرچاوەیەی لێم وەرگرتوە ئەو تەعبیرەی بەکار هێناوە، ئەگەرنا (ئیمان و عەقیدە) هەر ئیسلامییەو سەلەفیی و خەلەفیی تێدا نیە.

(٢) تيارات الفكر الإسلامي، د. محمد عمارة، ص ٢٦٢-٢٧١.




## بەرنامەی پەروەردەیی سەنووسییەکان

لە ڕووی بەرنامەی پەروەردەییەوە (محمد علي السَّنوسي) کتێبێکی نووسیوە بەناوی {السلسبيل المعين في الطرائق الأربعين} لەو کتێبەدا دەربارەی بەرنامەی پەروەردەیی خۆی قسە دەکات.

سەنووسی پێی وا بووە کە مسوڵمانان دەبێ بە چوار قۆناغ، پەروەردە ببن، کە لەو کتێبەیدا ئاماژەمان پێ کرد، هێناویەتی:

**هەنگاوی یەکەم:**

ئەوەیە کە بابای مورید (قوتابی، شاگرد) بەر لە هەموو شتێك، دەبێ ئیمان و عەقیدەی خۆی ڕاست بکات، بەپێی تەرازووی ئەهلی سوننەت و جەماعەت[١].

مەبەستیشی ئەوە بووە:

أ- خوا بەیەکگرتن لە پەروەردگارێتییدا.

-----

(١) السلسبيل المعين ..، ص٨.

ب- خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتییدا.

ج- خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتەکاندا.

**هەنگاوی دووەم:**

ئەوەیە کە بابای مورید هیچ هەنگاوێك نەنێ، تاکو زانیاریی نەبێ بە حوکمی شەرعیی لەو بارەوە، بۆیە زۆر کاریان کردوە لەوەدا کە شوێنکەوتووەکانیان شارەزای فیقه بن و، چاوکراوە بن، شارەزای شەریعەت بن، لەسەر یەکێك لە چوار مەزهەبەکان[١].

زۆریش گرنگییان داوە بەم سێ کتێبە:

أ- صحيح البخاري.

ب- موطأ الإمام مالك.

ج- بلوغ المرام لابن حجر العسقلاني.

**هەنگاوی سێیەم:**

گوتوویانە: مورید دەبێ گرنگیی بدات بە تەزکیەی نەفس و، جوانکردنی ئەخلاق و ڕەوشت و، صاف کردنی دڵ و دەروون و، خاوێن کردنی دیوی پەنهانی خۆی، لە شیرك و بیدعەت و، پەیوەست بوون بە غەیری خواوە[٢].

لەوبارەوەش گوتوویانە: نەفس دەبێتە سێ جۆر:

أ- النفس الأمارة {نەفسی زۆر فەرمانکار بە خراپە}.

ب- النفس اللوّامة {نەفسی زۆر سەرکۆنەکاری خاوەنەکەی}.

ج- النفس المطمئنة {نەفسی سەقامگیرو داسەکناو}.

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.

(٢) د. محمد علي الصلابي، تأريخ الحركة السنوسية في أفريقيا ص٩.

**هەنگاوی چوارەم:**

بابای مورید دەبێ هەوڵ بدات، خواردن و خواردنەوەکەی و، خەرجیی و مەسرەفەکەی، حەڵاڵ بن، چونکە شتی حەڕام کاری خراپ دەکاتە سەر دڵ و دەروون[١].

سەنووسیی گوتوویەتی: پێویستە بابای مورید زۆر بەجیددیی ئەم سێ بنەمایە ڕەچاو بکات:

أ- خواردنی حەڵاڵ و خۆ دوور گرتن لە حەڕام.

ب- گوێگرتن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە هانی خەڵك دەدەن، بۆ چاکەو دەیترسێنن لە خراپە.

ج- دەستپێشخەریی کردن لە چاکەدا.

(إبن السنوسي) ئەو ڕێبازەی خۆی فێری موریدەکانی خۆی دەکردو، مەبەستی ئەوەبوو کە لە شەریعەت شارەزایان بکات، زۆریش داکۆکیی لەسەر دەکرد کە: دەستگرتوو بن بە یاسایەکانی شەریعەتەوەو پەیمانیشی لێ وەردەگرتن کە لە هەڵس و کەوتیاندا، پێچەوانەی شەرع نەجووڵێنەوە[٢].

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.

(٢) هەمان سەرچاوە ص ٩٦-١٠٩.




# جووڵانەوەی مەهدییایەتیی لە سوودان

١- پێناسە.

٢- سەرەنجام و پووکانەوەی جوڵانەوەی مەهدییایەتیی لە سوودان.




## پێناسە

دامەزرێنەری جووڵانەوەی مەهدیی: (محمد بن أحمد)ە، لە دوورگەی (لبب) لە نێوان ساڵانی: (١٢٦٠-١٣٠٢ك/١٨٤٤-١٨٨٥ز)دا ژیاوە، دوایی بانگەشەی ئەوەی کردوە کە مەهدییە، پاشان شۆڕشێکی بەرپا کردوە بەناوی خۆیەوە: (الثورة المهدية)، بۆیەکەم جار توانیویەتی گەلی سوودان هەمووی بەیەکەوە کۆ بکاتەوە، ئەو پیاوە لە ساڵی: (١٢٩٨ك/ ٢٩ یونیو ١٨٨١ز) دا، بانگەشەی مەهدیی بوونی کردوەو لە (٢٦ینایر ١٨٨٥ز)دا سەرکردەی سەربازیی ئەورووپای کوشتوە کە ناوی (گوردون) بووەو، چۆتە نێو پایتەختی سوودان (الخرطوم) و، سوودانی هەموو خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

بەڵام ئەو مەهدییە زۆر دژی تورکەکان بووەو لە کتێبەکانیدا بەکافری داناون و، زۆر توند بووە لەسەریان، لەوانەشە توندییەکەی شتێکی سیاسیی بووبێ، بۆ ئەوەی خەڵکەکە لێی کۆ ببێتەوە، چونکە ئەو خەڵکە کەم و زۆر لەژێر هەیمەنەی دەوڵەتی عوسمانییدا بوون.




# سەرەنجام و ڕووکانەوەی جوڵانەوەی مەهدییایەتیی لەسوودان

پازدە (١٥) ساڵ دوای مردنی مەهدیی، سوپای جێنشینەکەی لە بەرامبەر سوپای ئینگلیزەکاندا لە شوێنێك بەناوی: (كَرَري) لە (٢ دیسمبر: ١٨٩٨م)دا دەشكێ و (أم درمان) كە پایتەختی دەوڵەتەكەی مەهدیی بووە، دەگیرێ و، دوایی خەلیفەكەشی لە شوێنێك بەناوی (أم دبیركات) لەساڵی (١٨٩٩ز)دا دەكوژرێ، بەڵام جووڵانەوەكەی مەهدیی، وەك گرووپێكی سیاسیی و صۆفیی، هەر دەمێنێ[١].

ئنجا بۆ زانیارییتان! ئەو موحەممەدی مەهدیی سوودانە، لە ساڵی: (١٣٠٠ك)دا، نامەیەك بۆ (محمد علي السنوسي) دەنووسێ، دەڵێ: بەیعەتم پێ بدەو وەرە ژێر ڕكێفی منەوە، بەڵام سەنووسیی كە پیاوێكی شارەزاو پابەند بووە بە شەریعەتەوە پێی دەڵێ: {لا جواب عندي على هذا الكتاب} واتە: وەڵامم نیە بۆ ئەم نامەیە، ئەمەش زۆر شت دەگەیەنێ و[٢]، یەكیان ئەوەیە كە خۆت و نامەكەت شایستەی وەڵام نین!

---

(١) د. محمد عمارة، تيارات الفكر الإسلامي، ص ٢٧٣-٢٨٥.

(٢) د. محمد علي الصلابي، تأريخ الحركة السنوسية في أفريقيا ص ١٨٥-١٨٧.




# کۆکەرەوەی ئیسلامیی

# ( الجامعة الإسلامیة )[1]

١- پێناسە.

٢- بنەما فیکرییەکانی ئەم تەوژمە.

٣- چەند قسەیەکی سەرقافڵەکانی ئەم تەوژمە.

٤- ناودارترین کەسایەتییەکانی ئەم تەوژمە.

---

(١) پێویستە بزانرێ کە لێرەدا وشەی: (جامعة) بەمانای (زانکۆ) نیە، بەڵکو (الجامعة الإسلامیة) واتە: {کۆ کەرەوەی ئیسلامیی}.

بەڕێـــزان!

ئەم ڕەوت و تەوژمە ئیسلامییە هاوچەرخە - بەو چەمکەی پێشتر خستمانە ڕوو- کۆتا تەوژم و ڕەوتە لە بارەیەوە بدوێین و، پێم وایە کاریگەرترینیان و پڕ بەرهەمترینیشیانە، لەنێو چوار تەوژمە هاوچەرخەکانداو، هەوڵ دەدەین لەو چوار (باس)ەدا بیتوێژینەوە، کە ناوونیشانەکانیانمان خستنەڕوو.




## پێناسە

ئەم ڕەوت و تەوژمە (جمال الدين الأفغاني) دامەزرێنەری بووە، کە زانایەکی پایە بەرز بووەو پیاوێکی بلیمەت بووە، لە نێوان ساڵانی: (١٨٣٨-١٨٩٨ز) ژیاوە.

(د. محمد عمارة) کە سەرجەم بەرهەمەکانی (جمال الدين الأفغاني) لە ژێر ناوو نیشانی: (الأعمال الكاملة لجمال الدين الأفغاني)دا کۆ کردۆتەوە - هەروەها سەرجەم بەرهەمەکانی: شێخ (محمد عبده) و (عبدالرحمن الكواكبي)یش-، هەرچەندە من جار جار ڕەخنەو سەرنجم لەسەر هەندێك لە قسەو بۆچوونەکانی هەیە، بەڵام پێم وایە زۆرباش پێکاویەتی کە بەمجۆرە پێناسەی تەوژمی کۆکەرەوەی ئیسلامیی {الجامعة الإسلامية} دەکات:

{التيار السلفي العقلاني المستنير}[1]، واتە: تەوژمی سەلەفیی عەقڵانیی ڕۆشنبیر.

---

(١) تيارات الفكر الإسلامي ص٣٤٥.




## بنەما فیکرییەکانی ئەم تەوژمە[1]

١- ئیمان و عەقیدە لە سەرچاوەی ڕوون و پاکەوە وەردەگیرێ، [کە قورئان و سوننەتە] دوور لە ئەفسانەو شتی زیاد کراو.

٢- ئیکتیفا ناکرێ بە تێگەیشتنی پێشینی چاك بۆ ئیسلام، لە ڕووە دنیاییەکەی و لەڕووە کلتوورییی و شارستانییەکەیەوە، بەڵکو دەبێ عەقڵی خۆشمان بەکار بێنین.

٣- بیدعەت لە بازنەی بنچینەکانی دین و بنەما جەوهەرییەکانیدا، کورت هەڵدێ، بەڵام شارستانیەتیی و زانست و هونەر، ئەصڵ تێیدا داهێنانە، دەبێ شتی تازە دابهێنرێ و زیاد بکرێ، بەپێی پێداویستیی ڕۆژگارو کۆمەڵگا.

٤- لاسایی کردنەوەیەك کە سەردەکێشێ بۆ دۆگمایی و قاڵب بەستووریی، ڕەتکراوەیەو، کۆشش کردن و بیر کردنەوەو داهێنان و نوێکردنەوە، پێویستە.

---

(١) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.

٥- بانگ نەکردنی مسوڵمانان بۆ گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەم، کۆمەڵگای ئیسلامیی پێشین، چونکە ئەوە مەحاڵە کە مسوڵمانان چواردە سەدە بگەڕێنەوە بۆ دوایەو، سەربارەش ئەمە هەم مەترسیی هەیەو، هەم زیانیشی هەیە.




## چەند قسەیەکی سەرقافڵەکانی ئەم تەوژمە

ئێستاش چەند وتەیەکی زانایانی سەرقافڵەی ئەم تەوژمەتان بۆ باس دەکەم، چونکە کتێبم بینیوە دەڵێ: (جمال الدین)ی ئەفغانیی سەر بە ماسۆنییەت بووەو کابرایەکی فێڵباز بووە، یان باسی (شیخ محمد عبده) دەکات، بەشێوەیەکی خراپ! کە من بۆخۆم تێبینییم هەیە لەسەر هەندێ قسەو بۆچوونیان و، لە تەفسیرە کوردییەکەی خۆشمدا باسم کردوە، کە بۆچوونی ڕیزپەڕو نەگونجاویان هەبوون، بەڵام ئەوە بەجێی خۆی و، ئەو خزمەتەی کردووشیانە، بەجێی خۆی، سبحان الله هەندێك لە ئێمەی مسوڵمان واین، خراپەیەك لە یەکێك ببینین، هەموو شتەکانی سفر دەکەین، چاکەیەکیش لە کەسێکی خراپ ببینین، هەموو خراپەکانی سفر دەکەین، کە هیچ کامیان ڕاست نین!

**یــەك:** شێخ موحەممەد عەبدە ناوی: {تەوژمی وەهابیی} ناهێنێ، بەڵام باسی ئەوان دەکات و دەڵێ:

{الفئة التي زَعَمَت أنَّها نَفَضَتْ غُبار التقليد وأزالت الحُجُبَ التي كانت تَحُولُ بينها وبين النظر في آيات القرآن ومُتُون الأحاديث لتفهم أحكام الله منها... ولكن هذه الفئة أضيقُ عَطنًا وأحرج صَدرًا من المقلِّدين، وهي وإنْ أَنكرت كثيرًا من البِدَعِ ونَحّتْ عن

الدين كثيراً مما أُضيف إليه وليس منه، فإنّها ترى وُجوبَ الأَخْذِ بما يُفْهَمُ من لفظ الوارد، والتقيُّد به، بدون التفات إلى ما تَقْتضيه الأصول التي قام عليها الدين، وإليها كانت الدعوة، ولأجلها مُنِحَتِ النبوّةُ، فلم يكونوا للعلم أولياء، ولا للمدينة السليمة أحبّاء}[١].

واتە: {ئەو کۆمەڵەی کە پێیان وایە تۆزو خۆڵی لاساییکردنەوەیان لەدین تەکاندوەو، زۆر تەم و مژیان لێ لابردوە، کە ڕێگای دەگرت لەوەی کە خەڵك خۆی لە ئایەتەکان و فەرمایشتەکان تێ بگات، بۆ ئەوەی کە یاساکانی خوا لە قورئان و سوننەت هەڵبهێنجێ، ئەوانە پێیان وابوو، وان، بەڵام ئەم کۆمەڵە عەقڵیان لە هی لاساییکەرەوەکان بچووکترو، دڵیان لەهی ئەوان تەسکترە، چونکە هەرچەندە نکوولّیی دەکەن لەزۆر لە داهێنراوە دینییەکان و، زۆر شت کە پاڵ دراوەتە لای دین، دووریان خستۆتەوە، بەڵام خاڵی بێ هێزیان ئەوەیە کە: پێیان وایە دەبێ چی ڕواڵەتی دەقەکان دەیگەیەنێ، هەر ئەوە وەربگیرێ، بەبێ لێ ورد بوونەوەو سەرنج دانی نێوەڕۆکیان و، ئەو ئامانجانەی کە بنچینەکانی دین دەیانخوازن، کە بانگەوازی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەر بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە شەرعیيانە هاتوەو، هەر بۆیەش پێغەمبەرایەتیی دانراوە، بۆیە ئەوانە دۆستی زانیاریی نەبوون و، لەگەڵ شارستانییەتیشدا ئاشنا نەبوون}[٢].

ئێستاش لەگەڵ دابێ لەڕووی دنیادارییەوە ئەو تەوژمە، ئەوەی کە لە ژێر کاریگەریی جووڵانەوەی (وهابیە)دایە، لە ڕووی تێگەیشتن و دنیادارییەوە، زۆر دواکەوتوون، بۆ نموونە: ئەمساڵ (٢٠١٧ز) ڕێگایان دا ئافرەت سەیارە لێ بخورێ، لە حاڵێکدا کە پێش هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵ، ئافرەت حوشتری لێخوڕیوە، لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)!!

**دوو:** هەروەها (شيخ محمد عبده) گوتوویەتی: {ولو رزق الله المسلمين حاكمًا يعرفُ دينَهُ ويأخذهم بأحكامه، لرأيتهم قد نهضوا والقرآن الكريم في إحدى اليدين، وما

---

(١) الأعمال الكاملة للشيخ محمد عبده، ج٣ ص ٣١٤.

(٢) الأعمال الكاملة للشيخ محمد عبده ج٣ ص ٣١٤.

قرَّرَ الأولون وما اكتشف الآخرون في اليد الأخرى، ذاك لآخرتهم وهذا لدنياهم، ولساروا يُزاحمون الأوربيين فَيَزحَمُونهم}[١].

واتە: ئەگەر خوا حوکمڕانێك بە مسوڵمانان ببەخشێ، کە لە دینەکەیدا شارەزا بێ و، پابەندیان بکات بە یاساکانی شەریعەتەوە، دەتبینین مسوڵمانان هەڵساونەوە: قورئان بەدەستێکیانەوە، ئەوەی کە زانایانی پێشێ گوتوویانەو ئەوەشی کە زانایانی دوایی دۆزیویەتیانەوە، بەدەستێکی دیکەیانەوە، قورئانەکە (ئەوەی کە پێیان دەڵێ) بۆ دوارۆژیانەو، زانست و مەعریفەتەکەش بۆ کاروباری دنیایان و، دەتبینین کە پێشبڕکێیان دەکرد لەگەڵ ئەورووپاییەکاندا و پێشیشیان دەکەوتنەوە.

**سێ:** (جمال الدين الأفغاني)یش گوتوویەتی: {الإعجاب بالغرب، وفَقْد الثقة بالنفس، يفتَح الباب لأُولي المطامع من الغربيِّين}[٢].

واتە: سەرسام بوون بە ڕۆژئاواو، لەدەستدانی متمانە بەخۆ کردن، دەرگا دەکاتەوە بۆ خاوەن تەماحەکان لە ڕۆژئاواییەکان.

**چوار:** هەروەها (جمال الدين) گوتوویەتی: {فإِنَّ الإنسانَ الحُرَّ: مالكٌ لِنَفسه تماماً ومملوكٌ لقومه تماماً}[٣].

واتە: ئینسانی ئازاد زۆر خاوەنی خۆیەتی و، زۆریش خۆی بە خزمەتکاری خەڵك و قەومی خۆی دەزانێ.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ج٣ ص ٢٥١-٢٥٢.

(٢) الأعمال الكاملة لجمال الدين الأفغاني، ص ٢١٥.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٢١٥.




# ناودارترین
# کەسایەتییەکانی ئەم تەوژمە

هەڵبەتە ئەم تەوژمە کەسایەتیی ناوداریی زۆر تێدابوون بەڵام ڕەنگە ئەم شەش کەسە لە هەموویان دیارتر و کاریگەرتر بووبن:

١- (جمال الدين الأفغاني) لە نێوان ساڵانی: (١٨٣٨-١٨٩٧)زدا ژیاوە، خەڵکی ئەفغانستان بووە، سوننییەو، لەڕووی نەسەبەوە دەچێتەوە سەر حوسەین خوا لێی ڕازی بێ.

٢- (محمد عبده)، لە نێوان ساڵانی: (١٨٤٩-١٩٠٥ز)دا ژیاوە، کوڕی جوتیارێکی مصرِیی بووە، هەموو جارێ (جمال الدين) سوعبەتی لەگەڵ کردوەو گوتوویەتی: موحەممەد پێم بڵێ: کوڕی چ پادشایەکی ئەوەندە بە هەیبەت و بە ویقاری؟.

٣- (عبدالرحمن الكواكبي)، لەنێوان ساڵانی: (١٨٥٤-١٩٠٢ز)دا ژیاوەو لە حەڵەب لەدایك بووە.

٤- (عبدالحميد بن باديس)، لەنێوان ساڵانی: (١٨٨٩-١٩٤٠ز)دا ژیاوە.

٥- جمال الدين القاسمي، لە نێوان ساڵانی: (١٨٨٦-١٩١٤)زدا ژیاوە.

٦- الشيخ رشيد رضا، لە نێوان ساڵانی: (١٨٥٦-١٩٣٥)زدا ژیاوە.

## بەرهەمەکانی دانەر

### أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٤ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی | | |
| ١٥ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٦ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٧ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٨ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ١٩ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢٠ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢١ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٣ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٤ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٥ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٦ | ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| ٢٧ | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٢٨ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی) و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٢٩ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٠ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣١ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٢ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | | |
| ٣٣ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی چەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| | فیقهی ئیسلامیی | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣٥ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاك؛ خاوێنیی | | |
| ٣٦ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٣٧ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٣٨ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٣٩ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٤٠ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤١ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| ٤٢ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار | | |
| ٤٣ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٤ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٥ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٦ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٧ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٨ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٩ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٠ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| ٥١ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٢ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٣ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٤ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥٥ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٦ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٧ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٥٨ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٩ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦٠ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦١ | چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا بكەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٢ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٣ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٤ | بۆئەوەی لەسەر جیهادكردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٥ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٦ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٧ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٦٨ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٦٩ | بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەكەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز كراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەكەم: بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەكانی ڕەوایی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٧٠ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەكانی ڕێكخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧١ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٢ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | | | |
| ٧٣ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٤ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٥ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | | |
| ٧٦ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٧٧ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٨ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | | |
| ٧٩ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٨٠ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨١ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٢ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سیاسەت و حوکمڕانیی** | | |
| ٨٣ | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٤ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨٥ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٦ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| ٨٧ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٨ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٨٩ | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٠ | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | مێژوو | | |
| ٩١ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٩٢ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٣ | بەرکولێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | دیدارو گفتوگۆ | | |
| ٩٤ | سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩٥ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ٩٦ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |
| | زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | | |
| ٩٧ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ٩٨ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٩ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٠ | چۆنیەتی بوونە پێشـەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠١ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٢ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٣ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سـەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٤ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسـند سـەنگی مەحەكی مسـوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٥ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٦ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویســـتە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٧ | واقیعی هەرێمی كوردسـتان، دیدێكی ئیســـلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٨ | ســـروشـت و پایەكانی خێزان و مەسـەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عـەقڵدا (١٢) | چـاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكـەیە بە(١٤) ئاڵقـە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ١٠٩ | كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٠ | حوكمی لە ئیســـلام هەڵگەڕانەوەو هەڵســـەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١١١ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسـیرەكەی و چەند سـەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٢ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسـخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٣ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١٤ | ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٥ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٦ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٧ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| ١١٨ | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١١٩ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٠ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢١ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٢ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٣ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٤ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٥ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٢٦ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٢٧ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |
| ١٢٨ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | | |
| ١٢٩ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٣٠ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣١ | نقض فكرة التطرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٢ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٣ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٤ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٣٥ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٣٦ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٧ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٣٨ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٣٩ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٠ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤١ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٢ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٣ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٤ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٤٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | | |
| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | |
| ١٤٦ | کتێبی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٤٧ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | | |
| ١٤٨ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | | |
| ١٤٩ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | | |

# نێوەڕۆك

تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان................................. ٣
پێشکەش بێ.......................................................................... ٥
پێشەکیی............................................................................. ٩
ڕێخۆشکردن و نەخشەی گشتیی .................................................. ١٢

**تەوەری سێیەم** .................................................................. ١٧

تەوژمە فیکرییە ســـەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان ............................. ١٧
پێشەکی ئەم تەوەرە ............................................................... ١٩
ڕێخۆشکردنێکی کورت .............................................................. ٢٢
بـەرایی سـێ ئـاگاداری گـرنگ..................................................... ٢٣

**بەشی یەکەم**..................................................................... ٢٧

خـــەواریج ( الخـــوارج )........................................................ ٢٧

باسی یەکەم: پێناسە و سەرهەڵدانی خەواریج....................................... ٢٩
باسی دووەم: ناوەکانی خەواریج .................................................. ٣٤
باسی سێیەم: بنەما فیکرییەکانی خەواریج ........................................ ٣٦
١- لە بواری حوکمڕانییدا:........................................................ ٣٦
٢- لەبواری شۆڕش کردندا: ....................................................... ٣٧
٣- لە ڕووی سەرنجدانیانەوە بۆ مێژوو:........................................... ٣٧
٤- ڕێبازی دانانی حوکمڕان:...................................................... ٣٨
٥- خاوەن گوناهە گەورەکان:...................................................... ٣٨

٦- له ڕووی دادگەریی خوا (عدل الله)وه: ........................................ ٣٩
٧- لەبواری خوا بەیەكگرتن (توحید)دا:........................................ ٣٩
٨- لەبواری بەڵێن دان و هەڕەشه كردن (وعدو وعید)دا:........................ ٤٠
٩- لەبواری فەرمان كردن به چاكەو ڕێگریی له خراپەدا:......................... ٤٠
١٠- لەبواری جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەو سەروەت و سامان و عیبادەتدا: ... ٤٠

**بەشی دووەم** ........................................ ٤٣
مورجیئه ( المرجـئـة ) ........................................ ٤٣

باسی یەكەم: چەمك و واتای وشەی (**مُرجئة**)........................................ ٤٥
باسی دووەم: پێناسەی مورجیئه، وەك تەوژمێكی فیكریی ........................ ٤٦
باسی سێیەم: جۆرەكانی مورجیئه........................................ ٤٧
باسی چوارەم: زیان و مەترسیی بیرۆكەی مورجیئه........................................ ٤٩

**بەشی سێیەم** ........................................ ٥١
جەبرییه (الجبرية) ........................................ ٥١
باسی یەكەم: پێنـاسـه........................................ ٥٣
باسی دووەم: پووچەڵكردنەوەی بیرۆكەی جەبرییەكان ........................ ٥٥
باسی سێیەم: زیانی گەورەی بیرۆكەی جەبر، له ژیانی مسوڵماناندا.............. ٥٧

**بەشی چوارەم**........................................ ٥٩
قەدەرییه (القدرية)........................................ ٥٩
باسی یەكەم: پێنـاسـه........................................ ٦١
باسی دووەم: جۆرەكانی قەدەرییه........................................ ٦٢
باسی سێیەم: سێ جۆره هەڵوێست له بەرانبەر ئیمان بەقەدەردا.............. ٦٣
باسی چوارەم: بۆچوونی بەنده لەو بارەوه ........................................ ٦٥

**بەشی پێنجەم** ........................................ ٦٧
جەهمییه ( الجهمية )........................................ ٦٧

باسی یەکەم: پێنـاســە ............................................................. ٦٩
باسی دووەم: کارتێکراویی ئەشعەرییەکان بە بیرۆکەی جەهمییەکان ............ ٧٢
باسی سێیەم: پاساوو بیانووی سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکەیە، لەلای هەڵگرانی ... ٧٤

**بەشی شەشەم** ............................................ ٧٥
موعتەزیلە ( المعتزلة )........................................ ٧٥
باسی یەکەم: پێناســە ............................................................. ٧٧
باسی دووەم: سەرگوزەشتەی موعتەزیلەبۆچی موعتەزیلە ئەو پێنج بنەمایەیان داناون؟!......................................................................... ٨٤
باسی سێیەم: پوختەی هەڵسەنگاندنی موعتەزیلە.......................... ٩٠

**بەشی حەوتەم** ............................................ ٩١
شـیعــە ............................................ ٩١
باسی یەکەم: پێنـاســە............................................................ ٩٣
باسی دووەم: جۆرەکانی شیعە........................................... ٩٩
چوار جۆرە سەرەکییەکانی شیعە: ......................................... ٩٩
باسی سێیەم: وردە گرووپەکانی شیعە........................................ ١٠٤

**بەشی هەشتەم**............................................ ١٠٧
ڕافـیزە ( الرافضـة ) ........................................ ١٠٧
باسی یەکەم: پێنـاســە............................................................ ١٠٩
باسی دووەم: هەڵوێستی مسوڵمانانەو جوامێرانەی زەید لە بەرانبەر شیعەی (رافضة)دا........................................................................... ١١٢

**بەشی نۆیەم** ............................................ ١١٥
ناصیبە ( الناصبة )........................................ ١١٥
باسی یەکەم: پێناسە............................................................ ١١٧
باسی دووەم: هەڵوێستی هاوسەنگی زانایان و خۆشویستنی هاوەڵان و خزمان پێکەوە.... ١٢٠

باسی سێیەم: هەڵوێستی بوێرانەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە لەو بارەوە، لەبەرانبەر نادر شادا.......................................................... ١٢٢
باسی چوارەم: هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانی گرووپ و تاقمە لادەرەکان: لادان بووە لە خەتی ڕاست و هاوسەنگ.......................................................... ١٢٤

**بەشی دەیەم**.......................................................... ١٢٧
ئەهلی حەدیس ( أهل الحديث ).......................................................... ١٢٧
باسی یەکەم: پێنـاسـە.......................................................... ١٣٠
باسی دووەم: سەردەم و هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو ڕەوتە.......................................................... ١٣١
باسی سێیەم: پێشەوای ئەو ڕەوتە.......................................................... ١٣٢
باسی چوارەم: بنەما فیکرییەکانی ڕەوتی ئەهلی حەدیس، بەتایبەت (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل).......................................................... ١٣٣
باسی پێنجەم: ڕەخنە گرتنی دووان لە شەرعزانانی حەنبەلیی مەشرەب، لە حەنبەلییەکان.......................................................... ١٣٦

**بەشی یازدەیەم**.......................................................... ١٤١
ئەشعەرییەکان ( الأشاعرة ).......................................................... ١٤١
باسی یەکەم: پێناسە.......................................................... ١٤٣
باسی دووەم: کەش و هەوای تێدا سەرهەڵدانی ڕەوتی ئەشعەریی.......................................................... ١٤٥
باسی سێیەم: ڕەوتی ئەشعەریی و خستنە ڕووی وێنەیەکی تازەی هاوسەنگی ئیسلام.......................................................... ١٤٧
سیماو نیشانە بنەڕەتییەکانی ڕەوتی ئەشعەریی:.......................................................... ١٤٧
باسی چوارەم: (أبو الحسن الأشعري) چۆن توانی ببێتە پارێزەر (محامی) عەقیدەو فیکری جەماوەری مسوڵمانان؟.......................................................... ١٥٠
کاتی ڕاگەیاندنی وەرچەرخانەکەی:.......................................................... ١٥٢
باسی پێنجەم: وتووێژە ناودارەکەی نێوان (أبو الحسن الأشعري) و (أبو علي الجبائي).......................................................... ١٥٤

باسی شەشەم: کەسایەتییە دیارەکانی ڕەوتی ئەشعەریی ........................ ١٥٦

**بەشی دوازدەیەم** ........................................................ ١٥٧
ماتوریدییەکان ( الماتريدية ) ................................................ ١٥٧

باسی یەکەم: پێناسە........................................................... ١٦٠
باسی دووەم: جیاوازییەکانی نێوان: قوتابخانەی ئەشعەریی و قوتابخانەی ماتوریدیی........................................................................ ١٦١
پێنج جیاوازیی سەرەکیی: .................................................... ١٦١

**بەشی سێزدەیەم**........................................................... ١٦٧
باطینییەکان ( الباطـنية )....................................................... ١٦٧

باسی یەکەم: پێناسـە ......................................................... ١٦٩
باسی دووەم: دامەزرێنەری جووڵانەوەی (باطنية) کێ بووە؟!................ ١٧٥
باسی سێیەم: پێڕ و تاقمە (باطنية) سەرەکییەکان ............................ ١٧٧
١- الإسماعيلية:................................................................ ١٧٧
٢- القرامطة: ................................................................... ١٨٠
٣- شۆڕشی زەنجییەکان (ثورة الزنج): ........................................ ١٨٢
٤- نوصەیرییەکان (النُّصيرية): ................................................ ١٨٣
٥- (الدروز- الدرزية) (الموحِّدون):............................................ ١٨٥
٦- إخوان الصفاء وخلان الوفاء:................................................ ١٨٦
٧- یەزیدییەکان (اليزيدية):..................................................... ١٨٨
٨)- الحشاشون (الصباحية):...................................................... ١٩٢
٩)- فاتیمییەکان (الفاطميون):................................................... ١٩٤
١٠- الشيخية:................................................................... ١٩٦
١١- الحركة الكشفية:.......................................................... ١٩٧
١٢- البابية:...................................................................... ١٩٨

١٣- البهـائيـة: ............................................................. ٢٠١
١٤- القـاديانية (الأحمدية): ............................................... ٢٠٤
باسی چوارەم: کورتە هەڵسەنگاندنێکی گرووپە باطینییەکان ........... ٢٠٧

**بەشی چواردەیەم** ..................................................... ٢٠٩
فەلسەفە و فەیلەسووفەکان ( الفلسفة والفلاسفة ) .................. ٢٠٩

باسی یەکەم: پێنـاسـە ................................................ ٢١١
باسی دووەم: کێ یەکەمجار وشەی فەلسەفەی بەکارهێنا؟! ............ ٢١٤
باسی سێیەم: بۆچی زانایانی ئیسلام ڕوویان نەکردۆتە فەلسەفە؟ ....... ٢١٥
باسی چوارەم: مێژووی فەلسەفە ......................................... ٢١٩
باسی پێنجەم: گرنگیی و پێویستیی فەلسەفە ............................. ٢٢١
باسی شەشەم: ڕێبازی فەلسەفە ........................................... ٢٢٥
باسی حەوتەم: چەند فەیلەسووفێکی مسوڵمان ............................. ٢٢٦
باسی هەشتەم: هەڵوێستمان لەبەرامبەر فەلسەفەدا ........................ ٢٣٢

**بەشی پازدەیەم** ...................................................... ٢٣٥
تەصەووف صۆفییەکان ( التصوُّف الصوفية ) ............................. ٢٣٥

باسی یەکەم: وشەی تەصەووف لە چییەوە هاتوەو کەی پەیدا بووە؟ ........ ٢٣٨
یەکەم: وشەی (تصوف) لە چییەوە هاتوە؟ .................................. ٢٣٨
دووەم: وشەی (صوفي) و (صوفية) کەی سەری هەڵداوە؟ ..................... ٢٣٩
باسی دووەم: سەرەتای سەرهەڵدانی تەصەووف .............................. ٢٤١
باسی سێیەم: ناوەکانی تەصەووف ........................................... ٢٤٣
باسی چوارەم: پێناسەی تەصەووف و نێوەڕۆکەکەی ........................... ٢٤٤
باسی پێنجەم: گەشە کردنی تەصەووف ...................................... ٢٤٨
باسی شەشەم: سەرهەڵدانی ڕێبازەکانی تەصەووف و گرنگترین ڕێبازەکانی ..... ٢٥٣
ناودارترین ڕێبازەکانی تەصەووف: ........................................ ٢٥٥

ڕێبازەکانی تەصەووف:........................................................ ٢٥٦
باسی حەوتەم: هەڵسەنگاندنێکی کورت بۆ تەصەووف و تەزکیەی نەفس... ٢٦٠

**بەشی شازدەیەم**................................................ ٢٧٥
مەزهەبە فیقهییەکان.................................................. ٢٧٥

باسی یەکەم: ســەرژمێرێکی مەزهەبە فیقهییەکان و دامەزرێنەرەکانیان..... ٢٧٧
باسی دووەم: پێنج کورتە سەرنج دەربارەی مەزهەبە فیقهییەکان............. ٢٧٩

**بەشی حەڤدەیەم** ................................................. ٢٨٧
بزووتنەوەی وەهابیی ( الحركة الوهابية )........................ ٢٨٧

باسی یەکەم: پێناسە........................................................ ٢٨٩
باسی دووەم: بەرنــامە و سەرهەڵدان.......................................... ٢٩٠
باسی سێیەم: حەوت ڕەخنە و سەرنج لەسەر جووڵانەوەی (وهابية) .......... ٢٩٢

**بەشی هەژدەیەم** ................................................. ٢٩٧
سەنووسییەکان (السنوسية)........................................ ٢٩٧
باسی یەکەم: پێنـاســە ...................................................... ٢٩٩
باسی دووەم: تایبەتمەندییەکانی جولانەوەی سەنووسییەکان...................... ٣٠٠
باسی سێیەم: بەرنامەی پەروەردەیی سنووسییەکان ................................ ٣٠١

**بەشی نۆزدەیەم**................................................ ٣٠٥
جووڵانەوەی مەهدییایەتیی لە سوودان ...................... ٣٠٥

باسی یەکەم: پێنـاســە ...................................................... ٣٠٧
باسی دووەم: سەرەنجام و پووکانەوەی جووڵانەوەی مەهدییایەتیی لە سوودان .... ٣٠٨

**بەشی بیستەم**................................................ ٣٠٩
کۆکەرەوەی ئیسلامیی ( الجامعة الإسلامية )..................... ٣٠٩

باسی یەکەم: پێناسە........................................................ ٣١٢

باسی دووەم: بنەما فیکرییەکانی ئەم تەوژمە.......................................... ٣١٣
باسی سێیەم: چەند قسەیەکی سەرقافڵەکانی ئەم تەوژمە .......................... ٣١٥
باسی چوارەم: ناودارترین کەسایەتییەکانی ئەم تەوژمە ............................ ٣١٨
بەرهەمەکانی دانەر ................................................................................ ٣٢٠
نێوەڕۆك.................................................................................................. ٣٣٣

## کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
## مامۆستا عەلی باپیر



• ناو: عەلی باپیر وەتمان، لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١) لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیە و سلێمانیی) و لای زانایانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران بەدەستهێناوە.

• لەساڵی (١٩٨١) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە.

• لەساڵی (١٩٨٣) گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و بەردەوام بووە لە مەلایەتیی و دەرس وتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...

• لەساڵی (١٩٨٧) خۆی و پۆلێك گەنجی ئیسلامیی پەیوەندییان بەبزووتنەوەی ئیسلامیی چەکدارەوە کردووە، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستان بنکەو بارەگای سەربازییان هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و بوو بە بەرپرسی هێز.

• لە ساڵی (١٩٨٨) بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• لەساڵی (١٩٩١) ڕۆڵی گەورەی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١و وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان لە مەبەست و ئامانجەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• تا ساڵی (٢٠٠١) لەناو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوە، لەهەمان ساڵدا (٢٠٠١) لە کۆنگرەدا لەگەڵ چەند هێزو مەڵبەندێکی بزووتنەوەی ئیسلامیی

لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا ماوەتەوە، هەر لەزینداندا کتێبی: (الإسلام يتجلى في كتاب الله)ی نوسیوەو، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨)دا لەزیندان ڕزگاری بووە.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) کتێب و نامیلکەی نووسیوە لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس...).

• ئێستا پرۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو نیوەی زیاتری تەواوکردوە.

• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥) داو، لەهەموویاندا، ناوبراو بەئەمیری حزب هەڵبژێردراوە.

• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر کە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

**بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:**

 www.alibapir.net

 /alibapir

 /alibapir1

 /MediaAmeerOffice




# تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی

# مێژووی مسوڵمانان

پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگار و، واقیعێکدا کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و، بەزیندوویێتی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: لێك دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لە تێوەڕامانی وەحیی و، چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەیبینین.

بەڵێ ئەم حاڵەتەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، حاڵەتێکە کە مسوڵمانان- بەشێوەیەکی گشتی- باش نەیانتانیوە کە عەقڵ و هۆشی خۆیانی تێدا بخەنەکار بۆ تێوەڕامانی وەحیی و، سەرنجدانی واقیع...

هیواداریشم ئەم مەوسووعەیە بەهەر پێنچ تەوەرەکەیەوە، هەوڵ و هەنگاوێکی کاریگەربێ، بۆ گێڕانەوەی مسوڵمانان بەرەو ئەو حاڵەتە پەسندە سروشتییەی، کە نەقڵ و عەقڵ لێیان دەخوازن، بەڵکو لەدەردی وەستان و بە جێماویی دەربازیان بێ.

**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com